گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٣٣) ئابی ٢٠٢١

بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی


خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
تۆفیق کەریم

٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٢٢٦٣٧٦٦٤
tofeqkarem@yahoo.com





سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠
نرخ: ١٥٠٠ دینار

# ناوەڕۆک



## تەوەری ژمارە:



## بابەتی گشتی:





تەوەری داهاتوو

# جیهان لە سایەی پەرەسەندنی پوچگەراییدا، ئاڵنگاریی و بەرەنگاربوونەوە

گۆڤاری خاڵ بابەتی (جیهان لە سایەی پەرەسەندنی پوچگەراییدا، ئاڵنگاریی و بەرەنگاربوونەوە) دەکاتە ناونیشانی تەوەری ژمارەی داهاتوو، لەو چوارچێوەیەدا دەخوازێت لێکۆڵینەوە لەم بوارانەدا بکرێت:

- ئایا ئەم هەلومەرجە نوێیەی کە جیهان و کوردستان پیایدا تێدەپەڕێت نەبووەتە هۆی بێبەهابوونی خوێندن و بڕوانامە و زانکۆ؟
- ئایا میدیا و سۆشیال میدیا نەبوونەتە هۆی دروستبوونی پاڵەوانی کارتۆنی؟
- لاوازبوونی دەوڵەت و حوکمی کۆمپانیاکان تا چەند بە زیانی هاوڵاتیان شکاوەتەوە؟
- نەبوونی مەرجیعیەت بۆ بڕیاردانی تاک چ زیانێک بە تاک دەگەیەنێت؟
- زیانەکانی هەڵوەشانەوەی خێزان و ڕووکردنە تاکگەرایی چین؟
- داڕووخانی کۆمەڵایەتی و نەمانی بەهای باڵاکان کۆمەڵگە بەرەو کوێ ئاڕاستە دەکەن؟
- سادەکردنەوەی مرۆڤ و قەتیسکردنی ڕۆڵی لە ژیاندا تەنها وەک بەکاربەر و کڕیارێکی کاڵاکان.
- جیهان لە سایەی پەرەسەندنی پوچگەراییدا بەرەو کوێ هەنگاو دەنێت؟.
- چۆن دەکرێت ڕووبەڕووی ئەم شەپۆلی بێبەهاکردنە ببینەوە؟ بەکامە ڕێگا و میکانیزم؟
- داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا ڕێکەوتی (٢٠٢١/١١/١) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.



تەوەری ژمارە

# ڕۆمان و چیرۆکی کوردی

## دوای سەدەیەک ئەزموون، بەرەو کوێ؟

ڕۆمان ئەو ژانرە ئەدەبییە بالایە بوو، کە لەگەڵ کامڵبوونیدا زۆر بیروباوەڕ و ئایدۆلۆجیا قۆستیانەوە و لەو ڕێگایەوە خۆیان بەنەتەوە و گەلان ناساند، نوسەرانیش سەلیقە و بەهرە و ئەزموونی خۆیان ە ر لە ڕۆماندا بۆ جیهان خستەڕوو. بۆیە لەو ڕێگەیەوە جیهان بە کێشەی زۆر لە گەلان و ئایدۆلۆجیای ئاراستەکان و کەسێتی ڕۆماننووسەکان ئاشنابوو.

لەباشووری کوردستاندا وا یەک سەدە بەسەر نووسینی ڕۆماندا تێپەڕدەبێت، لە کوردستانی گەورەشدا کەمێک لەو زەمەنە خوار تر بەسەر بڵاوبوونەوەی یەکەم ڕۆمانی عەرەبی شەمۆ تێپەڕبووە. ئایا لەماوەی ئەم سەدەیەدا ئێمە توانیومانە کێشەی گەلەکەمان لە ڕۆمانێکدا یەکبخەین و خوێنەرانی لە دەور کۆکەینەوە؟ چەندە سەرکەوتووبووین لە گەیاندنی دەنگمان لە ڕێگەی ڕۆمانەوە بە گەلانی دیکە؟

لەگەڵ ئەوەی پانتاییەکی فراوان لە قورئانی پیرۆز گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانە، ئەو نووسەرانەی پابەندی ئاینیشن چەندە توانیویانە تەوزیفی ئەو بەسەرهاتانە بکەن یاخود چاویان لێکەن و لەم بوارەدا داهێنان بکەن؟

ئێمە لە گۆڤاری خاڵ ئەم تەوەرەی ژمارەکەمان تەرخانکرد بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە و زۆر پرسیاری دیکەش، ڕۆماننووس و ڕەخنەگران و نووسەران هەریەکەیان لە گۆشەنیگای خۆیانەوە تیشکیان خستووەتە سەر بابەتەکە.

بەو ئومێدەی بابەتێکی دڵگیری بەسوود بێت بۆ خوێنەران، چونکە لەگەڵ پاشەکشەی زۆری نووسین لە بەرامبەر هێرشی تەکنەلۆجیادا، بەڵام هێشتا بوارەکانی ڕۆمان گرنگی خۆی لەدەستنەداوە و لە پێشکەوتن و پەرەسەندندایە، لە کوردستانیشدا زۆرترین خوێنەری هەیە.



دڵشاد کاوانی
ڕۆماننووس و ڕەخنەگر.

# ڕۆمانی کوردی

## لەنێو ڕەوت و دیدە جیاوازەکانی ئەدەبی جیهانی، لێکەوتە و کاریگەرییەکانی

پێشەکی:

ڕۆمان وەک دیارترین و تازەترین ژانری سەرەکی ئەدەبی، بۆتە بابەت و ڕوانینی جیاجیای ناوەندە زانستی و ئەدەبییەکانی جیهانی و وەک زەروورەتێکی ئەدەبی خۆی خزاندۆتە نێو سەرجەم ئەدەبیاتی نووسراوی جیهان و ئەدەبە جیاوازەکانی گەلان و هەریەکەیان بە زمانێک و کلتوورێکی جیاوازەوە لە ڕێگای ڕۆمانەوە دید و ڕوانین و بچم و دابونەریت و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەکەی خۆیان نیشاند دەدەن.

چیرۆک و ڕۆمان لە شێوەی ژانرەکانی دیکەی ئەدەب بە سادە و ساکاریی لە هەناوی پەخشانەوە لەدایکبوو پاشان خزایە نێو فەرهەنگ و کایەکانی ژیانی مرۆڤ، بەم جۆرە لەڕووی مێژووی ئەدەبییەوە ڕۆمان دەرگای بەسەر خواستی مرۆڤایەتی کردووە و دواتر گەشەی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە. بۆئەوەی بەراوردێکی ئەدەبی زانستییانە بکەین، دەبێت سەرەتا بزانین ژانری ڕۆمان چییە و چۆن و کەی وەک پێوستییەکی نووسین ڕووی کردۆتە نێو ئەدەبیاتی جیهان و مێژوویی ئەدەبی نووسراوی کوردی، ئێمە لە کوێی ئەم هاوکێشە ئەدەبییەدایین، کە ڕۆمان وەک ڕەوتێکی تازە و هەنووکەیی دونیای ئەدەب پێیدا تێدەپەڕێت.

## سەرەتا:

ڕیشەی ڕۆمان بۆ وشەی نۆڤڵ (novel) دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی هەژدە دوابەدوای وشەی نۆڤێلا (novella)، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بۆ چیرۆک بەکاردەهێنرا. وەک ناسنامە پەرەیسەندووە و گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، ئێستا وادادەنرێت کە ڕۆمان چیرۆکێکی پەخشانییە کە زیاتر لە پەنجا هەزار وشە لەخۆبگرێت. ڕۆمان لە چیرۆک زیاتر سەرنج دەخاتە سەر پەرەسەندنی کەسایەتییەکان. ڕۆمان لە هەموو جۆر و ژانرەکانیدا لێکۆڵینەوە لەسەر دەروونی مرۆڤ دەکات.

## مێژووی ڕۆمانی جیهانی:

هەرچەندە ڕۆمان لەچاو ژانرەکانی تری ئەدەب درەنگ وەخت هاتە نێو فەرهەنگی ژیانی مرۆڤ، دەقی ڕۆمان کە بەشێوەی پەخشان نووسرابێت نەوەک شیعر و بە یەکەم ڕۆمان لە مێژووی مرۆڤایەتی دابنرێت و بەتەواوی بەشەکانییەوە مابێتەوە، ڕۆمانی (کەری زێڕین)- لە نووسینی نووسەر و فەیلەسووفی ئەمازیغی لۆکیوس ئەپۆلیوس، لە ساڵی (١٢٥-١٨٠ز) ئەگەرچی ڕۆمانێکی دیکە پێش ئەو هەیە بەناوی (سێریکون) لە نووسینی (گایۆس پێترۆنیس ئەریتەر) کە لە ساڵی (٦٦ز) مردووە و ڕۆمانێکی تەنزئامێزە، بەڵام بەناتەواوی گەیشتووەتە دەستی خوێنەران و هەندێک بەشی لێ فەوتاوە. بۆیە ڕۆمانی (کەری زێڕین) یەکەم ڕۆمانی کۆنە کە دەقەکەی هیچی لێ نەفەوتابێت و وەک خۆی مابێتەوە. ڕۆمانی (کەری زێڕین) بە شێوازێکی نوێی ئەدەبی و بەشێوەی پێکهاتەگەرایی نووسراوەتەوە کە کۆمەڵێک چیرۆک لەخۆدەگرێت، کەسی یەکەمی تاک ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە، ئەو شێوازەی لەم ڕۆمانەدا بەکارهاتووە، لە سەردەمەکانی دواتر لە گەلێک ڕۆماندا بەکارهێنرا و سوودی لێوەرگیرا و تا ئێستاش سوودی لێوەردەگیرێت.

لۆکیوس ئەپۆلیوس، نووسەرێکی لاتینی و گوتاربێژێکی ئەمازیغیی نۆمیدیە و فەیلەسووف و زانای سروشت و ڕۆماننووس و شانۆنووس و داستاننووس و شاعیر بووە، خەڵکی ناوچەی نۆمیدیا بووە، کە دەکەوێتە وڵاتی جەزائیری ئێستا. لە ساڵی ١٢٥ز لە شاری مادور (مداوروشی جەزائیر) لەدایکبووە، لە ساڵی ١٨٠ز کۆچی دوایی کردووە.

## سەرەتای ڕۆمانی ئەورووپی نوێ:

لە دوای ئەوە، توێژەرانی ئەدەبی، باسی ڕۆمانی «دۆن کیشۆت»ی ڕۆماننووسی ئیسپانی میگڵ دی سێرڤانتس (١٥٤٧- ١٦١٦ز) دەکەن، کە بە دوو بەش لە ساڵانی ١٦٠٥ و ١٦١٥ بڵاویکردووەتەوە و بە یەکەم ڕۆمانی ئەورووپیی نوێ، بە یەکەم گەورەترین کاری ئەدەبیی جیهانی دادەنێن و بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراوە.

## ڕۆمان لە جیهانی عەرەبی:.

هونەری ڕۆمان زۆر دواتر دەگاتە جیهانی عەرەبی و ڕۆمانی ئاقیبەت خێر (حسن العواقب)ی زەینەب فەواز کە لە ساڵی ١٨٩٩ دەرچووە، بە یەکەم ڕۆمانی عەرەبی دێتە هەژمار، دوای ئەویش ڕۆمانی دڵی پیاوەکە (قلب الرجل)ی لەبیبە هاشم کە لە ساڵی ١٩٠٤ بڵاویکردووەتەوە، پاشان ڕۆمانی (بدیعة و فؤاد)ی عەفیفە کەرەم دێت، کە ساڵی ١٩٠٦ بڵاوکراوەتەوە. ئەم ڕۆماننووسە ئافرەتانە، پێشەنگی ڕۆمانی زمانی عەرەبین و هەرسێکیان خەڵکی وڵاتی لوبنانن. ئەمە لەکاتێکدا کە تا ماوەیەکی زۆر و بەر لە دۆزینەوەی ئەمانە، لە مێژووی ئەدەبی عەرەبیدا، ڕۆمانی (زەینەب)ی محەمەد حوسێن هەیکەل، کە لە ساڵی ١٩١٤ بڵاوبووەتەوە، بە یەکەم ڕۆمانی عەرەبی دەزانرا(١).

## ڕۆمان لە ئەدەبیاتی کوردیدا:.

کەچی زۆر لەوە بەکاوەخۆتر لە ئەدەبیاتی کوردی لەڕووی گێڕانەوەوە، وەکوو هەموو بوارەکانی دیکە، لە دوای ئەدەبیاتی وڵاتانی دیکە دێت، یەکەم ڕۆمانی کوردی، لە ساڵی ١٩٣٥ لەلایەن عەرەبی شەمۆ (١٨٩٧- ١٩٧٨)، لە ئەرمەنستان بەناوی (شڤانێ کورمانجا) بڵاوکراوەتەوە کە بە پیتی ڕووسی نووسراوە، بەمەش (شڤانێ کورمانجا) دەبێتە یەکەم ڕۆمانی کوردی کە چاپ و پەخش کرابێت(٢).

پێش ئەوە، ڕۆمانی (مەسەلەی ویژدان) کە ئەحمەدموختار جاف لە ساڵانی (١٩٢٧- ١٩٢٨) نووسیویەتی، بەڵام ئەو کات و بەهۆی نەگونجانی بارودۆخەکە، یان هەر بارودۆخێکی دیکەی پەیوەست بە نووسەرەکەیەوە، ئەم ڕۆمانە چاپ نەکرا و بە دەستنووس مایەوە، تا ساڵانی حەفتا، ئینجا چاپ و بڵاوکرایەوە.

یەکەم ڕۆمانی چاپکراوی کوردی باشووری کوردستان، ڕۆمانی (پێشمەرگە)یە، کە دکتۆر ڕەحیمی قازی نووسیویەتی و سەرەتا لە ساڵی ١٩٥٩ لە شاری ئیرەوانی وڵاتی ئەرمینیا چاپکرا و چاپی دووەمیشی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٦١ بڵاوبۆتەوە.

## قۆناغەکانی ڕۆمان:.

ڕۆماننووسان، ئەمان بەپێی قۆناغ و گەشەی کۆمەڵایەتی و هزریی و پێویستی ئەدەبی و کەرەستەکانی نووسین و مەعریفەی تاکەکانی کۆمەڵگاکانیان گەشە دەکەن و بەڕوونیش دەبینین نەوە دوای نەوە قۆناغی تازە و لە ستایل و مۆدێلی نووسینی ڕۆمان سەرهەڵدەدەن. بۆ نموونە لە هەر قۆناغێک هیچێک لە ڕۆماننووسەکان لە قۆناغی پێش خۆیان نامێننەوە. هەروەک قۆناغەکانی جیهانی بەگشتی بەم جۆرەیە.

## ڕۆمانی سەدەی نۆزدەهەم

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە ڕۆمان لەژێر کاریگەریی سەردەمی پێشووتر بوو. لەم سەدەیەدا گرنگییەکان زیاتر لە بیر و هەست. لەسەر سروشت و خەیاڵ بوون. گۆتی بنچینەی ڕۆمانی ڕۆمانسییە و جەختیان لەسەر توانا ڕۆحییەکان دەکردەوە. لە ڕۆمانە ڕۆمانسییە دیارەکان (جەین ئێیر) کە لە ساڵی ١٨٤٧ لە نووسینی چارلۆت بـرۆنتەیە یەکەمین نموونەیە لەناو ڕۆمانە سەرکەتووەکان دەربارەی پەروەردەکار و پیاوی نادیار.

نمونەیەکی دیکە (وزەرین هایت) کە لە ساڵە ١٨٤٧ بە قەڵەمی ئیمیلی برۆنت نووسراوەتەوە، کە ئەویش ڕۆمانێکی ڕۆمانسییە. هەروەها ڕۆمانەکەی هـێرمان مێلڤیل لەسەر سرووشتی باشە و خراپە بەناوی (مۆبی دیک) کە لە ساڵی ١٨٥١ نووسراوەتەوە، (نامە سوورەکە) و (ماڵی حەوت گێبڵ) ڕۆمانی نـاسانیەل هۆپۆرنن، کە دەربارەی گوناح و پیوریتانیزم بووە. ئەمانە و چەندین ڕۆمانی تر نموونەی ڕۆمانی ئەو سەردەمەن.

> **کۆمەڵێک ڕۆماننووسی ڕەچەڵەک کورد ڕۆمانیان بـە زمـانی بێگانـە دەنووسی کـە ناوبانگی جیهانییان هەبوو وەک یەشار کەمال کە بە تورکی دەنووسێت، سەلیم بەرەکات بە عەرەبی و ئیبراهیمی یونسی کە بە فارسی دەینووسی.**

## ڕۆمانی سەردەمی ڤیکتۆریا

ڕۆمان هێندە جێگیر و دامەزراو بوو کە بووە زاڵترین نووسینی ئەدەبی لە ماوەی فەرمانڕەوایی شاژنە ڤیکتۆریای ئینگلترا (١٨٣٧-١٩٠١). ڕۆماننووسە ڤیکتۆریاییەکان بەرپەرچدانەوەی قارەمانە خاوێن و چاکەکارەکانی چینی مامناوەندیان دژی کۆمەڵگە و فێربوونی هەڵە لە ڕاستەوە لەناو زنجیرەیەک هەڵەی مرۆڤدا بەرجەستە دەکرد. ڕۆمانێکی واڵکۆت سکۆت بووە هۆی نوێکاری لە نووسینی ڕووداوەکاندا. نووسەرە ڤیکتۆرییانە بەناوبانگەکان وەک چـارلس دیکێنس، باشترین ڕۆماننووسی ئینگلیزی سەردەمی ڤیکتۆریان، (کـریسمس کـارۆلی) لە ساڵی ١٨٤٣ نووسیووە. لـویس کـارۆڵ (چارلس لۆدویج دۆجسۆن) سەرکێشییەکانی ئالیشا لە وۆندەرلاند، لە ساڵی ١٨٦٤ و (بەناو شێوە شووشەییەکە)دا لە ساڵی ١٨٧١ نووسیووە.

## ڕۆمانی ڕیالیزمی

ئەم ڕێبازە دوای شۆڕشی پیشەسازی لە سەدەی نۆزدەدا ئەو جۆرە ڕیالیزمە سەریهەڵدا. کە ڕەتکردنەوەی ئایدیالیزم و ڕۆمانتیسیزمی ژانرای پێشوو بوون. ڕیالیزم بەخێرایی گەشەیسەند و گۆڕا بۆ سرووشتگەرایی کە بارودۆخی کەسایەتییەکان ڕەشبینتر و بێهێز ببوون بەهۆی سرووشتییانەوە. نموونەی ڕۆمانی سرووشتگەرایی (کابینەی خاڵە تۆم) هاریت بیچێر ستۆوە، لە ساڵی ١٨٥٢ دەربارەی شەڕی ناوخۆیی ئەمەریکا نووسیویەتی. دوو ڕۆمانی دیکە لەلای (تۆم ساوییێر) لە ساڵی ١٨٧٦ و (سەرکێشی هەکەلبێری) لە ساڵی ١٨٨٥ لەلایەن (مارک تواین) و (ساموێل لانگهۆرن کلێمنس) نووسراون، دواجار بوونەتە ڕۆمانێکی بەناوبانگ لە ئەمەریکا.

## ڕۆمانی (مۆدێرنێتە) و سەدەی هاوچەرخ

ڕۆمانی سەدەی بیستەم بەسەر دوو قۆناغی ئەدەبیدا دابەش دەکرێت. ئەدەبیاتی مۆدێرنێتە(١٩٠٠-١٩٤٥) و (ئەدەبیاتی هاوچەرخ-تاکو ئەمڕۆ) کە پۆست مۆدێرنێتەیە. لە ڕۆمانی مۆدێرن و هاوچەرخدا پرسیاری بوونی، سەرانگیری بەسەر هۆکارەکانی مرۆڤدا، سرووشتی حەقیقەت و ڕاستی، فۆرمی سەرەکی ڕۆمانەکانە. ڕۆمانی ئەم سەدەیە ڕەنگدانەوەی ڕووداوە گەورەکانی گێتین وەک جەنگی دووەمی جیهانی و جەنگی ڤێتنام و هێرۆشیما و جەنگی سارد و شەپۆلی کۆمۆنیزم. ڕۆمانە بەناوبانگەکان وەک ڕۆماننووس ڤیرجینیا ولف، ڕۆماننووس جەیمس جۆیس، کە بەناوبانگترین ڕۆمانی دژە جەنگە لەسەر جەنگی یەکەمی جیهانی بێ و نوسراوەتەوە. هەروەها ڕۆماننووسی ئەڵمانی ئێرخ ماریا ڕیمارک و (دەنگ و دەمارگیری) ڕۆماننووس و کورتەچیرۆکنووسی ئەمریکی ویلیام فۆلکنەر باس لە پووکانەوەی باشوور دەکەن لە دوای جەنگی ناوخۆی ئەو وڵاتە.

## ڕۆمانی پۆست مۆدێرن

هەرچەندە ڕیالیزم و سروشتگەرایی ڕۆمانیان بردە سەردەمی هاوچەرخی سریالیستی کە تێیدا کەسایەتییەکان کاریگەرتر بوون. لێ ڕۆمانی سەدەی پۆست مۆدێرنێتە، هاوچەرخ، حەقیقەتی ئەفسوناویی و خەیاڵ و ڕۆمانی هێڵکاری لەخۆدەگرێت. جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە مرۆڤ لەلایەن هێزێکی بەهێزترەوە فەرمانڕەوایی دەکرێت دەکاتەوە و گەردوونیش بە تەنها هۆکارێک شیناکرێتەوە. ڕۆمانە مۆدێرنەکان زمانێکی گاڵتەئامێزی تێدایە و متمانەی کەمتر بە نەریتەکان و چۆنێتی باسکردنی کاتەکان لە چیرۆکەکاندا پیشاندەدات. ڕۆمانە پۆست مۆدێرنێتەکان وەک: (ڕەنگی مۆر) ١٩٨٢ لەلایەن ئەلیس والکەر، (لە خوێنی سارد) لەلایەن ترومان کاپوت لە ساڵی ١٩٦٦، (ڕەگەکان)ی ئالێکس هالێی لە ١٩٧٦، (ترس لە فڕین) ئیریکا یۆنگ کە لە ساڵی ١٩٧٣، پێشەنگی ڕیالیستەکان، ڕۆمانی ئەفسوناویی (١٠٠ساڵ تەنهایی) گابرێل گارسیا مارکێز.

**ڕۆمانی ناوخۆ:.**

لە سەرەتاکانی دەیەی شەستەکانی سەدەی بیستەم دەقی ڕۆمان لە ئەدەبیاتی کوردی کەوتە جموجۆڵ و گەشەی ئەدەبیی خۆی کە لە ڕۆماننووسانی شەستەکان دێن، بگرە تا دێتە سەر نەوەی حەفتاکان، نەوەیەکی دیاری ڕۆماننووسانی کوردین زۆر بەڕوونی دەکەونە ژێر کاریگەری ئەدەبی ڕیالیستی و بەهۆی بوونی کێشەیەکی نەتەوایەتیی زیاتر بەرەو ئەدەبی بەرگریی و ناسیۆنالیزمی و بە دیاریکراوی لەژێر هەژموونی ئەدەبی ڕووسی دان. بەتایبەتی ماکسیم گۆرکی و دیسکۆفیسکی و تریرۆدۆسکی کاریگەری تەواویان لەسەر ڕۆماننووسانی کورد هەیە. بۆیە زۆرتر گۆشەنیگای ئەدەبی ئەوانە لەسەر فۆرم بووە، نەوەک تەکنیک و شێوزا و بونیادی ئەدەبیی.

لە ئەدەبیاتدا بەگشتی پێوەرێک هەیە و پەیڕەوی دەکرێت وەک جولیا کریستۆفا دەڵێ: هەموو تێکستێکی ئەدەبی ڕیشەی لەناو تێکستی پێش خۆیەتی. بەواتایەکی دیکە گەڕانەوەی نەوە بۆ پێش نەوەی خۆی ڕەنگە ڕەوابێت، ئەمە بەهێزی نەوەی دواتر دەردەخات. لێ من ئەمە بۆ ڕۆمان بە باش نابینم، چونکە دەبێت ڕۆمان هەمیشە لەگەڵ گۆڕانکاریی و پێویستی ژیانکردنی مرۆڤایەتی خۆی نوێ بکاتەوە و هاوکات لەگەڵ شەپۆڵ و ئاڕاستە نوێکانی ڕۆمانی جیهانی ڕێ بکات.

من ئەم دەرچوونە لە قاوغی پێشوو لە ڕۆماننووسانی کورد زۆر بەدەگمەن دەبینم، هەرچەندە خۆ جیاکردنەوەی ئەدەبی پێوستی بە ڕێچکە و ڕێبازی ئەدەبی خۆجێی هەیە. بەڵام لە ئەدەبیاتی کوردی تەنیا هەوڵ دەبیندرێت، هەروەک ئۆکتاڤیۆپاس گوتوویەتی: نوێخوازی لە بەرانبەر نوێخوازییەکی تر ڕەخنەی گرتووە و خۆی بەیان کردووە، بۆیە لەڕێگەی مانیفێستەوە دەریدەبڕن. بەشەکەی دیکەیان ئەو جەنگەیە کە لە نێوان گرووپی ئەدەبی شارچییەتی هەیە، بیانووەکەش ئەوەیە کە جیاوازی ستایلی کارکردنە، یاخود جیاوازی بۆچوونە بەرانبەر بە زمانی ئەدەب. ئەگەرچی مانیفێستەکە چ لەنێو فیکر و چ لەنێو ئەدەبیاتی گەلانیشدا شتێکی نوێ نییە، پێشتر لەنێو ئەدەبیانی گەلانی ڕۆژهەڵاتیشدا هەبووە، بۆ نموونە لەنێو فارسەکاندا، (بزورگی عەلەوی، سادقی هیدایەت و د.موسەدەق) هەبوون، ئەم ئەدیبانە لەژێر کاریگەری ئاڵوگۆڕی ڕەوشێکی سیاسی لە ئێران، ئەو مانیفێستەیان دەرکرد، لەناو عەرەب و بەتایبەتی ئەدەیبانی عێراقیش وەک (سامی مەهدی، فازل عەزاوی، فەوزی کەریم و خالید عەلی) دروستبوون، ئەمانیش لەژێر کاریگەری فیکری چەپگەرایی بوون کە لە ئەورووپاوە وەک پردێک لە لوبنان و میسرەوە ڕووی لە عێراق کردبوو، ئەم دەستانە خۆیان ڕاگەیاند و مانیفێستی تایبەت بە خۆیان بڵاوکردەوە.

## دەستە و گرووپە ئەدەبیە کوردییەکان

بەهەمان شێوەش لەناو ئەدیبانی کورد، مانیفێستەی ئەدەبی گرووپی کفریی و ڕوانگەییەکان بەتایبەتی بزوتنەوەی (ڕوانگە لە ساڵی ١٩٧٠) هەبوون، ئەم بزوتنەوەیە یەکەمین بانگەوازی خۆی لە ڕێکەوتی ١٩٧٠/٤/٢٥دا لە ژمارە (١٥)ی ڕۆژنامەی (هاوکاری) لە شاری بەغدا بڵاوکردەوە. بزوتنەوەکە خواستی سەرەکی نوێکردنەوەی ئەدەبی کوردی بوو، بە هەوڵی کۆمەڵێک قەڵەمی تازەی ئەو سەردەمە کە دواتر دەبنە ناوێکی دیاری ئەدەبیاتی کوردی، لەوانە (حسێن عارف، کاکەمەم بۆتانی، جەمال شارباژێڕی، جەلال میرزا کەریم، کەمال ڕەووف محەمەد، شێرکۆ بێکەس) ئەمانە لەژێر دروشمی (بیری نوێ، وتەی نوێ، کرداری نوێ)، هەستکردن بە زەرورەتی تازەکردنەوەی ئەدەبی کوردی و نوێکردنەوەی جیهانبینی خوێنەرانی کورد، هەڵدەستن بە داڕشتنەوەی کۆمەڵێک فۆڕم و پێودانگ و جومگەی کۆنی ناو ڕۆشنبیری کوردی و گۆڕینی بە فۆڕم و ناوەڕۆک و بابەتی تازە. لەوانە شێرکۆ بێکەسی شاعیر یەکێک بوو لە ڕابەرانی بزوتنەوەکە هەرچەند ڕۆماننووسانی وەک حسێن عارف و کاکەمەم هەبوون، لێ ئەمە زێتر لە چوارچێوەی شیعریی و هەوڵی تاکەکەسی مایەوە، نەوەک دەستە و گرووپ.

هەروەها لە نەوەدەکانیشدا مانیفێستی (وێران) و پێشووتریش کۆمەڵێک نووسەری هەولێر دەستەجەمعییەکیان بەناوی قوتابخانەی هەولێر هەبووە، لە هەندەرانیش گرووپی (ڕەهەندییەکان) لە پەنای کاری فیکریی و لێکۆڵینەوەدا خۆیان ڕاگەیاند. لێ هیچ یەکێک لەو دەستە و گرووپانە کاریگەری خۆیان نەخستە سەر نەوەکان و ئەو ستایلە ئەدەبییەش کە تا ئێستا کاری پێدەکرێت. لێ لە هەریەکێک لەم بزوتنەوە ئەدبییەکان بەتایبەتی کوردی ڕۆڵی چیرۆکنووسان و ڕۆماننووسان کەمتر دەردەکەوێت و مانیفێستەیانە نەبووە مۆدێل و گوتارێکی زاڵی ئەدەبی و نەوەی دوای ئەوان بیکات بە بنەما و کاری پێکات، چونکە ئەدەب کاری تاکگەراییە نەک گرووپ کە ئەمە دوای چارەکە سەدەیەک بوو بە تێگەیشتنی فیکری لەناو ئەدیبانی کورد، هەربۆیە دواتر لەبەریەک هەڵوەشانەوە، کە بینیمان گرووپەکانی کەرکووک و ڕوانگە و هەولێر و ڕەهەندییەکان چۆن توانەوە و نەیانتوانی شتێک زیاد بکەن بۆ سەر ئەو مانیفێستە ئەدەبییانە، چونکە دەرکەوت ئەدەب کاری تەنیاییە نەک گرووپ.

دواجار ئەوەی کە لە چەمکی مانیفێستەوە تێدەگەین، کارێکی دوو پەتییە، یەکەمیان: لە پشت دەقی ئەدەبیدا مشتوومڕێکی مەعریفی و هزریی دێنێتە ئاراوە تا برەو بە جیاوازییەکان بدات، دووەمیان: ئەوەیە کە لەو دیووی ئەدەبدا جیاوازییەکان دەمرێت، دەروونناسی کەسی توندڕۆ دادەبڕێنێت لە نووسەری دەق کە ڕەخنە لە دەقەکەی دەگیرێت

و بە ئاسایی وەریدەگرێت، ئەوەش کە گورز لە جیاوازی دیدگا دەوەشێنێت، گرووپێک ئەوانیتر پشتگوێ دەخەن و دایاندەبڕن لە دونیای ئەدەب، بە بیانووگرتنی نوێخوازیی و دابڕان و کەلێنێک دروست دەکەن و تاقی دەکرێنەوە، بۆیە هەموو مانیفێستێک تەنیاوتەنیا بۆ ماوەیەکی کورت دەڕۆن نەوەک درێژ.

دوو دەیەی پێشوو مایەی ئەوە بوون کە ببنە فاکتۆیەک بۆ گەشەسەندنی ئێستای ڕۆمانی کوردی هەرچەند ڕۆماننووسانی نەوەکانی پێشوو لە پەنجەکانی دەست تێنەدەپەڕین، لەوانە حسێن عارف لە هەشتاکانەوە هەردوو ڕۆمانی شار و ئەندێشەی مرۆڤێکی چاپ کرد، عەزیزی مەلا ڕەش کوێخا سێوێ و غەوارە و خەسرەو جاف کۆردەرە و هیچی چاپ کرد. لە ئەدەبیاتی شاخ و کێو دا، محەمەد موکری ڕۆمانەکانی سەگوەڕ و تۆڵە و هەرەس و حەمەکەریم عارف کۆچی سووری چاپ کرد. لە هەندەرانیش چەند بەرهەمێک لەدایکبوون وەک ڕۆمانی مرنا کاڵەکەی ڕەند و هاوارا دیجلەیێ محەمەد ئۆزۆن، بەشێوەزاری کرمانجی ژووروو.

ئەگەرچی لەم قۆناغانەشدا یەک شێوازی گێڕانەوە و کاریگەری شۆسیالیستی ناسیۆنالیزمی بە زۆربەی ڕۆمانەکانەوە دەبیندرێت، دەبێت ئەوەش بزانین کە ئەم قۆناغە ڕێگەی خۆشکرد بۆئەوەی کە ڕۆمانی کوردی لە قۆناغی نەوەدەکان زۆر زیاتر پێشبکەوێت، گەشەسەندنێکی وا بەخۆیەوە ببینێت کە هەرگیز گەشەسەندنی وای بە خۆیەوە نەبینیبێت. سەرباری ئەو ڕۆمانانە کۆمەڵێک ڕۆماننووسی ڕەچەڵەک کورد ڕۆمانیان بە زمانی بێگانە دەنووسی کە ناوبانگی جیهانییان هەبوو وەک یەشار کەمال کە بە تورکی دەنووسێت، سەلیم بەرەکات بە عەرەبی و ئیبراهیمی یونسی کە بە فارسی دەینووسی. هەرچەند ئەم ڕۆماننووسانە لەڕووی زمانەوە ناچنە خانەی ڕۆمانی کوردی، کەچی لە ناوەڕۆکدا باسی ژیان و خەباتی کورد دەکەن.

## دواین نەوەی ڕۆماننووسی کوردی

تا ئێستا جگە لە چەند ڕۆماننووسێک کە بە پەنجەی دەست هەژمار دەکرین، گەرنا بەگشتی ڕۆماننووسانی گەنج لەژێر هەژموون و کارتێکردنی ڕاستەوخۆی نەوەی پێشوتر دەرنەچوون و نەیانتوانیوە ئەم قاوغە تێک بشکێنن. بۆ نموونە ماوەیەک لەمەوبەر من دوو ڕۆمانی دوونەوەی جیاوازم خوێندەوە کە هەردووکیان لە ناوەڕۆکدا یەک باس بوون. کە یەکیان نەوەی حەفتاکان و هەشتاکانە و دووەمیان ڕۆماننووسێکی تازەیە، هەردووکیان لە فۆرم و ناوەڕۆک باسی ڕێکخستنەکانی ناو شاری بزوتنەوەی کوردایەتی دەکەن. ئەمە کاردانەوە و موتروبەکردنی بیری لقی دووەمە لەسەر فۆرم و بیری یەکەم لق و پۆپی گرتووە، کە دەبووایە سیمایەکی نوێی بە بیرەکەی بدایە. بۆیە

پێوستە ڕۆماننووسان هەمیشە خۆیان تازە بکەنەوە و بەرەو ڕەوت و کارتێکردنی تازە بچن، لە بەرامبەرشدا هەوڵی زۆر جوان هەن وەک پڕۆگرافیکی شەوانی باکۆی کەماڵ سەعدی، لەڕووی شکلییەوە و سادیستییەتی ڕۆمانی بەڕێگاوەی بەندە و زانستیی مرۆڤی هەرزانی گۆران سەباح، عیرفانی ڕۆمانی میدیای هۆشەنگ شێخ محەمەد. کە بەتەواوی لە فکر و ناوەڕۆکی ڕۆمانەکانی پێش خۆیان دەرچوون و تازەن بە ئەدەبیاتی کوردی. ئارنست هەمەنگوای دەڵێت: شێوازی نووسین ئەوەیە، وا بنووسیت، پێشتر کەس وای نەنووسیبێت، داهێنانیش ئەوەیە لە هیچ داهێنانێکی پێشتر نەچێت.

**چیرۆک و ڕۆمان لە شێوەی ژانرەکانی دیکەی ئەدەب بە سـادە و ساکاریی لە هەناوی پەخشانەوە لەدایکبوو پاشان خزایە نێو فەرهەنگ و کایەکانی ژیانی مرۆڤ.**

**پەیام لەنێو ڕۆمانی کوردیدا.**

لە هەموو دونیادا ڕۆمان هەمیشە پەیامێکی بەرزتری بۆ خوێنەرانی پێیە، بۆیە زۆرجار نووسەر دەگەیەنێتە ئاستی دوودڵی و دڵەڕاوێکی جددی. لێرە کارامەیی و زەندی نووسەر خۆی زیت دەکاتەوە و دێتە پێشەوە کاتێک کە وا لە خوێنەر دەکات ناچار تا ئاستی دەق بەرزبێتەوە، چونکە پانتایی نێوان خوێنەر و نووسەر زۆرجار وەک پانتایی نێوان زەوی و ئاسمان واییە، گرنگە باشترین نووسەران ئەو کەسانە نەبن کە بۆ ئاستی خوێنەر دێنە خوارەوە، بەڵکو ئەوە خوێنەرە دەبێت بە پایەکان و نەردەبانەکانی نووسین سەرکەوێت وەک جەبار جەمال غریب(٣) دەڵێت: من گەر یەک خوێنەرم هەبێت درێژە بە نووسین دەدەم.

سەرەڕای هاتنی گۆلباڵ و پێشکەوتنی تەکنەلۆژییا و سەرقاڵبوونی زیاتری مرۆڤەکان و خەریکبوونیان بە بابەتە کورت و خێراکان، تا ئێستاش ڕۆمان پێگەی خۆی لەدەست نەداوە و ڕۆماننووسانیش بەردەوام لە ڕووی تەکنیک و گرێچنی و گێڕانەوەی ڕووداوەکانەوە، پەرە بە هونەرەکەیان دەدەن. هەرچەندە لەگەڵ دەرکەوتنی کۆمپیوتەر و مۆبایل و ئامێرە زرنگەکان، باسی مەرگی نووسراوی سەر کاغەز و بەر لە هەمووشیان باسی مەرگی ڕۆمان لە جیهان دەکرێت.

## ڕۆڵی ڕۆمان لە هەمبەر فەلسەفەدا:

هەڵبەتە ژانری ڕۆمان یەکێکە لە ڕەگەزەکانی ئەدەب کە مرۆڤ بە دەربڕینێکی جیاواز لە گێڕانەوەی ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیان بەدەر لە نووسینەوەی مێژوو و یادەوەریی و بیرەوەرییەکان، بە زمانێکی تایبەتی تر و باڵاتر لەوانەی پێشوو کە باسمان کرد، لە ڕێگای گەمەی زمان و گێڕانەوەی سەرد و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و دەرخستەی داهاتووی خۆی پێ دیاری دەکات. هەروەک ئەلبێر کامۆ لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەڵێت: «ئەوەی ڕۆمانی پێ لە ژانرەکانی تری ئەدەبی جیا دەکرێتەوە هەمەچەشنی و فرەڕەهەندی ڕۆمانە لە نووسینەوەی ڕووداوەکان»، بەمەش ڕۆمان وەک قورسترین و زەحمەترین ژانری ئەدەبی دیاری دەکرێت. بە هەمان شێوە کامۆی ڕۆماننووسی جیهانی لە درێژەی تێڕوانینە تایبەتییەکانی خۆیدا دەنووسێت:» ئەگەر ئەتەوێت ببیت بە فەیلەسووف سەرەتا بڕۆ ڕۆمانێک بنووسە»(٤)، گەر بێت و ئەمە دیدگایەکی ئەدەبی بێت بۆ باڵگرتنی دەقی ڕۆمان، پێچەوانەکەشی هەر درووستە. وەک ژان پۆڵ سارتەری فەیلەسووفی بوونگەرایی سەرنج دەخاتە سەر فەلسەفە:» فەلسەفە وەک نووسینی ڕۆمان وایە، لە هەموو ڕووداوێکدا پرسیارێک دروست دەکات»(٥) بەم پێودانگە دەکرێت ڕۆماننووس وەک فەیلەسووفێکی بچووک لێی بڕواندرێت. سەرباری ئەوەی کە مەرجە نووسەری ڕۆمان سەرەتا ئەدیب بێت و دواتر ڕوانینی تایبەتی و باڵای هەبێت بۆ ژیان و سەرەداوی جیاواز و ئەبستکراتی و ڕەهایی هەبێت بۆ پرۆژێکتۆیی ژیان و دەرخستەی نهێنی و پەنهانەکانی ناخی مرۆڤ لەبەر یەک هەڵبخات، شیکاری بۆ بکات و بیخاتە بەر خەرمانی ئەدەب و ئازایانە و بە بوێرییەوە بیخاتە بەرباس.

## هەمەچەشنی و فرە ڕەهەندی لە ڕۆماندا:.

مێژووی ڕۆماننووسانی جیهانی ئەمەی سەلماندووە، کە هەموو ئەو ڕۆمانانە سەرکەوتووترن کە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکان فرەیی و هەمەچەشنی زێدەتر سەرکەتووترن لەوەی کە ڕۆماننووس یەخەی تەنیا یەک ڕووداو بگرێت و تا کۆتایی بە دوایدا بچێت. لە بەر دوو هۆکار.

یەکەمیان: تەنیا ڕووداوێکی دیاریکراو، خوێنەرێکی دیاریکراویش بە سەرنج دەگرێت.

دووەمیان: تەنیا یەک ڕووداوی گشتگیر پەیامێکی دیاریکراویش بەدەستەوە دەدات.

وەلێ لە فرە ڕەهەندی ڕووداودا خوێنەری هەمە ڕەنگ و پەیامی فرە چەشنیش دەکاتە ئامانج

## ئەرکی ڕۆمان لە ژیانی مرۆڤ:

هەروەک چۆن هەردوو نووسەری دیاری جیهانی بواری دەروونی ماسۆشیەت و سادیزمی، دۆناتا فرانسۆ دیسادی فەرەنسی، ناسراو بە مارکیز دیساد لە ساڵی ١٧٤٠-١٨١٤ و فۆن زاخر مازۆخی نەمساوی لە نێوان ساڵانی ١٨٣٦-١٨٩٥ دوو نووسەری دەروونشیکار نەبوون بەڵکوو دوو ڕۆماننووس بوون توانیان گەورەترین دوو نەخۆشی سادیسییەت و ماسۆخیزمی بدۆزنەوە. بەمەش دەشێ ڕۆماننووس ببێتە فاکتۆیەک بۆ چارەسەر و گۆڕانکاری گەورە لە سەرجەم کایەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، لە ڕزگاریی و ئازادیی و پاراستنی چەمکە مرۆییەکان. تەنانەت وەک بەرگریکاری نوێ و بێ لاگیریی و گوێدانە قرخە قرخ و مقۆکان و هەڵواردەی جیاوازییە سروشتییەکان، ڕۆماننووس ڕۆڵی کارای دەبێ وەک ژیل دۆلۆز دەڵێت:» نموونەی هەرە گەش لای من بریتییە لە: کافکا، بیکێت، گیراسیم لۆکا و گۆدار، نووسینەوەی تەتەڵەیەکی زۆر جوانیان داهێنا، ئەویش نووسینەوەی تەتەڵەی تایبەتی خۆیانە. بەوپێیەش وەکوو کافکا ئەرکی ڕۆماننووس نووسینەوەی ڕووداوەکان و پیسی و پۆخڵی مرۆڤە وەک خۆی و لە ڕێگای شەپۆلەکانی هزر و خەیاڵی تایبەتی نووسەر، بەمەش نووسەر دەبێتە هەڵگیرسێنەری شۆڕشێکی تایبەتی لە ناخی خوێنەردا و لێکەوتەکانیشی دەچێتە خزمەتی گیرفانی کەسانی تر، بەناوی شۆڕشی فکریی و کۆمەڵایەتی و سیاسی، نەتەوەیی و نەژادی، ئەمەش بە ڕوونی لە لای ماکسیم گۆرکێ لە «دایک» و «زانکۆکانی ژیانم» و چیخۆڤ «زیندە خەون» و دیسکۆفیسکی لە «تاوان و سزا»دا بە سەرجەم ڕەهەندەکانی دیکە دەبنە زەرورەتی ژیان لای خوێنەر.

## زمان لە ڕۆمانی کوردیدا

سەرباری ئەوەی ڕۆمانی ئێستا لە ناوەڕۆکی گێڕانەوە و تەکنیک و شێوە و شێواز و بوونیاد بەهێزە، لە بۆ گێڕەوەی هەمووشتزان و کەم شتزان دا، پێشکەتووترە لە ڕۆمانەکانی شەستەکان و حەفتاکان، ئەمەش کاریگەرییەتی زۆر و زەوەندی وەرگێڕانی دەقی بیانی و نووسەرانی بێگانەیە لەسەر ڕۆماننووسانی کورد.

پێمخۆش بوو ئەمە ڕوون بکەمەوە کە لە ئێستادا ڕۆمانی کوردی لە ڕووی زمان و ڕێنووس و ڕێزمانی کوردییەوە، لە خراپیترین دۆخدایە، دەتوانین بڵێین زۆربەی ڕۆماننووسانی کورد نەشارەزان بە زمانی زگماکیی، هەر ڕۆماننووسێک ڕێنووسێکی تایبەتی خۆی هەیە و بەتایبەتی تر لەڕووی بەکارهێنانی زمان و ڕێنووسەوە، هەرچەندە ئێمە تا ئێستا یەک ڕێنووسی دیاریکراو و یەکانگیریی کوردیمان نییە، ئەوەش وایکردووە هەریەکەمان بە جۆرێک دەنووسێت. وەک ئەوە وایە بڵێین لە جەنگدا هەموو شتێک ڕەوایە، ئەمەش کاریگەری نەرێنی زمانی داگیرکاریی زمانەکانی سەردەستە و کۆچ و تێکەڵی ڕۆماننووسانە بە ئەدەبی دەرەوە کە سەری زمانی کوردی خواردووە.

## ئەنجام:.

هەڵبەتە هەموو دەقێک چەندان گۆشەنیگای جیاوازی هەیە و دەشێت چەندان توێژینەوە و خوێندنەوەی جیاواز بۆ یەک دەق بکرێت، ڕێی تێناچێت ڕۆمانێک بنووسرێت، هەڵگری هیچ پەیامێک نەبێت، خوێنەر هیچی لێوە فێر نەبێت و کەم و زۆر بەشداری لە گۆڕینی هزری تاکی کورد نەکات، خوێنەری کورد تامەزرۆیە، خۆی لە ڕۆماندا ببینێتەوە، تێکەڵی ببێت و پرسیاری لا دروست بێت، ڕۆماننووس بە ئاسانی دەتوانێت خوێنەر بورووژێنێت. خوێنەر لە ڕۆمانەوە فێر دەبێت، چۆن چێژ لە ژیان وەردەگرێت و زۆرجار خۆی لە دەقدا دەدۆزێتەوە کە لە واقیعدا دەستی ناکەوێت.

لەکۆتاییدا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی ڕۆمانی کوردی لە نێوەندێکی جیاوزدایە نە فرە دەنگە و نە یەک دەنگ، واتە ڕۆمانی کوردی نەوەک تاک توانیویەتی وەک دەنگی جیاواز سنووری زمانەکانی تر ببڕێت و وەک ڕەوت و دەستە و گرووپیش نەبۆتە ئەو دەنگە کە ببێتە ڕێبازێکی بە هێزی ئەدەبی و کاریگەری و لێکەوتەی لەسەر گەلانی دیکە هەبێت، تەنیا هونەری ڕۆمانی کوردی لەسەر هەوڵی جوانی تاکەکەسی ماوەتەوە.

## پەراوێزەکان

١ - تأريخ الرواية، الموسوعة العربية العالمية، مجلد (١١)، ط٢، مؤسسة أعمال الموسوعة للنشر و التوزيع، ١٩٩٩.

٢ سەنگەر زراری: ڕۆمانی کوردی، مێژوو و سەرهەڵدان، لە سەرەتاوە تا ڕاپەڕینی (١٩٩١)، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٣٩)، نیسانی ٢٠١٧.

٣ سەرچاوە: پێنجەمین کتێب جمال جبار غریب.

٤-کتێبی یادداشتەکان ئەلبێر کامۆ. و پێشڕەو حسێن.

٥-کتێبی فەلسەفەی ژیل دۆلۆز. و ڕێبین ڕسوڵ اسماعیل.

---

## سەرچاوەکان


**کوردی**

- سەنگەر زراری: ڕۆمانی کوردی مێژوو و سەرهەڵدان لە سەرەتاوە تا ڕاپەڕینی ١٩٩١، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٢٣٩)، نیسانی ٢٠١٧.
- جمال جبار غریب: ڕۆمانی پێنجەمین کتێب، ٢٠٠٩.
- یادداشتەکان ئەلبێر کامۆ. و. پێشڕەو حسێن، ٢٠١١.
- فەلسەفەی ژیل دۆلۆز، و. ڕێبین ڕسوڵ اسماعیل، ٢٠١٨.
- حسێن عارف : ڕوانگەو یاران و نەیارانی- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٥.
- شوان ئەحمەد: ڕوانگەی یار و نەیار، ڕۆژنامەی ئەیکترۆنی وتاری کورد، . ٢٠١٣-١٢-٠٤
- سمکۆ محەمەد: مانیفێستۆی ئەدەبی، ڕۆژنامەی ڕێگای کوردستان، ٢٧ی ئازاری ٢٠١٩.

**عەرەبی**

- - تأريخ الرواية، الموسوعة العربية العالمية- مجلد(١١)، مؤسسة أعمال الموسوعة للنشر و التوزيع، ط٢، ١٩٩٩.
- عبد الملك مرتاض: نظرية النص الادبي، ٣- يونيو ٢٠٠١٧.
- لأدب بين القومية والعالمية كيف يصبح الأثر الأدبى جزءا من الأدب العالمي. -https://al-vefagh.ir/News/163716.html

**فارسی**

- دن کیشوت، سروانتس ترجمەی محمد قاضی، ٢٩ی بهمن١٣٩٧.
- فرانتس کافکا: مسخ (The Metamorphosis)، ژانر کتاب : پوچ گرایانه، قالب ادبی، رمان زبان: آلمانی تاریخ خلق اثر : پراگ ، ١٩١٢ تاریخ چاپ : ١٩١٥ ناشر: Kurt Wolff Verlag.

-بهرترین رمان ها تحلیل رمان ١٩٨٤ اثر جورج اورول. پتامبر ٢٣, ٢/٢٠١٩ دیدگاه /توسط محمدرضا تیموری.





پ.د. یادگار شارەزووری
کۆلێژی زمان / زانکۆی سەلاحەدین

# نووسینەوەی خود بە زمانی ئەوی دیکە
# ڕۆمانی کوردی لە هەناوی ئەدەبی عەرەبیدا

دیاردەی نووسینی ڕۆمان بە زمانێکی دیکە دیاردەیەکی کۆنە، ڕەگ و ڕیشەیەکی قوڵی هەیە، بەردەوام و بەدرێژایی مێژووی ژیارەکان هەژموونی لایەک زاڵ بووە بەسەر لایەنەکانی تردا، ئەمەش وای لە نووسەر و ڕووناکبیر و داهێنەرانی گەل و نەتەوەکانی دیکە کردووە، بە زمانی ژیاری باڵا بنووسن، هەندێک جاریش پەنابردنە بەر زمانی باڵا و نەنووسین بە زمانی دایک، بەهۆی نەبوونی بوار و قەدەغەکردن و خۆسەپێنی و ڕوانگەی شۆڤێنی دەسەڵاتەوە بووە، هەندێک جاریش نەزانینی زمانی دایک هۆکار بووە، چونکە وا ڕێکەوتووە نووسەرێکی دیاریکراو سەر بە نەتەوە و زمانێکی جیاواز، ژیانی لەناو ژینگە و زمان و ڕۆشنبیری نەتەوەیەکی تردا بەسەر بردووە، زاڵبوونی ئەو زمانە و کەلتوورە لە ئاستێکدا بووە، ڕێگەی فێربوونی زمانی ڕاستەقینەی خۆی لێ ونکردووە. هەندێک جاری تریش هۆکاری پەنابردنە بەر زمانێکی تر بۆ بە جیهانیی بوونی زمانی زاڵی باڵادەست دەگەڕێتەوە، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زمانی ئینگلیزی ئەم تایبەتمەندییەی هەیە.

دیاردەی نووسین بە زمانێکی دی، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامە و لە برەویشدایە، زۆرێک لە نووسەرە بەناوبانگەکانی بواری ڕۆمان نووسین، بە زمانی خۆیان نانووسن، ڕۆمان نووسێکی بەناوبانگی وەک (جۆزێف کۆنراد) خاوەنی ڕۆمانی (دڵی تاریکی Heart of Darkness) کە بە ئینگلیزی نووسیویەتی، پۆڵەندییە، ئینگلیز نییە، جۆرج بەرنادشۆ و ئۆسکار وایڵد و سەمۆئیل بیکیت و برام ستوکەر ئێرلەندیین، هەروەها زۆرێک لە ڕۆماننووسە عەرەبەکانی تاراوگە، وەک ئاسیا عبدالجبار و ئەمین مەعلوف بە زمانی فەڕەنسی یاخود ئینگلیزی دەنووسن، لەبەرئەوەی لە ژینگەی دوور لە ژینگەی ڕەسەنی خۆیان گەورە بوون و ژیاون و ڕۆشنبیرییان وەرگرتووە، ئەمانە ڕێگربوون لەوەی بتوانن بە زمانی دایکیان بنووسن.

زیادەڕۆیی نییە گەر بڵێین نووسەرانی کورد، لە سەردەمی کۆن و نوێدا، بەهۆی نەبوونی قەوارە و قەدەغەبوونی قسەکردن و نووسین بە زمانی کوردی، لە هەموو نووسەرانی تری جیهان، ناچارتربوون، یاخود ناچارکراون بە زمانی ئەوی دیکە بنووسن، کە زۆرجار زمانی وڵاتی زەوتکار و داگیرکەر بووە، بۆیە لە پاڵ نووسین بە زمانی کوردی، نووسەرانێکی کورد هەن لە هەموو پارچەکانی کوردستان بە زمانی باڵادەستی دەوڵەت دەنووسن، لەبەر ئەو هۆکارانەی ڕوونمان کردەوە.

نووسین بە زمانی عەرەبی لەلایەن نووسەرانی کوردەوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ گەشەسەندنی بزاڤی ڕۆماننووسین لە ئەدەبی عەرەبیدا. ئەم دیاردە ئەدەبییە لە باشووری کوردستان و ڕۆژئاوای کوردستان باوە، لەبەرئەوەی زمانی عەرەبی، زمانی فەرمییە لەم دوو دەوڵەتەدا، لە دووەمیاندا بە هیچ شێوەیەک تا ئێستاش بە فەرمی و لەناو دەستووردا دان بە زمانی کوردیی و بوونی کوردی نەنراوە. بۆیە هۆکاری سەرەکی پەنابردنە بەر بەکارهێنانی زمانی عەرەبی لە نووسینی ڕۆماندا، بۆ قەدەغەکردنی زمانی کوردی دەگەڕێتەوە، نووسەرانی وەک سەلیم بەرەکات و جاندۆست و هۆشەنگ ئەوسی و حەلیم یوسف و ژنە نووسەر مەها حەسن، دیارترین قەڵەمی ئەم بوارەن. ئەم نووسەرانە شارەزایی و تواناییان لە زمانی عەرەبی و نووسین بە عەرەبی، لە ئاستێکی زۆر بەرز و باڵادایە.

هەرچی تایبەتە بە باشووری کوردستانەوە، ئەوا هۆکاری پەنابردنە بەر زمانی عەرەبی بۆ زاڵبوونی زمانی عەرەبی و خوێندن بە زمانی عەرەبی و ژیان بەسەربردنی ئەو نووسەرانەی لە ناوچە عەرەبییەکاندا دەژین، دەگەڕێتەوە. دیارترین نووسەرانی چالاکی ئەم بوارە لە باشووری کوردستان بریتین لە (عبد المجيد لطفى، محيى الدين زەنگەنە، زهدى الداوودى، تحسين گەرميانى، سعد محمد رحيم، عبد الكريم يحيى الزيبارى).

**تەوەری ڕۆمانەکان و بواری کاریان:**

دەکرێت بواری کار و بابەتی ڕۆمانەکان بەسەر سێ جۆری سەرەکیدا دابەش بکەین، بەشێکیان لە ڕوانگەیەکی فراوان و لە هۆشیارییەکی نەتەوەیی تەواوە نووسراون، لێرەدا ڕۆمان وەک ئامرازێکی بەرگری لە شوناس و پاشان چەسپاندنی شوناس بەکارهێنراوە، بابەتی نەتەوەیی و پرسی ئینتیما پاڵنەر و پێکهێنەری ڕۆمانەکانە، لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە ئەم هۆشیارییە نەتەوەییە، لە ئاستێکی زۆر باڵای هونەریدا بەرجەستەکراوە، نا یەکانگیریی و بەزۆر پێوەلکان نە بەدی دەکرێت نە هەستی پێ دەکرێت. دیارترین ڕۆماننووس، ئەم هۆشیارییە سیاسیی و هونەرییە لەلا تەکان بدات و هەردەم بە جوڵە و زیندوو بێت و سەرتاپای ڕۆمانەکانی گرتبێتەوە (سەلیم بەرەکات)ە.

سەلیم بەرەکات لە یەکەمین ڕۆمانییەوە کە ڕۆمانی (فقهاء الظلام)ە، تا دەگاتە ڕۆمانی (رواية البراهين التى نسيها مم زاد فى نزهتع المضحكة إلى هناک: الريش) و (معسكرات الابد) و (دلشاد: فراسخ الخلود المهجورة) و (الفلكيون فى ثلثاء الموت: عبور البشروش) و (الفلكيون فى ثلثاء الموت: الكون) و (الفلكيون فى ثلثاء الموت: كبد ميلاؤس) و (أنقاض الازل الثانى) و (الاختام والسديم) و (كهوف هايدراهوداهوس) و (ثادريميس) و (موتى مبتدئون) و (السلالم الرملية) و (لوعه الاليف اللا موصوف المحير فى صوت سارماک) و (هياج الإوز) و(حوافر مهشمة فى هايدراهوداهوس) و(السماو شاغرة فوق أورشليم) و (سجناء جبل أيايانو الشرقى) و (أقاليم الجن) و (سبايا سنجار) و (زئير الظلال فى حدائق زنوبيا) و (ماذا عن السيده اليهودية راحيل). کوردستان بەهەر چوار پارچەکەیەوە، بەتایبەتی تریش ڕۆژئاوا، بنەما و ڕوانگەی ڕۆمانەکانی پێکدەهێنن، هەموو ڕۆمانەکانی سەلیم بەرەکات، بە تایبەتی ئەم چوار ڕۆمانەی: (البراهين التى نسيها مم ازاد فى نزهتة المضحكة إلى هناک أوالريش، وفقهاء الظلام، ومعسكرات الابد، ودلشاد – فراسخ الخلود المهجورة) لە دوو توێی گێڕانەوەسازییەکی وردا و لە ڕوانگەی بگێڕەوەیەکی نامۆی پەڕاگەندەدا، گرنگی بە خەباتی نەتەوایەتی و ئینتیما و شوناس داوە، یەک بنمیچ ئەم چوار ڕۆمانە کۆدەکاتەوە، چونکە هەر چواریان کاریان لەسەر دەستبەرنەدان لە خاک و گرنگی ئینتیما داوە لەلای مرۆڤ، بەتایبەتی لەلای مرۆڤی کوردی. کاتیش هەر لەم پێناوەدا وەگەڕخراوە و ئەرکی قوڵکردنەوەی هەستی ئینتیما لەلای کاراکتەرەکان، کێشاوە. ئەمەش وایکردووە بابەتی نامۆ بوون و دوورکەوتنەوە لە کوردستان و لێکەوتەکانی ئەم دوورکەوتنەوە زۆرە ملێیە ببێتە خاڵی جیاکەرەوەی ڕۆمانەکانی، تیایاندا ئاماژە بۆ گۆڕینی ناوی شوێنە کوردییەکان بکات، لە کۆتایی دیمەنێکی ڕۆمانی (البراهين التى نسيها (مم ازاد) فى نزهته المضحكة إلى هناک أو الريش) دەڵێت:"... ئێمە خەڵکی ئەو سێگۆشەیەین کە هەردەم ناوە کوردییەکانی دەگۆڕدرێت، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، بەهۆی دانابیەکەوە نە ئێمە پێویستیمان بە ئەوە و نە

ئەو پێویستی بە ئێمەیە".

بەمەش بە ناڕاستەوخۆ ئاماژە دەکات بۆ بە عەرەبکردنی ناوچە کوردییەکان، ئەم کارە زەوتکارییە و زۆرداریيە بووەتە مایەی بێ بەشکردنی هاوڵاتیانی کورد لە ناسنامە و مافی هاوڵاتی بوون و بێ بەشکردنی منداڵەکانیان لە چوونە زانکۆ، چونکە خاوەن ڕەگەزنامە نین، بەو بیانووەی کەسانی ڕەسەنی ئەم خاکە نین، سەرەڕای ئەوەی کورد لە دێر زەمانەوە، پێش ئەوەی عەرەب لەم ناوچانەدا بێت، لێرە ژیاوە.

خوێنەر دەتوانێت هێڵێکی گشتی یەکانگیر ببینێتەوە، کە هەموو ڕۆمانەکانی نووسەر سەلیم بەرەکات پێکەوە گرێدەدات، ئەو هێڵە گشتیەش بریتییە لە پاراستنی شوناسی کورد، بە زیندوو ڕاگرتنی کەلتوور و زمان و ناو شوێن و مێژووە کوردییەکانە، خوێنەر دەتوانێت لە دوو توێی ئەندێشەسازی ڕۆمانەکانیدا ئاگاداری وردەکاری ژینگەی سروشتیی و ڕۆشنبیریی و کەلتووریی و سیاسی ڕۆژئاوا بێت، وشیارییەکی ورد لە پشت هەڵبژاردنی ناوی کارەکتارەکانییەوە هەیە، بەمەبەست و لەچوارچێوەی ئاگاییەکی گێڕانەوەسازیدا، ناوی کوردی هەڵبژاردووە بۆ کارەکتەرەکانی بەتایبەتی کارەکتەرە سەرەکییەکانی وەک ناوی بێکەس؛ کە وەک ڕەمزێک بۆ بێکەسی و بێ دەرەتانی پرسی کورد بەکاری هێناوە، هەروەها ناوەکانی وەک جاجان بوزو و موسی موزان و خاتون نانو و ئەحمەد کالۆ و ڕەش و بەڵەک و دڵشاد و ستیرۆ و کانی و مەم و ئازاد .. . بۆیە دەتوانین بڵێین ناو و شوێن و مێژوو؛ پانتاییەکی گەورەیان لە ڕووبەری ڕۆمانەکانی سەلیم بەرەکاتدا داگیرکردووە، هەموو هەوڵی خۆی تیایدا بۆ گێڕاندنەوەی شوناسی کوردییە بۆ شوێن و کات و مێژووی ڕۆژئاوا بە هەموو شار و شارۆچکە و گوند و کوچە و کۆڵانەکانییەوە.

ئەم وریاییە فیکرییە، وایکردووە لە ڕۆمانەکانیدا بەوریاکەی هونەرییەوە دەروازە دەقییەکان (العتبات النصية) تەرخان بکات بۆ تیشکخستنە سەر ناوی کارەکتەر و سروشتەکانییان و ناوی شوێنە کوردی و کوردستانییەکان، کە زۆربەی هەرە زۆریان ناوی کوردی پەتین:

(الشخوص المنتخبة للشكال القدرى):

- كردستان بلاد يستطيع (حمدى ازاد تحديدها)
- مم بن حمدى ازاد (الشاب الذى يفتتح الحقيقة)
- حمدى ازاد (بائع قماش)
- الملا سليم البدليسى (صاحب ثوره مغدورة)
- القنصل الروسى وزوجه (مضيفا الملا سليم)
- الشيخ محمد سعيد النقشبندى (قائد انتفاضه الكرد الاولى).

- الرجل الكبير (شخص لا يظهر فى الرواية)
- حسين مقريانى (صاحب أول مطبعة كرديه)
- طائران ذوا قنعزتين (طائرا حقل يكرران ظهورهما)
- قبر غير مكتمل (قبر فى عراو لصق بالشارع)
- أحمد كليم (صياد لم يقتف غزالا قط)
- دينو توأم مم
- أحمد خانى (شاعر كردى قديم. مؤلف مأساه "مم وزين")
- هيڤين (١٨ سنه) " ولّات (١٦ سنه)، عيشانه (١٤ سنه)، رحيمه (١٢ سنه)، روهات (٩ سنوات)، هلين (٥ سنوات)، بنات حمدى ازاد.
- القاضى محمد (رئيس الجمهورية الكردية الاولى)
- مهاباد (بلده أطلق اسمها على أول جمهورية كردية فى العام ١٩٤٦)
- إسماعيل سمكو اغا (رجل ذو أخبار عابسة).

ڕۆمانەکانی (جان دۆست)یش خۆیان لەم ڕێڕەوەدا دەبیننەوە، خوێنەر هۆشیارییەکی قوڵ بەرامبەر شوناسی کوردی ڕۆژئاوا و قوڵکردنەوەی ئینتیما و بەرچاو ڕوونکردنی خوێنەر بە مێژوو نوێی کورد لە ڕۆمانەکانیدا دەبینێت، هەندێک ڕۆمانی تەرخانکردووە بۆ دووبارە دارِشتنەوەی بەسەرهات و ڕووداوی شۆڕشە کوردییەکان و دووبارە بە گۆهێنانەوەی کەسایەتییە کاریگەرەکانی وەک شێخ مەحمودی نەمر و سمکۆی شکاک و قازی محەمەد و عومەرخانی شکاک و مەلا موستەفای بەرزان، فرەتره لەمە، یەکێک لە ڕۆمانەکانی تەرخانکردووە بۆ کۆماری مهاباد، بەناونیشانی: (مهاباد وطن من ضباب – مەهاباد نیشتیمانێک لە تەم). ئەم ڕێچکە ئەدەبییە و هۆشدارییە گێڕانەوەییە لە زۆربەی ڕۆمانەکانیدا دەبینین، بۆیە بەهەمان شێوەی مەهاباد، ڕۆمانێکی تەرخانکردووە بۆ کۆبانێ بەناونیشانی (کوبانی الفاجعة والربع)، لە ڕۆمانەکانی (میرنامە) و (ممر امن ) و (باص أخضر يغادر حلب) و (نواقيس روما) و (ثلاث خطوات إلى المشنقة)، (مارتين السعيد) و (رساله الامير) مێژووی خەباتی کۆن و نوێ و هاوچەرخی کورد تەوەری سەرەکین، تیایاندا کاری لەسەر ڕەوەینەوەی ڕقی شۆڤینیانە لە دژی کورد کردووە.

ڕەسەنیی نەتەوەی کورد و خاوەنداری بۆ ئەو خاک و زەوییەی لەسەری دەژیت، بە هەناسەییەکی هونەری گێڕانەوەکاری سەلماندووە، کۆبانێ و عەفرین، بەوپێیەی یەکەمیان مەترسی گەورەی لە دەستدانی لەسەر بوو، عەفرینیش بەوپێیەی لە دەست درا و داگیرکرا و ناسنامە و دار و بەرد و مێژووەکەی لە ڕیشەوە دەرهێنرا، ئامادەییەکی گەورەییان لە پانتایی ڕۆمانەکانیدا هەیە، بەرجەستەکردنی ماڵوێرانی جەنگ و ماڵوێرانی ڕۆژئاڤا کە بەدەست هێرشی گرووپە توندڕەوە جۆراوجۆرەکانەوە دەناڵێت، لەگەڵ

ئاوڕدانەوەی وردی لە دڕندەیی دوژمنانی کورد و ناحەزییان بەرامبەر بچووکترین مافی کوردان و، هەروەها گرفتی نا تەبایی کورد و دووبەرەکی بەردەوام، کە بوونەتە هۆی بێ ئاکامی شۆڕشەکانی، دیمەنی دیاری ڕۆمانەکانییەتی. بە هەمان شێوەی ڕۆمانەکانی سەلیم بەرەکات کارەکتەرە سەرەکی و کاریگەرەکانی ڕۆمانەکانی (جان دۆست) کوردن و هەڵگری ناوی کوردین، وەکو: (کامو / کامەران) و (فەرهاد) و (لەیلا ئاغازادە) و (ئالان) و (بادین) و (پەریخان) و (یونس ئامێدی) و (هامیست). لێرەدا خاڵێک هەیە پێویستە ئاماژەی بۆ بکەم؛ ئەویش ئەوەیە کە نووسین بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی (جان دۆست) لە (سەلیم بەرەکات) جیادەکاتەوە.

هەردوو ڕۆمانی (عبدالكريم يحيى الزيباري)یش لەناو ئەم پۆلێنەدا جێیان دەبێتەوە، ئەو هەردوو ڕۆمانی (أغنيات طريق إلى حلبجة) و (شاب عار يحمل بندقيتين)ی لە چوارچێوەی پابەندی نەتەوایەتی و هاوخەباتی و هاوخەمی کوردەوە نووسیوە. لە ڕۆمانی (شاب عار يحمل بندقيتين)دا ئاوڕدراوەتەوە لە مێژووی خەباتی نویی کورد لە باشووری کوردستان، لە ڕێگەیەوە وێنای کۆمەڵگەی کوردەواریی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە خێڵەکییەکانی شەستەکانی سەدەی بیست کراوە. هەرچی ڕۆمانی (أغنيات الطريق إلى حلبجه)یە، ئەوا ڕۆمانێکە زیاتر کاری لەسەر مێژووی کۆنی کورد کردووە، ڕووداوەکانی سەد ساڵ پێشتری، دووبارە لەناو تەلاری گێڕانەوەسازییدا گێڕاوەتەوە، ئەو کاتەی دەزگای هەواڵگری کۆلۆنیالیزمی بەریتانی، مقدم (مێجەرسۆن)ی لە بەرگی کەسایەتی (میرزا غلام حسين)دا ڕەوانەی باشووری کوردستان دەکات، بۆئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری خو و دابونەریتی کۆمەڵگەی کوردستان ببێت، بەمەبەستی ڕێخۆشکردن بۆ داگیرکردنی. لەم ڕۆمانەدا نووسەر هەوڵیداوە دووبارە مێژووی نەتەوەی کورد بخوێنێتەوە، لە ڕێگەی گرێدانی مێژووی کۆنی کوردەوە بە ژیانی ئێستای هاوچەرخییەوە، بەمەبەستی دەرخستنی هۆکارەکانی نوشست و نە گەیشتنە ئامانج.

بەشێکی تری ئەم ڕۆمانانە گرنگی بەلایەنێک لە لایەنەکانی کێشەی کورد داوە، وەک پرسی ڕاگواستن و بە عەرەبکردن و ئەنفال، ئەم سێ تەوەرە یاخود پرسە سەرەکییە لە ڕۆمانەکانی ڕۆماننووسانی باشووری کوردستاندا ڕەنگیانداوەتەوە، ترۆپکی ڕەنگدانەوەکەش لە ڕۆمانەکانی نووسەری کۆچکردو و مامۆستای زانکۆی لایبزیک لە وڵاتی ئەڵمانیا (زهدى الداودى) دەبینین کە خاوەنی ئەم نۆ ڕۆمانانەیە: (أطول عام)، (زمن الهروب)، (تحولات)، (وداعا نينوى)، (رجل فى كل مكان)، (فردوس قرية الاشباح)، (ذاكره مدينة منقرضة)، (عويل الذئاب) بەدی دەکرێت.

گرنگیدان بە بابەتەکانی ئینتیما و خاک و شوناس بەشێکی دانەبڕاوی ڕۆمانەکانی زوهدی داودییە، کە باشووری کوردستانی کردووتە ناوەندی جوڵە و تێڕوانینەکانی،

لە ڕێگای گێڕانەوەی نارەحیەتییەکانی ڕاوەدوونان و دەرکردن و زەوتکردنی ماڵ و مەرگەسات و قات و قڕی ئەنفال کە لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا ڕوویدا. نووسەر ئەرکی پاراستنی یادەوەری گشتی و دەستگرتن بە خاک و نیشتیمانەوە، خستە ئەستۆی چالاکییە ئەدەبییەکەی، لە ڕۆمانی (زمن الهروب و فردوس قرية الاشباح)دا ئەم بوارە لە هەموو ڕۆمانەکانی تر زیاتر بە زەقی کاری لەسەر کراوە. تیایدا هەوڵدراوە ئەو شوێنانەی دووچارەی تەعریب و ڕاگواستن بوونەتەوە وەک (کەرکوک) و (ئاوە سپی) و (ڕووباری ڕوخانە) و (شاخی بادرە) و (شاخی بەرۆخ) و (هۆرین)، بە زیندوویی لە ڕۆمانەکەدا ڕابگرێت، لەگەڵ ناوی کوردی کارەکتەرە کاراکانیدا وەک: ڕۆستەم و زۆراب و حەمەغریب و میرزا و وسو و نەریمان ئاغا و نالە گورگە و نەسرین و شیرین و کامە (کامەران) و گوڵەباغ.

> **ئەوانــەی پێیانــوایە تــەنیا زمــان بنەمای هەڵسەنگاندن و پۆلێنکردنە، بە ئاگایی بێت یاخود لە بێ ئاگایی؛ تێڕوانینەکەیان هەڵقوڵاوی قوتابخانەی فەڕەنسییە بۆ ئەدەبی بەراوردکاری**

ڕۆمانی (فردوس قرية الاشباح)ی تەرخانکردووە بۆ وێناکردنی مەرگەساتی ئەنفال و مەرگەستاتی نەتەوەی کورد لەسەدەی بیستەمدا، ڕەهەندی لۆکاڵی کە خۆی لە گێڕانەوەی سەربوردەی گوندەکاندا دەبینێتەوە لە سەردەمی ئەنفالدا، بنەمای ئەزموونی ئەدەبی زهدی داودی پێکدەهێنن. ئەمەش وایکردووە شوێن و پێکهاتە وردەکانی شوێن ڕۆڵی کارایان هەبێت لە ڕۆمانەکانیدا و ئەرکی پاراستنی شوناسی کوردی پێبسپێریت و لە ڕێیەوە لە ڕووی هەڵمەتەکانی ڕاگواستن و بە عەرەبەکردندا ڕابوەستێت و بەگژ توانای ڕاگەیاندنی زەبەلاحی ڕژێمدا بچێتەوە.

(تەحسین گەرمیانی) یەکێکی ترە لەو ڕۆماننووسانەی دەتوانین بەرهەماکانی لە خانەی ئەم پۆلێنکردنەدا دابنێن، سەرەڕای ئەوەی هیچ ڕۆمانێکی تەرخان نەکردووە بۆ پرسی کورد و کێشەی کورد، جگەلە ڕۆمانی (الحزن الوسيم) کە لەچوارچێوە و ڕوانگەی کوڕ و کچێکی بەرهەمی دوو خێزانی ئەنفالکراوەوە، لەلایەک ژیان دۆستی و لەلایەکی تر لێکەوتە ماڵوێران کەرەکانی ئەنفال و سەرنگونکردنی تاکی کورد، باس دەکات. ئەم

نووسەرە خاوەنی ئەم حەوت ڕۆمانەیە: (الحزن الوسیم / ٢٠١٠) (بعل الغجریة / ٢٠١٠)، (أولاد الیهودیة / ٢٠١١)، (قفل قلبی / ٢٠١١)، (حکایتی مع رأس مقطوع / ٢٠١٢)، (زقنموت / ٢٠١٣)، (لیالی المنسیة / ٢٠١٤). هەروەها ئەم کۆمەڵە چیرۆکە بڵاوکراوەشی هەیە: (هواجس بلا مرافیء ثغرها علی المندیل، بینما نحن.. بینما هم. بقایا غبار) لەگەڵ چەند شانۆ نامەیەکدا بە ناونیشانی: (خوذه العریف غضبان، خمس مسرحیات، ومن أجل صوره زفاف، مسرحیتان, والحث عنهم، مسرحیة).

یەکێکی تر لەو ڕۆماننووسانەی دەتوانین ڕۆمانەکانی لەم خانەدا دابنێین، (هۆشەنگ ئەوسی)یە، کە خەڵکی ڕۆژئاڤایە و ئێستا لە بەلجیکا دەژی، هۆشەنگ خاوەنی ئەم سێ ڕۆمانەیە: (وطأه الیقین) و (حفلة أوهام مفتوحة) و (سجن المهاجرین غیر الشرعیین بجزیرة خیوس الیونانیة)، لەهەمانکاتیشدا شیعر بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەنوسێت و چەند کۆمەڵە شیعرێکی بە چاپ گەیاندووە.

پرسی شوناس، تەوەری سەرەکی بەرهەمە ئەدەبییەکانی هۆشەنگە، تێڕوانینیشی بۆ شوناس گشتگیرە، ئەو باوەڕی بە شوناسی تاکلایەنانە نییە، بەڵکو کاری لەسەر شوناسی پێکهاتەیی کراوە بە ڕووی شوناسەکانی تردا کردووە، لە ڕۆمانەکانیدا فرە شوێنی و فرە شوناسی هەیە، شوناسی کوردی خۆی لەناو شوناسی عەرەبی و میسری و عێراقی و تونسی و جەزائیری و بەلجیکی و ئەڵمانی و یەهودی و فەڵەستینیدا دەبینێتەوە، حەزی لە داخران و خۆ کرکردن نییە لەسەر شوناسی لۆکاڵی نیشتیمانی، لەڕووی شوناسی شارگەرایی و گەڕەک و کۆڵانچێتیدا ڕادەوستێتەوە. ئەو پێیوایە زیندووکردنەوە و تیژکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی کوردی ئەرکی ئەو نییە، چونکە پێشتر شاعیرانی کورد لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەوە تا دەگەینە هەشتا و نەوەدەکانی هەمان سەدە، بەم کارە هەستاون، لە گەرمەی ململانێی گوتارە ئاینی و نەتەوەیی و ناوچەگەرییە یەکتر قبوڵ نەکەرەکاندا. ئەو پێیوایە گەر مرۆڤ توانی پارێزگاری لە مرۆڤبوونی خۆی بکات، بە ئەندازەیەک کە بواری بەردەوامی ژیانی پێبدات، ئەوا ئەمە بۆ خۆی دەستکەوتێکی گەورەیە، بۆیە بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت مرۆڤبوون بکاتە شوناسی مەزنی خۆی، پێش هەر پۆلێنکارییەکی تر.

ڕۆمانەکانی ڕۆمان نووسی ڕۆئاڤا (حلیم یوسف) لەناو هەمان تێڕوانیندا جێیان دەبێتەوە، ئەم ڕۆماننووسە بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی دەنوسێت، لە هەمووشیاندا هەوڵیداوە شوناسی کوردی و هۆکارەکانی سەرکوتکاری لە وڵاتی سوریا ڕوون بکاتەوە، بەتایبەتی لە ڕۆمانی (الوحش الذی في داخلی).

بەشێکی تری ئەم ڕۆمانانە بە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ توخنی پرسی کورد و کێشەی کورد نەکەوتووە، بەڵکو ڕۆماننووسەکەیش لەلای خوێنەران بەوە ناسێنراوە کە عەرەبە،

وەک ڕۆمانەکانی نووسەری کۆچکردوو (سعد محمد رحیم) کە لە دانیشتنێکدا پێی وتم کوردە و باجەڵانە، بەڵام لەبەرئەوەی لە بەغدا گەورە بووە و ژیاوە، کوردی نازانێت، هەر شەش ڕۆمانەکەی (غسق الکراکی) و (ترنیمة امرأه .. شفق البحر) و (مقتل بائع الکتب) و (ظلال جسد ضفاف الرغبة) و (فسحة للجنون) و (لما تحطمت الجرة)دا ژیان و گوزەران و ڕەوشی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووری عێراقی تاوتوێکردووە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە هەتا پاش ٢٠٠٣ و سەرهەڵدانی شەڕی تائیفی و تەقینەوەکان، بۆیە جەنگی عێراق و ئێران پانتاییەکی باشیان لە ڕۆمانەکانیدا داگیر کردووە. لەگەڵ ئەمەشدا کورد بوونی نووسەر و هەست و سۆزە خۆڕسکە نەتەوەییەکەی بە هێواشی دزەیان کردووەتەوە ناو گوتارە ئەدەبییەکەیەوە، چونکە هەندێک لە کارەکتەرەکانی کوردن، هەر هەمووشیان ڕۆڵی زۆر مرۆڤدۆستانە دەبینن لە ڕۆمانەکاندا، وەک (کاکە عەباس) و (هێمن قەرەداغی) کە لە ڕۆمانی (مقتل بائع الکتب)دا ڕۆڵێکی سەرەکی زۆر پۆزەتیڤ دەبینن، هەروەها لە ڕۆمانی (فسحه للجنون)دا کورد و خێزانە کوردەکان وەک وەفادار و دڵدەدەری لێقەوماو و بێ دەرەتان و نان بدە وێناکراوە.

### گرفتی پۆلێنکردن:

ئایا زمان بنەمای پۆلێنکردنە؟ گەر ئەدەبێک بە زمانێکی دیاریکراو نووسرا، ئیتر ئەو ئەدەبە سەر بەو زمانە دادەنرێت، با هەڵگری بۆنە و بەرامە و تایبەتمەندی ڕۆشنبیرییەکی تریش بێت؟! ئەوانەی پێیانوایە تەنیا زمان بنەمای هەڵسەنگاندن و پۆلێنکردنە، بە ئاگایی بێت یاخود لە بێ ئاگایی؛ تێڕوانینەکەیان هەڵقوڵاوی قوتابخانەی فەڕەنسییە بۆ ئەدەبی بەراوردکاری، ئەم قوتابخانەیە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستدا دەرکەوت و گەشەی سەند، پشتی بە بیر و هزری کۆلۆنیالیزمانەی فەڕەنسا بەستبوو، باوەڕی بە زمانێکی باڵاتر و ئەدەبێکی باڵاتر هەبوو، کە ئەدەبی کۆلۆنیالیزمی و زمانی کۆلۆنیالیزمییە، ئەدەب و زمانی گەل و نەتەوەکانی تری بندەستی بە ئەدەب و زمانی پەراوێز دادەنا، جیاوازی زمانیشی کردبووە مەرجی سەرەکی هەر کردارێکی بەراوردکاری لە نێوان ئەدەبی گەلاندا، دەبوایە کرداری بەراوردکاری لە نێوان دوو ئەدەبی سەر بە دوو زمانی جیاواز بکرابایە، وەک ئەدەبی فەڕەنسی و ئەدەبی فارسی، یاخود لە نێوان بەرهەمی شاعیرێکی فەڕەنسی و شاعیرێکی عەرەبی، بە پێش مەرجی بەیەکگەیشتنی هەردوو ئەدەبەکە و کاریگەربوونی ئەدەبی دووەم بە ئەدەبی یەکەمەوە، واتە ئەدەبی پەراوێزی کاریگەر بوو بە ئەدەبی باڵاوە یاخود ناوەندەوە. لە ڕوانگەی ئەم قوتابخانەوە زمان بنەمای پۆلێنکردنە، هەر ئەدەبێک بە چ زمانێک نووسرابێت، بە ئەدەبی ئەو زمانە هەژمار دەکرێت.

لەگەڵ دەرکەوتنی قوتابخانەی ئەمریکی لە بواری ئەدەبی بەراوردکاریدا، گۆڕانکاری بەسەر هەموو بنەماکانی قوتابخانەی فەڕەنسیدا هات، پێش مەرجی جیاوازی زمان و بەریەککەوتن و کاریگەربوون و بوونی ئەدەبی باڵا و ئەدەبی پەراوێز هەڵوەشێنرایەوە، بازنەی کاری ئەدەبی بەراوردکاریش فراوان کرا، ڕێگە درا بەراود بکرێت لە نێوان دوو ئەدەبدا با بەیەک زمانیش نووسرابن، چونکە ئەو دوو ئەدەبە خاوەن تایبەتمەندی و دونیابینی و سروشتی خۆیانن، خودی زمانەکەش لە دوو ئەدەبەکەدا جیاوازی تێدایە، بۆیە ئەنجامدانی بەراورد لە نێوان ئەدەبی ئەمریکی بە زمانی ئینگلیزی نووسراو و ئەدەبی ئینگلیزی بەریتانی، لەلای قوتابخانەی ئەمریکی ڕێگە پێدراوە، بەهەمان شێوە بۆ ئەدەبی ئوسترالی کە بەزمانی ئینگلیزی نووسراوە، لەگەڵ ئەدەبی کەنەدی بە زمانی ئینگلیزی پێشکەشکراوە، ئەم تێڕوانینە بۆ ئەدەبی کوردیش دەست دەدات، کە دەتوانین بەراورد ئەمجامبدەین لە نێوان ئەدەبی نووسراو بە کرمانجی سەروو و ئەدەبی نووسراو بە کرمانجی خواروو. لەمەش زیاتر بوار درا بەراورد بکرێت لە نێوان ئەدەب و بوارە مەعریفییە جیاوازەکاندا، وەک بەراوردکاری لە نێوان ئەدەب و شانۆگەریدا، یاخود ئەدەب و فەلسەفەدا.. هتد.

لەم سۆنگەیەوە؛ گۆڕانکاریش بەسەر کرداری پۆلێنکردندا هات، مەرجی زمان بەهەند وەرنەگیرا، لە ڕوانگەی ئەم قوتابخانەیەوە، گەر نووسەرێکی کورد بەرهەمی بە عەرەبی نووسی، بەرهەمەکەی لەهەمانکاتدا سەر بە ئەدەبی کوردی و ئەدبی عەرەبیشە؛ سەر بە ئەدەبی کوردییە لەبەرئەوەی خاوەنەکەی کوردە و بە ڕەنگ و بۆ و گیانی کورد بوون نووسیویەتی، بە ئەدەبی عەرەبیش دادەنرێت، چونکە بە زمانی عەرەبی نووسراوە. ئیتر لێرە بە دواوە هەناسەسوارییی و کورت بینی و ڕوانگەی تەسک پشتگوێخرا و لە ڕوانگەیەکی فراوانی مرۆڤانەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ کایەی ئەدەبدا کرا، سەرچاوەی ئەم ڕوانگە فراوانەی قوتابخانەی ئەمریکی بۆ فرەیی و جیاوازی کۆمەڵگەی ئەمریکی دەگەڕێتەوە، کە وڵاتەکە لە بنەڕەتدا وڵاتی کۆچکەران و ڕەگەزە مرۆییە جیاوازەکانە.

بە دەرکەوتنی (ڕەخنەی پۆست کۆلۆنیالیزم Postcolonial Criticism)یش لەسەر دەستی (ئیدوارد سعید)ی ڕەخنەگر و ڕووناکبیری فەڵەستینی – ئەمریکی، پایەکانی ئەم تێڕوانینە فراوانە دامەزراوتر بوو. Robert J. C. Young خاوەنی کتێبی (پۆست کۆلۆنیالیزم: پێشەکییەکی زۆر کورت Post colonialism: A Very Short Introduction) دەڵێت: سەرەڕای هەڵوەشانەوە و نەمانی کۆلۆنیالیزم و داگیرکاری سەربازی ڕاستەوخۆ، بە درێژایی سەدەی بیستەم، بەڵام وڵاتانی زلهێز لە بنەڕەتەوە پارێزگاریان کردووە لە هەژموونی خۆیان بەسەر گەلاندا و دەستبەرداری ویستە

ئیمپریالیزمەکانیان نەبوون. چونکە تاڕادەیەکی زۆر هەمان ئەو وڵاتە ئیمپریالیستی و داگیرکەرانە بەردەوام باڵادەستی و هەژموونیان بەسەر هەمان ئەو وڵاتانەدا هێشتوەتەوە کە پێشتر داگیریان کردوون و بەناوی ئینتیدابەوە حوکیمان کردوون. نموونەی وڵاتانی وەک ئەفغانستان و عێراق و ئێران و کوبا و جەزائیر و لیبیا ئاماژەی ڕوونن کە هەر کاتێک هەرکام لەم وڵاتانە بیریان لەوەکردبێتەوە دژی داگیرکەرانی پێشوویان بوەستنەوە باجیان داوە و تووشی مەترسی بوونەتەوە. هەرکاتێکیش حکومەتی هەریەک لەو وڵاتانە لە ڕووی کەڵەگایی وڵاتانی ڕۆژئاوادا ڕاوەستابن، ڕووبەڕووی دەستوەردان و پەلاماری سەربازی بوونەتەوە لەلایەن ڕۆژئاواوە.

لەناو گێژاوی نا دادیی و نا یەکسانی جیهانی هاوچەرخماندا، ڕەخنەی پۆست کۆلۆنیالیزم بانگەشەی یەکسانیی مافیماددی و کەلتووری دەکات بۆ هەموو میللەتانی سەر زەوی. هۆکاری سەرەکی ئەم نادادی و ملهوڕییە بۆ دابەشبوونی جیهان بەسەر ڕۆژئاوا و غەیرە ڕۆژئاوادا دەگەڕێتەوە. ئەم دابەشبوونە و جیاکردنەوەی ڕۆژئاوا لە تەواوی پارچەکانی تری جیهان، بەڕەهایی لە سەدەی نۆزدەدا دروستبوو، واتە لە سەردەمی فراوانبوونی سنوورەکانی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوایی، لە پێش هەموویانەوە، ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەڕەنسی. لە ئەنجامی ئەم دابەشبوونەش نۆ لەسەر دەی هەموو زەوی جیهان لە لایەن ئەوروپییەکانەوە یان لەلایەن ئەو هێزانەی کە ئەوروپا پشتگیری دەکردن، داگیرکرا.

گەورەترین ئامرازی ڕەخنەی پۆست کۆلۆنیالیزم هەمان ئامراز و کەرەستەیە کە کۆلۆنیالیزم پشتی پێبەست، بۆ هەڵوەشاندنەوە و ڕووخاندنی پایەکانی، تیۆرییەکانی ڕەخنەی پۆست کۆلۆنیالیزم دوالیزمەی ناوەند و پەراوێز، ئاغا و بندەست، زمانی باڵا و زمانی مردوو لەبەریەک هەڵدەتەکێنی و ماف بە هەموو ئەوانە دەدات کە کۆلۆنیالیزمی جیهانی ئەوسا و لۆکاڵی ئێستا پێی دەوتن و پێیان دەڵێت: بندەست و شوێنکەوتە و پەراوێز و نەبوو، زمانی خۆیان بەکاربهێنن و قسە بکەن و خاوەن گوتار بن.





گۆران سەباح

# ڕەخنەی ئەدەبیی کوردی:

## هەوڵێک بۆ جێبەجێکردنی تیۆرە ڕەخنەییەکان لە ڕۆمانی کوردیدا


### بەرکوڵ

ڕەخنەی ئەدەبیی کوردی بەپێی پێویست نییە. لاوازە. بەم پێیە ڕەخنەگری پرۆفیشناڵ و زانستیمان کەمە. یەکێک لە هۆکارەکان پەیوەستە بە باکگراوندی مەعریفیی ڕەخنەگر. تا چەند ڕەخنەگران ئاشنان بە تیۆرەیلی ڕەخنەی ئەدەبی؟ ئایا خوێندنەوەی ڕۆمانێک دەکەن بەپێی یەکێک لە تیۆرە ڕەخنەییەکان؟ بۆ پێشخستنی ڕەخنەی ئەدەبی، دەستم کردووە بە پرۆژەیەکی ڕەخنەیی: تیۆرەیلی ڕەخنەی ئەدەبی جێبەجێ دەکەم لەسەر ڕۆمانێک. بۆ ئەم مەبەستە ڕۆمانی مرۆڤی هەرزانم هەڵبژاردووە. تا ئێستە تیۆری ڕەخنەییی دەروونشیکاریی و مارکسیم لەسەر جێبەجێ کردووە. بونیادگەرەکان پێیانوایە ئێمە ئەو جیهانە دروست دەکەین کە دەیبینین و پاشان ئاگایی و تێگەیینمانی بۆ زیاد دەکەین. میتۆدی جۆراوجۆر هەن بۆ ڕاڤەی دەقێکی ئەدەبی بە هاوێنەی تیۆری ڕەخنەییی بونیادگەری. لەم باسەدا هەوڵ دەدەین باسیان بکەین و دواتریش جێبەجێیان بکەین لە ڕۆمانی مرۆڤی هەرزان.

## تیۆری ڕەخنەیی بونیادگەری چییە؟

زاراوەی بونیادگەری (structuralism) لە سەرەتای سەدەی بیست لە ئەورووپا پەیدا بوو. زماناسی سویسری، (فێردیناند سۆسێر)، بۆ یەکەم جار لە زانستی زمانەوانی بەکاری هێنا. دوای جەنگی یەکەمی جیهانی، پسپۆڕانی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکان پەرەیان بە چەمکەکەی سۆسێردا. لە هەموویان پتر، مرۆڤناسی فەڕەنسی (کلاود لیڤی ستراوس) خۆی پێوە خەریک کرد (مامبرۆل، ٢٠١٦). پاشان لە بوارەیلی وەک دەروونناسی، ئابووری، تەلارسازی، مرۆڤناسی و ڕەخنەی ئەدەبی هاتە بەکاربردن.

لە ئەدەبدا، ڕەخنەی بونیادگەری، دەق دەخاتە نێو بازنەیەکی فراوانتر، شەن و کەوی دەکات بەهۆی پێوەندیی لەگەڵ دەقەیلی تر، بەپێی پێکهاتەی یونیڤێر سالی گێڕانەوە (بار، ٢٠٠٢). تیۆرە ڕەخنەییەکە باسی مانای دەق ناکات، بگرە باسی چۆنێتی مانای دەق دەکات (تایسۆن، ٢٠١٥). بۆ نموونە، ڕۆمانی مرۆڤی هەرزان باسی خۆکوشتن و بەرەڵابوونی نەفس دەکات، تیۆری بونیادگەری دێ بزانێت چۆن و بە چ شێوەیەک باسی ئەو بابەتە دەکات. بۆیە ئەم تیۆرە نێزیکە لە تیۆری ڕەخنەیی (وەڵامی خوێنەر) (تایسۆن، ٢٠١٥).

تیۆرەکە هەوڵێکە بۆ تێگەیین لە بونیادی ئەزموون، بەرهەم، ڕەفتار و ئاگایی مرۆڤ لەنێو دەقێکی ئەدەبی (تایسۆن، ٢٠١٥). لە هێماناسیدا (semiotics)، هەموو دەقێک دەبێ پێکهاتەیەکی هەبێت، ئەمەش یارمەتی خوێنەری بە ئەزموون دەدات باشتر دەقەکە شی بکاتەوە (نۆس، ١٩٩٥). بەپێی تیۆرە ڕەخنەییەکە تامی دەقێکی ئەدەبی لە پێکهاتە نوێیەکەیدایە.

## نۆرسرۆپ فرای و تیۆری ژانرەکان

نۆرسرۆپ فرای، تیۆریست و ڕەخنەگەری ئەدەبیی، پێیوایە مرۆڤ بە دوو ڕێگە خەیاڵی خۆی دەگێڕێتەوە: جیهانی واقیعی و جیهانی میسالی (تایسۆن، ٢٠١٥). جیهانە میسالییەکە (باشترە لە جیهانە واقیعییەکە) جیهانی بەرائەت و خۆشی و ڕازیبوونە. جیهانە واقیعییەکە جیهانی ئەزموون و دڵەڕاوکە و شکستە.

تیۆری ژانرەکان (یان تیۆری ئەفسانەکان)ی فرای بنەما سەرەکییەکانی ئەم ژانرانە ئاشکرا دەکەن: کۆمیدی، تراژیدیا، ڕۆمانس و ئایرۆنی/ ساتیر (تایسۆن، ٢٠١٥). فرای پێیوایە هەر ژانرێک ڕووداو، تێما، کارەکتەر و پلۆتی تایبەت بەخۆی هەس. ئەم ژانرانە پێکەوە وامان لێ دەکەن لە گێڕانەوە بگەین. فرای پێیوایە چوار بنەمای بونیادگەری هەن: ململانێ، کارەسات، ئاژاوە و شێوان و سەرکەوتن. ململانێ بناخەی ڕۆمانسە؛ کارەسات هیی تراژیدیایە؛ ئاژاوە و شێوان هیی ئایرۆنی و ساتیرە؛ سەرکەوتن هیی کۆمیدیایە. فرای ناو لەمانە دەنێت: «ئەفسانەی گشتگیر». کەواتە لای فرای، هەموو گێڕانەوەیەک ڕەگێکی لە نێو گێڕانەوەیەکی تردا هەیە.

فرای دەسەڵاتی پڕۆتاگۆنیست و مۆدی فیکشن و جۆری کارەکتەر بەپێی تیۆری مۆدەکان (theory of modes) دیاری دەکات. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە، خشتەکەی تایسۆن (٢٠١٥) بەکار دەبەم:

| دەسەڵاتی پڕۆتاگۆنیست | مۆدی فیکشن | جۆری کارەکتەر |
|---|---|---|
| لە سەرووی مرۆڤ و دەوروبەر | ئەفسانە | ئیلاهی |
| تارادەیەک لە سەرووی مرۆڤ و دەوروبەر | ڕۆمانس | پاڵەوان |
| تارادەیەک لە سەرووی مرۆڤ | لاسایی (داستان و تراژیدی) | سەرکردە |
| لەسەرووی مرۆڤ و دەوروبەر نییە | لاسایی (کۆمیدی و واقیعی) | خەڵکی ئاسایی |
| لە خوار هەموو شتێک | ئایرۆنی | ئەنتاگۆنیست (دژە پاڵەوان) |

ڕۆبەرت شۆلز پۆلێنێکی کەمێک جیاوازتر دەکات لەوەی فرای (تایسۆن، ٢٠١٥):

| دەسەڵاتی پڕۆتاگۆنیست | مۆدی فیکشن | جۆری کارەکتەر |
|---|---|---|
| لەسەرووی مرۆڤ و دەوروبەر | ڕۆمانس | پاڵەوان |
| یەکسان بە مرۆڤ و دەوروبەر | لاسایی وەک ژیانی واقیعی | خەڵکی ئاسایی |
| تارادەیەک لە سەرووی مرۆڤ | لاسایی (داستان و تراژیدی) | سەرکردە |
| لە خوار مرۆڤ و دەوروبەر | لاسایی (کۆمیدی و واقیعی) | کۆمیدی و خەڵکی بەدحاڵ |
| لە خوار هەموو شتێک | ئایرۆنی | ئەنتاگۆنیست (دژە پاڵەوان) |

## بونیادی گێڕانەوە

ڕاڤەی بونیادی گێڕانەوە دەنۆڕێتە ناواخنی دەقی ئەدەبی بۆ کەشفکردنی یەکەکانی بونیادی دەق، وەک پێشڤەچوونی گێڕانەوە، ئەرکەیلی کارەکتەر (تایسۆن، ٢٠١٥). بۆ تێگەیین لە بونیادگەریی گێڕانەوە، کاری ئەی جەی گریماس، تزڤیتان تۆدۆرۆڤ و گێرارد گینێت دەدەینە بەرباس. گریماس پێیوایە مرۆڤ بە دوو شێوە دەگاتە مانا. یەک، سپی پێچەوانەی شینە؛ دوو، نەفی سپی واتە نەفی شین. بۆ نموونە، پێچەوانەی خۆشەویستی ڕکە، نەفی خۆشەویستی غیابی خۆشەویستییە (تایسۆن، ٢٠١٥). ئەمە لە پلۆتدا هەیە: ململانێ و چارە، شەڕ و ئاشتبوونەوە، جیابوونەوە و پێکشادبوونەوە. ئەم هاوکێشانەی پلۆت دێنە جێبەجێکرن لەلایەن کارەکتەرانەوە. گریماس سێ پۆلێنی پلۆت دیاری دەکات بەهۆی جۆرەکانی ئەرکی کارەکتەر و جۆرەکانی پلۆت

| ئەرکەیلی کارەکتەر | جۆرەکانی پلۆت |
|---|---|
| سوژە- ئۆبجێکت | چیرۆکەیلی گەڕان/ ئارەزوو (سوژەیەک یان پاڵەوانێک بەدوای ئۆبجێکتێکدا دەگەڕێت، ڕەنگە کەسێک، شتێک، خود، یان شوێنێک بێت. |
| نێرەر- وەرگر | چیرۆکەیلی کۆمیونیکەیشن (یەکێک شتێک دەنێرێت و ئەوی تر وەری دەگرێت). |
| هاوکار- دژ | وردە پلۆتی چیرۆکەیلی گەڕان/ ئارەزوو (ئەوەی بە دوای ئۆبجێکتێکدا دەگەڕێت هاوکارێکی هەیە و دژێکیشی هەیە بەرەنگاری دەبێتەوە. |

گریماس سێ جۆرە بونیاد دەناسێنێت:

١. بونیادی گرێبەست (contractual structures): مۆرکردن یان شکاندنی پەیمان، دامەزراندن یان تێکدانی کیانێک.

٢. بونیادی جێبەجێکاری (Performative structures): ئەنجامدانی ئەرک، هەوڵ و کۆشش.

٣. بونیادی لێکترازان (Disjunctive structures).

گریماس سیستمێکی داناوە بۆ ڕاڤەی بونیاد:

| ئەزموونی هەنووکەیی | قابیلی گۆڕان | ئیختیاری ئایدیۆلۆژی |
|---|---|---|
| خۆشی / ئازار | ڕاستی: یاخیبوون +قەبوڵکردن | ژیان: خۆشی + ناخۆشی |
| بێزاری / بێز | درۆ: کۆڵدان + ئینکاری | مردن: بێزاری + بێز |

بەڵام تۆدۆرۆڤ ئەم سیستمەی هەیە بۆ یەکەکانی بونیادی گێڕانەوە:

| یەکەکانی گێڕانەوە | یەکەکانی زمان |
|---|---|
| کارەکتەر | ناوی دیار |
| کاری کارەکتەر | فرمان |
| سیفەتی کارەکتەر | ئاوەڵناو |
| تێکەڵەی کارەکتەر و کردار | ڕستە |
| لە تێکەڵەیەک زیاتر | پەرەگراف |

بونیادی (لە تێکەڵەیەک زیاتر) بریتییە لە سیفەت، کردار، سیفەت. بۆ نموونە، کارەکتەرێک ئێسک گرانە، دوای کردارێکی باش، ئێسک سووک دەبێت. تۆدۆرۆڤ بونیادی دەق لە کارەکتەر و کرداردا دەبینێتەوە. بەڵام گینێت سێ ئاست دیاری دەکات بۆ گێڕانەوە: چیرۆک، دەق، گێڕانەوە.

چیرۆک: پێکدێت لە کۆمەڵە ڕووداوێکی گێڕدراوە. دەق واتە وشەکانی نێو کتێبەکە، ئەو وشانەی ڕووداوەکانی پێ دێنە گێڕانەوە، ئاخاوتن و بەرباس. گێڕانەوە واتە گێڕانەوەی چیرۆکەکە بۆ جەماوەر، بۆ کەسێک یان کۆمەڵێک کەس. ئەوەی دەگێڕێتەوە بەرکەوتەی لەگەڵ نووسەرەکەدا نییە، جەماوەر (ئەوەی چیرۆکی بۆ دێتە گێڕانەوە) بەرکەوتەی لەگەڵ خوێنەردا نییە.

گینێس پێیوایە بەپێی سێ شت چیرۆک و دەق و گێڕانەوە تێکەڵ بەیەک دەبن (تایسۆن، ٢٠١٥):

١. دەم (کات): ڕێکخستنی ڕووداوەکان بەپێی کات. ئەم ڕێکخستنە پێویستی بە ڕیزکردن و ماوە و چەندجارەبوونەوە هەیە:

- ڕیزکردن: بریتییە لە پێوەندیی نێوان کرۆنۆلۆژیی ڕووداوەکان و کرۆنۆلۆژیی گێڕانەوەی ڕووداوەکان. واتە، لە ڕۆمانی مرۆڤی هەرزان: شووشە سەقەتە، دێبابی لە دەست دەدات، براکەی لە دەست دەدات، هاوەڵانی لەدەست دەدات، مەیلی بۆ ڕام هەیە، دواتر چاک دەبێتەوە. ئەمانە ڕووداون، بەڵام نووسەر لێکی جیا کردوونەتەوە و پەرتی کردوون بەسەر گێڕانەوەکەدا.

- ماوە: بریتییە لە پێوەندیی نێوان درێژیی ڕووداوێک و ئەو چەند لاپەڕەیەی بۆی تەرخان دەکرێت لە کتێبەکە. ململانەی نێوان دوو کارەکتەر پێنج ساڵە، بەس بە پێنج دێر باس دەکرێت. یان دیمەنێکی کوژران پێنج دەقەیە، بەڵام بە پێنج لاپەڕ باس دەکرێت.

- چەندجارەبوونەوە: بریتییە لە پێوەندیی نێوان دووبارەبوونەوەی ڕووداوێک لەگەڵ ڕووداوێک بە چەند جارێکی جیاواز دێتە گێڕانەوە.

٢. چەشە (میزاج): بریتییە لە کەشی گێڕانەوە کە دێتە دروستکردن بەهۆی دووری و ڕوانگەوە.

- دووری واتە ئەو دەمەی گێڕەرەوە لەنێو یەک لە کارەکتەرەکاندایە. چیرۆکەکە لە ڕێی ویژدانی ئەو پاکتاو دەکرێت. گێڕەرەوە هەرچەند نێزیک بێت دووری نێوان گێڕانەوە و چیرۆک زێتر دەبێت. بەپێچەوانەشەوە، بێو ئاگامان لە گێڕەرەوە نەبێت، ئەوا گێڕانەوە و چیرۆک لێک نێزک دەبنەوە. ئەو دەمەی چیرۆکەکە خۆی خۆی دەگێڕێتەوە. دووری بە بازدان و نەبوونی وردەکاریش دروست دەبێت. چەندە وردەکاری هەبێت ئەوەندە چیرۆک و گێڕانەوە لێک نێزیک دەبنەوە.

- ڕوانگە واتە گۆشەنیگا: لەوانەیە گێڕەرەوە قسە بکات، بەڵام شتەکان دەبینین بە چاوی کارەکتەرێک. ئەوەی کارەکتەرەکە دەیبینێت جیاوازە لەوەی گێڕەرەوە دەیبینێت.

٣. دەنگ: بریتییە لە دەنگی گێڕەرەوە: ئەو دەنگەی گوێمان لێی دەبێت (دەنگی گێڕەرەوە) ڕەنگە جیاواز بێت لەو چاوەی شتەکانی پێ دەبینین (ڕوانگە). بۆ ڕاڤەی دەنگ دەبێ بنۆڕینە پێوەندیی نێوان گێڕەرەوە (کرداری گێڕانەوە) بەو چیرۆکەی دێتە گێڕانەوە (شێواز گێڕانەوەکە). دەنگ یارمەتیمان دەدات چەشەی گێڕەرەوە بۆ چیرۆکەکە دیاری بکەین.

## بونیادی ڕاڤەی ئەدەبی

(جۆناسان کەلەر) پێیوایە بونیادی نووسین و مانای دەقی ئەدەبی پێوەستن بە سیستمی ڕێسا و کۆد کە خوێنەر، ئاگا یان بێ ئاگا، لە ناخیدا دروستیکردوون (تایسۆن، ٢٠١٥). هەندێ لەو ڕێسا و کۆدانە خوێنەر دەمێکە لە بیریدا چەسپی کردوون. بۆ نموونە، خوێنەر دەزانێت دەقێکی ئەفسانەیی واقیعی نییە. کۆدەیلی تر لە زانکۆ دێنە خوێندن، بۆ نموونە، بەکاربردنی ئیماژی سروشتی بەشێک لە تێمای کارەکە ئاشکرا دەکات (تایسۆن، ٢٠١٥). ئەم ڕێسا و کۆدانە جۆرێک لە خوێندەواری و ئاگایی دروست دەکات لای

تاک کە کەلەر پێی دەڵێت ئاستی خوێندەواریی تاک بۆ ئەدەب. بۆ تێگەیین لە ئاستی خوێندەواریی ئەدەبی (literary competency)، کەلەر سێ توخمی سەرەکی دەداتە بەرباس (تایسۆن، ٢٠١٥):

یەکەم: ئاوێتەبوونی دووری و ناخود (the convention of distance and impersonality)

هەرکە کارێکی ئەدەبی دەخوێنینەوە خۆمان لە واقیع و خودی خۆمان دوور دەخەینەوە. دوورییەکی خەیاڵی دروست دەبێت. خوێندنەوەی دەقێکی ئەدەبی لای خوێنەر جیاوازە لە خوێندنەوەی نامەیەک یان وتارێک.

دووەم: بەسروشتیکردن (naturalization)

خوێنەر دەقەکە دەگۆڕێت و بە پێوەری ژیانی واقیعی تێی دەگات. کاتێ نووسەر دەنووسێت، «خۆشەویستەکەم هەرمێیەکی پێگەیشتووە»، خوێنەر دەزانێت مەسەلە میوەکە نییە، بگرە نووسەر وەک خوازەیەک میوەکەی بەکار بردووە. کاتێ خوێنەر لە دەقێکی ئەدەبی تێ دەگات، زیاتر دەینرخێنێت و خۆشی دەوێت؛ جوانییەکەی مانایەکی بۆ ئەو هەیە. لەم کۆدە خوێنەر گوێی لە دەنگی گێڕەرەوەیە نەک نووسەر، بۆیە هەر کەموکەرتییەک دەگەڕێتەوە بۆ گێڕەرەوەکە نەک نووسەرەکە.

سێیەم: ڕێسای بایەخدان (the rule of significance)

خوێنەر پێیوایە دەقێکی ئەدەبی بایەخی تایبەت دەدات بە کێشە سەرەکییەکان. بۆیە بایەخی زێتر بە دەقێکی ئەدەبی دەدات تا دەقێکی نائەدەبی. سەیری ئەم ڕستەیە بکە: «پیاوەکە ناهێڵێت منداڵیان ببێت.» ئەمە لە وتارێک یان هەر دەقێکی نائەدەبی بخوێنییەوە، هێندە بایەخی پێ نادەی. بەڵام بێو لە چیرۆکێک، ڕۆمانێک یان شیعرێکدا بیخوێنییەوە، بایەخی زێتر پێ دەدەی و تێگەیشتنت بۆی قووڵتر دەبێتەوە. بۆ نموونە، لە ڕۆمانی مرۆڤی هەرزاندا، (بێرنی) ڕێگرە لەوەی خێزانەکەی منداڵی ببێت، ماڵباتیان لەسەر ئەمە تێکدەچێت. بابەتی کەمیی لەدایکبوونی منداڵ لە ئەوروپا کێشەیەکی گەورەی ئەوروپییەکانە.

چوارەم: ڕێسای خوازەی یەکگرتوو (the rule of metaphorical coherent)

زاراوەکە و سوژە لە خوازە پێوەندییەکی یەکگرتوویان هەیە بە دەقەکە. بۆ نموونە، چیرۆکێک دەنووسی لەسەر دەرۆزەکەرێکی بە تەمەن. دوای پێشاندانی نەهامەتییەکانی ژیانی، لە کۆتاییدا لە سەرمان لە شوێنێک ڕەق دەبێتەوە. دەکرێ ئەمە بە خوازەیەک دەرببڕی، « خۆرئاوابوونی ئەوێ ڕۆژێ سیس و ڕەنگ زەرد بوو و هەموو شتێکی دەبەستا.»

پێنجەم: ڕێسای تێمای یەکگرتوو (the rule of thematic unity)

لە هەر دەقێکی ئەدەبی چاوەڕێی ئەوە دەکەین تێماکە، بابەتە سەرەکییەکە، وجودی

هەبێت. واتە لە سەرەوە تا کۆتایی هەرچی هەیە لە خزمەتی تیماکان دایە. کەلەر پێیوایە تیمای یەکگرتوو بەم پرۆسێسانە دروست دەبێت: یەک، دژایەتی تەواو (باش بەرامبەر خراپ)؛ دوو، چارەی دژایەتی (باش بەسەر خراپدا زاڵ دەبێت)؛ سێ، ترازانی دژایەتی تەواو (واتە باش بەرامبەر خراپ دێتە چارەبوون لە ڕێی لایەنی سێیەم).

جێبەجێکردنی تیۆری ڕەخنەیی بونیادگەری لەسەر ڕۆمانی مرۆڤی هەرزان

هەوڵ دەدەین بزانین چۆن دەقەکە بونیاد نراوە بەهۆی پێوەندیی نێوان چەند ڕووداوێکی دووبارە. بۆ ئەمەش دەچینەوە سەر میتۆدەکەی تۆدۆرۆڤ: ڕووداو (فرمان)، سیفەت (ئاوەڵناو) و کارەکتەر (ناو). ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە بەسەر سێ فرماندا دابەش دەبێت: خۆیان دەکوژن، نازانین بۆ خۆیان دەکوژن، دەزانین بۆ خۆیان دەکوژن. ئەمە دەبێتە هۆی زەقکردنەوەی سیفەت و کارەکتەر: شووشە و تیمەکەی.

**تیۆری ڕەخنەیی بونیادگەری فراوانە و چەندان میتۆدی هەیە، دەکرێت بە شێوەی جۆراوجۆر لەسەر دەقی ئەدەبی بێتە جێبەجێکردن.**

لە سەرەتای ڕۆمانەکە خوێنەر بەر لێشاوێک لە خۆکوشتن دەکەوێت. ڕووداوەکانی خۆکوشتن لە کوردستان و فەرەنسا و ئەمریکا و ئێران و چەندان شوێنی تری جیهان دووبارە دەبنەوە. ئەم دووبارە بوونەوەیە وا دەکات زانایان بگەڕێن بۆ چارەسەرێک. شووشە و تیمەکەی پێنج جار یەک پرۆسە بۆ نێو جیهانی مردن دووبارە دەکەنەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەشێکی هۆی خۆکوشتنەکە ئاشکرا بێت و چارەسەری بۆ بدۆزنەوە.

ڕێزمانی (خۆکوشتن، نەزانین، زانین) یەکانگیرە لەگەڵ ڕێزمانە باوەکە کە بریتییە لە (سەرەتا، کێشە، چارەسەری کێشە). لێرەدا دەبینین ڕۆمانەکە بە شێوازێکی باو هاتووەتە بونیادنان (کێشە، چارەسەر). بەڵام لە کۆتایی ڕۆمانەکەدا، کاتێ شووشە بەئاگا دێتەوە، دڵخۆش نییە بە چارەسەرەکە و ڕووخسار و ئاکاری پێمان دەڵێن کە مرۆڤایەتی لەم کێشەیە دەربازی بوو، بەڵام پێ دەنێتە نێو کێشەیەکی خراتر. گێڕەرەوە پێمان ناڵێت کێشە نوێیەکە چییە، ئا لێرەدا کۆتایی ڕۆمانەکە لە بازنەی باوی (کێشە-چارەسەر) دێتە دەرەوە.

## ڕۆمانی مرۆڤی هەرزان بە هاوێنەی هەر سێ جۆری بونیادی گریماس

ڕۆمانەکە هەر سێ جۆرەکەی تیایە. کارەکتەرەکانی نێو ڕۆمانەکە، هەریەکە بە جیا، بەندن بە جۆرە پەیمانێک بۆ وەستاندنی پەتای خۆکوشتن (بونیادی گرێبەست). بۆ نموونە، شووشە پەیمانی بەخۆی داوە نەوەستێت تا چارەیەک بۆ پەتاکە نەدۆزێتەوە. سەرۆکی وڵاتان و بەرپرسانی کۆمپانیا و زانایان بەندن بەوەی ڕێ لە خۆکوشتن بگرن. هەموو جۆرە پەیمانێکیش قابیلی شکاندنە. پلۆتەکە بەندە بە پەیمانی مرۆییانەی شووشە و زاناکان کە تووشی دەیان کێشە دەبنەوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کۆڵ نادەن. شووشە و تیمی زانایان لە (زەوی بڵند) شەو و ڕۆژ گرێ دەدەن بۆ دۆزینەوەی چارەیەک بۆ پەتاکە (بونیادی جێبەجێکاری). ڕۆمانەکە بەم بونیادەیشەوە بەندە. بێو شووشە و تیمەکەی لە هەوڵ بکەون، بونیادی ڕۆمانەکە تێک دەچێت. بونیادی ڕۆمانەکە چەند جارێک دەکەوێتە ژێر هەڕەشە لە ڕێی (بانک) کە کارەکتەرێکی بەهێزە و نایەوێت هیچ چارەیەک بۆ خۆکوشتن بێتە دۆزینەوە. بەڵام هێز و تۆکمەیی بونیادی یەکەم و دووەم ناهێڵن بانک سەر بکەوێت.

## ئەنجام

لەم باسەدا، بۆمان بەدەر دەکەوێت تیۆری ڕەخنەیی بونیادگەری فراوانە و چەندان میتۆدی هەیە، دەکرێت بە شێوەی جۆراوجۆر لەسەر دەقی ئەدەبی بێتە جێبەجێکردن. ئەم باسە نموونەیەکە بۆ واڵاکردنی دەرگە بۆ ڕەخنەگرانی تر تا بتوانن میتۆدێکی ئەم تیۆرە هەڵبژێرن و لەسەر هەر دەقێکی خۆماڵی جێبەجێی بکەن.

## سەرچاوەکان


Barry, P. 2002. «Structuralism.» Pp. 39–60 in Beginning Theory: An Introduction to Literary and Cultural Theory. Manchester: Manchester University Press.

Mambrol, Nasrullah (2016-03-20). «Structuralism». Literary Theory and Criticism Notes. Retrieved 2017-06-29.

Nöth, Winfried. 1995. Handbook of Semiotics. Indiana University Press. p. 312.

Slavutin, Evgeny, and Vladimir Pimonov. 2018. Plot Structure. Moscow: Nauka / Flinta Publishing.

Tyson, Lois. Critical Theory Today: A User-Friendly Guide. New York: Routledge, 2015. Print.



هەرێم عوسمان، مامۆستا لە زانکۆی سلێمانی

# نەفرەتی زمان و ئۆینەکانی

## لەبارەی ڕۆمانی «داگیرکردنی تاریکی»

ئەگەر ڕۆمانەکانی دیکەی بەختیار عەلی نیشاندانی کورد لە چاوی کورد خۆیەوە بێت، ئەوا «داگیرکردنی تاریکی»(١) نیشاندانی کوردە لە چاو و نیگا و بینینی ئەویترەوە. بەپێچەوانەشەوە دروستە، واتە ڕۆمانەکە نیشاندانی ئەویترە لە دیدی منەوە، گوتاری ڕۆماننووسێکی کوردە سەبارەت بە مێژووی تورک و بینین و سڕینەوەی کورد وەک نەبینراو و بێدەنگکراو و تاریککراوێک. تاریکییەک کە ناگیرێت و ئەویتر دەیەوێت بیگرێت و ڕاوی بکات.

ئەم تاریککردنە مێژوویەکی هەیە، ئەویتر بۆ کوردی دروستکردووە و کوردیش لەنێو ئەو تاریکییەدا نەبێت، ناتوانێت بە ئاشکرا دەرکەوێت. مرۆڤە کوردەکان خۆیانن و خۆیانیش نین، ئەویتر بەردەوام دەیەوێت وایان لێبکات خۆیان نەبن، ئەوانیش دەچنە تاریکییەوە تا ئەویتر دەستی پێیان نەگات، بۆیە لە ڕۆمانەکەدا کەسێتی سەرەکی [تاریق ئاکانسو] ترسی لەو تاریکییە هەیە، نیگەرانە کە دەستی بەناو تاریکییەکە ناگات و دەیەوێت بگاتە ناو تاریکییەکە و ڕاوی بکات، پێیوایە کوردەکان لە مردنیشدا هەر جێگەی مەترسین و دەبێت بکوژرێنەوە، بۆیە دەچێت ئێسکەکانیان دەردەهێنێت و جارێکی دیکە وردیان دەکات، ئەم ترسەی تاریق لە تێنەگەیشتن و وێناکردنێکی پێشینە و ئایدۆلۆجی بینییەوە سەرچاوەی گرتووە. تاریق بە ئازایەتی نابینێت ڕاوی شتە ئاشکراکان بکات. ئەوەی ترسی لا دروستدەکات تاریکییەکەیە، ئەم تاریکییەش ڕۆحی کوردە، نەک جەستەی.

لە پاڵ ئەم داگیرکردنەدا، کوردانێکمان هەن، بوونەتە تورک و کوردبوونیان سڕیوەتەوە یان سڕاوەتەوە، خۆویست و خۆنەویستانە بوونیان شاردۆتەوە[بەڵام بە گشتی لەژێر فشاردایە]، لە دۆخ و ساتێکدا دەیانەوێت لەو تاریکییەی ناو ناخیان ڕزگاریان بێت و بگەنەوە بە ڕۆشنایی[کوردبوون]، ئەمەش لە ڕەزا باکلان ڕوودەدات، کە دەیەوێت لە زوڵمەتی خۆنەبوون دەرچێت و ببێتەوە بە خۆیی و ماسکەکەی فڕێبدات، پێویستی بە دەستی مەهدییە تا ڕووناکی کوردبوونی لە ڕێگەی زمانەوە تیابدۆزێتەوە و لە دەریای ئەویتربوون ڕزگاری بکات.

### ڕەهەندەکانی زمان، زمان و دەسەڵات

«دەوڵەتی تورک زمانەکەی بەو جۆرە بەسەرماندا سەپاند، وەک کەوچکێک لە پیسایی هەڵکێشیت و بیدەیتە دەست یەکێک و بڵێیت دەی هەر دەبێت بەوە نان بخۆیت...گەر دڵت تێکەڵبێت، گەر هێڵنج بدەیت، ئەوە پەیوەندی نە بەخواردنەکە و نە بە کەوچکەکەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەو کەسەوە هەیە کەوچکەکەی پیسکردووە»(مەهدی، ل،٦٤٤).

«فیشەکەکە لە خەندەکانی خێراتر بوون»(ل،٦٧٠)

ئەزموونی ڕۆماننووسی بەختیار عەلی، وێڕای فەنتازییایەکی تایبەت و بابەتی، کە بەردەوام هاوڕێ لەگەڵ کێشەیەکی گەورەی مرۆیی، سیاسی، مێژوویی باڵا دەکات، هاوکات زمانێکی بەرینی ئەدەبی دەبینین، کە پێموایە جوانی ڕۆمانەکانی بەختیار زۆرتر لە زمانەکەیدایە. ئەوە زمانە، فەنتازیا و هزر و خەیاڵی ڕۆشنکردۆتەوە، نەک ڕووداو و گێڕانەوە. زمانی کراوە و ئازادە بیرکردنەوە و خەیاڵی ئاوەڵا و بەرەڵا کردووە. هەر توانایی زمانە لە پێشبینی و زەنگی ئایندەی ڕووداوەکان ئاگادارمان دەکاتەوە، لەپڕێکدا و ڕاستەوخۆ یان پەسنییانە، دەڵێ، دوای بیست ساڵی دیکە یەک دەبینینەوە، یاخود هەرگیز

یەک نابیننەوە.. ئەمە وێڕای هونەری گێڕانەوە، کە گێڕانەوەی هەمووشتزان وایکردووە، ڕۆماننووس دەستکراوە بێت، تا ناوەوە و دەرەوەی ڕووداو و کەسێتییەکانمان نیشان بدات.(٢) لێرەشەوە دەنگی کەسێتییەکان لە تاکدەنگەوە بۆ ناو دەنگەکانی دیکە دەکرێتەوە. ئەم فرەدەنگییە ناڕاستەوخۆییە، بواری زمانێکی بێسنوور و ڕاقی بە پیاوکوژ و نەخوێنەوارترین کەسێتییەکانی ناو ڕۆمانەکە داوە. زمانی ڕۆمانەکە تەنیا لەبەرئەوەی گوتاری ڕۆمانەکە لەبارەی زمانە، دەوڵەمەند و جوان نییە، بەڵکو دەسەڵاتی زمانی ڕۆماننووسە ڕۆمانەکەی جوان کردووە.

فەنتازیای ناو ڕۆمانەکە بەهۆی زمانەوە قووڵتر و جوانتر و بەرینتر دەرکەوتووە. کاتێک ئیمران کارتاڵ لەگەڵ پڵنگەکە دەدوێت یاخود باسی پەیوەندی خۆی بە سروشتەوە دەکات، تەواو دیوە ڕۆحییەکەی سروشت بەهۆی زمانەوە بەرجەستە دەکات، هەر لێرەدایە پێشبینی هەنگاوەکەی بۆ تۆڵەکردنەوە لە ئاکانسو دەبینین. ئیمران دەڵێ «دەزانم سروشت بەردەوام سەیرم دەکات، ڕۆژێک ئارام و ئاسوودە سەیرمبکات هەستی پێدەکەم، ڕۆژێک بە خۆشەویستییەوە سەیرمبکات هەستی پێدەکەم، ڕۆژێک تورە و ناڕازی سەیرمبکات هەر پێیدەزانم. ئەوەتەی ئەو پڵنگەم ڕاوکردووە، عەرد و دار و بەرد لەگەڵمدا گۆڕاون. هەم من شەرم لە خاک و ئاوی هەرێمەکە دەکەم و هەم ئەوان من وەک دوژمن سەیردەکەن»(ل، ٢٩٤). زمانی سروشت خۆی بۆ زمانی مرۆڤ ئاوەڵا کردووە، کرانەوەکەش پەیوەستە بە پەیوەندی کەسێتییەکە بە سروشتەوە، کە لێرەدا نەفرەتی سروشت بەهۆی خیانەتکردنییەوە دەبیستێت. دەبینین چۆن زمان دەبێتە ئاماژە بۆ ئاماژەبۆکراوی ناوەوە، ئەو ناوەوەیەی لە پەیوەندیی و هەستێکی ناوەکی و یادەوەرییەکی تایبەتدا ڕسکاوە.

دواندن و سەیرکردنی پڵنگەکەش دیسان دەرخەری هەمان توانای نیشاندانی ئەوی بێ زمانە: «ئەوکاتەی من تۆم گرت، من تورک نەبووم و تۆ کورد، بەڵکو من ئینسان بووم و تۆ پڵنگ...پڵنگەکە وەک گوێ بۆ دۆستێکی دێرینی خۆی بگرێت گوێی بۆ ئیمران دەگرت. زۆر خرۆشابوو، بەڵام شەڕانگێزی پێوە دیارنەبوو...کە دواتر لە قەفەزەکە دوورکەوتنەوە پڵنگەکە تا ماوەیەکی درێژ هەر سەیری دەکردن. پڵنگەکە لەناو هەموو بینەرەکاندا سەری بەرزدەکردەوە بۆئەوەی بیانبینێت»(ل٢٨٩-٢٩٠). زمان لێرەدا جگەلە دیوە جوڵە و ناوەکی و ئیستاتیکاکەی بۆ نیشاندانی پڵنگ، کە پڵنگە و لە ڕەمزی کوردبوون خراوە و وەک خۆی دەبینرێت، نەک ئەو دیدە تورکییەی پڵنگ وەک ڕەمزی کۆیلە و ڕاوکردن و سەرکەوتکردن دەبینێت. لێرەدا زمان دەبێتە پانتایی دەرخستنی شت وەک ئەوەی هەیە*، بینین و سەربەرزکردنەوەی پڵنگ، زمانن، نیشانەن، وەک دەنگێک بۆ ئاشتبوونەوە و

لێخۆشبوون. دیوی نەوتراوی زمانی لێرەدا پەنجە بۆ شتێک ڕادەکێشێت لە ڕێگەی خودی خۆیەوە، کاتێک ئیمران دەڵێ سروشت و خاک بە ڕقەوە لێم دەڕوانن، پڵنگ سەری بەرزکردەوە بمانبینێت، ئەو ئاماژانەن کە بەهۆی پەسنی زمانەوە دەتوانین پێشبینی کردە و هەناوی ڕووداوەکانی لێبخوێنینەوە، هاوکات دەرخەری پەیوەندییەکی دێرین و ڕۆحی ئیمران بە سروشت و ئاژەڵانەوە نیشان دەدات، کە وەک تورکێکی ڕاوچی بە ئاکار بە عیشقەوە لەنێو سروشتدا دەژی و ڕاودەکات، نەک وەک ڕاوچییەکی سیاسی لەنێو سروشت و خاکی کوردان بێت، کە هەموو زمانی سروشت بۆ ئاکانسو دەبنە ترس و نیگەرانی و ویستی قڕکردن و ڕاوکردن.

ئیمران و ئاکانسو هەردوکیان زمانی سروشت دەبیستن، بەڵام ئەوە جیهانبینی و ڕوانینی خۆیانە بڕیار دەدات چی ببیستێت. زمانی ئاماژەی سروشت و پڵنگ بۆ ئیمران بەهۆی ئازادییەوە خۆدەربڕە نەک سەپێنەر و ئیمران دەربڕ. ڕۆماننووس لەبارەی هەستی تاریق ئاکانسو دەنووسێت: «هێندەی لە پاشەڕۆژی خۆی دەترسا، دەهێندە لەو هێزە تاریکە سڵی دەکردەوە لەسەر خاک و لە گوێ ئاو و لە پێدەشت و لە جەنگەڵ و لە بان ترۆپکانی ئەم خاکە دەسوڕێتەوە، هێزێکە دەستەمۆنەبووە و بە نهێنی و بێدەنگ لە تاریکیدا دەژی»(ل ٢٦٤). زمانی سروشت، زمانی بیرکردنەوە و هەستی تاریقە، لەکاتێکدا ئەو خۆشی و هێمنی و ئارامییەی ئیمران لە سروشت بەدیدەکرد، بۆ تاریق دەبێتە ترس و دڵەڕاوکێ. زمانی سروشت بۆ ئیمران ڕوون و شەفاف و نەرمە، بەڵام بۆ ئاکانسو دەبێتە نهێنی، تاریکی و ترس، ئەوەش پەیوەندی بە ترسی خۆیەوە هەیە. لەبەرئەوە زمانی سروشت لای ئاکانسو ئازاد نییە. هەر لەم زمانە وەسفییەوە ڕۆماننووس پەیوەندی نا پەیوەندی نێوان ئاکانسو و کورد، هاوسۆزی ئیمران و کورد دەردەخات، ئایندەی ڕووداو و کەسێتییەکانیش بەهۆی ئەم وەسفانەوە تاڕادەیەکی زۆر ئاشکراو و ڕۆشنن، دەزانین کە چی لە پێش پاکی و هەست بە تاوانکردنی ئیمران و ترس و دڵەڕاوکێی ئاکانسووەوەیە.

ڕۆماننووس لە ڕێگەی زمانەوە وەسفی بوون و دۆخی کورد دەکات، لە ڕوانینە جیاوازەکانی ئەوانەوە ناسنامەیان دەستنیشان دەکات، کە هەر فەرماندە و سەرکردەیەک کورد بە شتێک دەبینێت و بەپێی ئەو بینین و ناونانە مامەڵەیان دەکات، واتە زمانی ئەوان بەجۆرێکە هیچ کات شتەکە ئازادانە خۆی دەرناخات، بەڵکو زمان دەبێتە داردەست و کۆیلە. زمان دەبێتە ئاوێنەی نیشاندانەوەی ئەو ڕوانینە ئایدۆلۆجی، ناسیۆنالیستی، سیاسی و عەسکەرتارییەی بەدرێژایی مێژوو، بیر و خەیاڵ و یادەوەری ئەویتری بەرامبەر بە منی کورد نەخشاندووە. کورد لە دیدە جیاوازەکانی ئەوان دەمێ دەبێت بە: جنۆکە، ئاژەڵ و دڕندە، کۆیلە و نزمتر لە کۆیلە، شێت، یاخود ئاژەڵمرۆ، کە مەبەست لێی «جۆرە بوونەوەرێکە ئەرکەکانی لە ئەرکی ئاژەڵ زیاتر و قورسترە، بەڵام مافەکانی

له مافه‌كانی مرۆڤ كه‌متره‌. پله‌یه‌كه‌ ده‌وڵه‌ت خه‌ڵكی ئه‌م ناوه‌ی تێدا هێشتۆته‌وه‌، نه‌ ده‌هێڵن چێژ له‌ له‌زه‌ته‌كانی دونیای ئاژه‌ڵان ببینن و نه‌ده‌هێڵن چێژ له‌ مرۆڤبوون ببینن»(ل، ٢٩٧). زمانی ئه‌ویتر كه‌ كۆیاده‌وه‌ری نه‌ته‌وه‌یه‌كه‌ له‌سه‌ر ڕه‌تكردنه‌وه‌ی بوون و زمانی من ژیاوه‌، هه‌ر ئه‌مه‌ش زمان و جیهانبینی مرۆڤه‌كانی به‌رته‌سككردۆته‌وه‌، وه‌ك له‌ كۆتایی ڕۆمانه‌كه‌شدا نه‌وه‌یه‌كی نوێی تورك ده‌بینین، كچی عیسمه‌ت كه‌ پارێزه‌ره‌، هه‌مان په‌روه‌رده‌ی كه‌مالیست و گورگه‌ بۆره‌كانی هه‌یه‌، ناتوانێت له‌ سنووری توركبوون ده‌ربچێت و ئه‌زموونی ئه‌ویتربوون بكات، ئه‌ویتری كورد ببینێت، هه‌تا ئه‌گه‌ر باوكی خۆشی بێت «گه‌ر ئه‌م پیاوه‌ باوكی منیش بێت و ئه‌و چیرۆكه‌ش ڕاستبێت ئه‌و كابرایه‌ ده‌یگێڕێته‌وه‌، من كچێكی توركپه‌روه‌رم، له‌ منداڵییه‌وه‌ فێربووم توركم و توركبوونی خۆم له‌ هه‌موو شتێكی تر بۆ گرنگتره‌...تكایه‌ من دایكم زۆر ماندووبووه‌ تا په‌روه‌رده‌یه‌كی توركانه‌ وه‌ربگرم، نامه‌وێت وه‌ك توركێك بۆ ساتێكیش گومان له‌ پاكێتی خوێنی خۆم بكه‌م»(ل،٧١١). لێره‌دا په‌روه‌رده‌ و تێگه‌یشتن و زمانی ئایدۆلۆجی هێنده‌ به‌رته‌سك ده‌بێته‌وه‌، كه‌ ڕه‌مزیه‌ته‌ نه‌ته‌وه‌ییه‌كه‌ دژ به‌ هاوخوێنی و بوونی خۆش ده‌دات، كه‌ كچه‌ كوردێكه‌ و ناتوانێت جگه‌ له‌ تورك خۆی ببینێت.

زمانی كوردی بۆ ئه‌وی توركی دیكتاتۆر و ئایدۆلۆجیبین، زمانی مردوو و نه‌بووه‌، زمانی شێته‌، زمانی توركیش، زمانی مرۆیی و سه‌رومرۆیی، زمانی عه‌قڵ و زیندووه‌، زمانی ژیان و مرۆڤه‌ به‌رزه‌كانه‌. له‌ به‌رامبه‌ردا زمانی توركی بۆ كوردان و تورك جیاوازه‌، بۆ توركی سیاسی و ئایدۆلۆجی زمانه‌كه‌ پیرۆز، شیعری، پڕ ئاهه‌نگ و زمانی گۆرانییه‌، ته‌نیا زمانه‌ و زمانی عه‌قڵ و ده‌سه‌ڵاته‌، زمانێكه‌ ده‌چێته‌ به‌رگی مێتافیزیكه‌وه‌ و خوا پێی ده‌دوێت، زمانی هێز و ڕزگاریی و سه‌رده‌سته‌كانه‌. وه‌لێ له‌ دیدی كوردی داگیكراوی توركی به‌سه‌رداسه‌پێنراو، زمانه‌كه‌ توندو ڕه‌ق و زبره‌، لێی هه‌ڵدێن و به‌ره‌نگاری ده‌كه‌ن، ده‌یانه‌وێت زمانی جێگره‌وه‌ و جه‌سته‌ بدۆزنه‌وه‌، خۆیان كه‌ڕولاڵ ده‌كه‌ن بۆئه‌وه‌ی ڕووبه‌ڕووی زمانی توركی ببنه‌وه‌، یاخود شه‌وان له‌ خه‌و هه‌ڵده‌ستن، چونكه‌ به‌ ڕۆژ ناهێڵن كوردی قسه‌ بكه‌ن، بۆیه‌ ناچارن دووی شه‌و هه‌ستن و له‌گه‌ڵ یه‌كدی بدوێن و گۆرانی به‌ كوردی بڵێن، تا زمانه‌كه‌یان بپارێزن. ئه‌مه‌ جۆرێك له‌ زمانپه‌رستی و عیباده‌تی زمانی ده‌رده‌خات، كه‌ كورده‌كان بۆ مانه‌وه‌یان په‌نا بۆ ڕۆژوو و پارشێوه‌ی زمان ده‌به‌ن، شه‌وان كاتی پارشێو به‌ كوردی قسه‌ ده‌كه‌ن، به‌ ڕۆژیشدا به‌هۆی توركه‌-خوا خۆ لاڵ ده‌كه‌ن، ئه‌م ستراتیژه‌ بۆ خۆ-مانه‌وه‌ و مانه‌وه‌ی زمان، زۆر جیاوازه‌ له‌و كاركردن و بیركردنه‌وه‌یه‌ی توركه‌كان كه‌ له‌ سه‌نته‌ری ده‌سه‌ڵاتن، كه‌واته‌ پێگه‌ی ده‌سه‌ڵات، ڕوانین و كرده‌ی زمانیش ده‌گۆڕێت.

مه‌هدی كورد، كه‌ گوندنشینه‌ و مامۆستای عه‌لی ئیحسانه‌، به‌ خوێندكاره‌كه‌ی ده‌ڵێ:

«ئینسان کاتێک بە ئازادی و ویستی خۆی فێری زمان فێردەبێت، هەر کۆمەڵێک وشە نائاخنێتە سەری خۆی و بەس، بەڵکو کۆمەڵێک مەحەبەتیش دەخاتە دڵی خۆی. بەڵام باوکت و فەرماندارەکانی تر وایان لەگەڵ ئێمە نەکرد، بە شەق و بە کوتەک، بە لێدان، تورکییان فێری ئێمە کرد. بۆیە زمانەکەتان چەند جوان بێت هەتاهەتایە لای زۆر کەس لە ئێمە بە ئازار و ترسەوە گرێدراوە». ئەم پراکتیکە زمانییە لای مەهدی بە پێگەی مامۆستایەتی و باوکایەتی ڕەمزی مەهدی بۆ عەلی سەرچاوەی گرتووە، بەڵام پراکتیکی زمانی بەرامبەر بە دکتۆری باوکی زۆر جیاواز و سنووردار و ناخۆییە، هاوکات زمانی ئەویتری تورکیش بە جیهانێکی دەرە زمانی گرێدراوە، دڵسۆزانی زمانی تورکی بەپێچەوانەی خواست و مەبەستیانەوە، زمانەکەیان لە دیدی ئەویتردا ناشیرین، نەک جوان کردووە.

### ناونان و زمانی شاعیرانە

لە زماندا ناونان، بریتییە لە شوناس بەخشین بە شتەکان و ناسینەوە و دەستنیشانکردنیان. ناونان دروستکردنی فەزا، یادەوەری و مێژووە، دیاریکردن و ئاڕاستەکردنی بینینمانە. بەهۆی ناونانەوە ڕەهەندەکانی بیرکردنەوە دەکرێنەوە و ئاسۆی تێگەیشتن و ڕوانینمان دیاری دەکرێت. زمانی جوڵە و وەسف لە ڕۆمانەکەدا بنەڕەتیی گوتار و هونەری گێڕانەوەیە، کە بەشێکیان لەسەر بنەمای ناونانەوە وەستاون. ڕۆماننووس بەهۆی توانایەکی بەرزی ناونانەوە، بواری ناسینەوە و گێڕانەوەی وردی ڕووداو و دۆخەکانی بۆ خوێنەر ڕەخساندووە.(٣) ناونان لای ڕۆماننووس ڕەهەندێکی وێنەیی و ئیستاتیکی هەیە، کە بۆ کەسێتی، دۆخی کەسێتی، ڕووداو و ڕەوتی گێڕانەوە، کات و شوێنی جیاواز ئەنجامیداوە. ناونان چێژ و فەزایەکی هونەری بە خوێنەر دەبەخشن. وێڕای ئەوەی گوتاری ڕۆمانەکە لەسەر زمان وەستاوە و ئیشی بنەڕەتی ئاکانسو ناونانەوەی ناوچە کوردنشینەکانە، تا مێژوو و بناوان و یادەوەری نەتەوەیەک دابڕێژێتەوە. لەڕووی ناونانەوە دەتوانین چەند نمونەیەک کە ئەرکی مانادان بە دۆخ و کەسێتی و ڕووداوەکان دەبەخشن بهێنینەوە: «[ڕێکخراوی زمانی] دووی نیوەشەو، نەخۆشی سیاسی، زمانی مردووەکان، زمانی نەزانراو، لیژنەی ئەمنی زمانەوانی، زمانی قیامەت، پڵنگی تینوو، سابوندز، داگیرکردنی تاریکی، گورگە بۆرەکان، بەوری تینوو، خاکی جنۆکە، ئاژەڵمرۆ، گەنجە بێناسنامەکە، [نەخۆشخانەی] بەهەشتی کوردان. ڕێگای شۆڕشگێڕانە». هەریەک لەم ناو و ناونانانە وێنەن و گوزارشت لە دۆخ، دید، ڕووداو، شوێنکات، کەسێتییەک دەکەن، هاوکات خوێنەر پاش خوێندنەوەی دەتوانێت لە ڕێگەی ئەم ناوانەوە وەک کلیلی ڕۆمانەکە بیخوێنێتەوە. وێڕای ئەوەی جوانییەکی هونەریان بە گێڕانەوەی ڕۆمانەکە بەخشیوە. «دووی نیوەشەو، گورگە بۆرەکان»، دوو ڕێکخراو و

گرووپن، کە بەهۆی تاکوشە دروستەکەرەکەیان خوێنەر تێگەیشتن و وێناکردنی بۆیان دەبێت. «سابوندز، گەنجە بێناسنامەکە» دوو ناون بۆ دوو دۆخی جیاوازی عەلی و ئارسین، کە لە ڕێگەیەوە جوڵەی گێڕانەوە دەبینین، هاوکات شاعیرانە وێنەی دۆخەکەیان بەسەردا سەپێنراوە، واتە وەک کامێرایەک کە ساتە دەگمەنەکان دەگرێت، ئاوا ساتی گێڕانەوە ناوازەکان بەهۆی ئەم ناونانەوە نیشاندراوە.

هاوکات هەر لە ڕێگەی وەسف و زمانی شاعیرانەوە، زۆرجار پێشخستن و ڕووداوەکانی ئایندە بەرجەستە دەکات، بۆ نمونە کاتێک پێنج کورد ڕێگە بە عەلی دەگرن و برینێکی بچووک لە دەستی بەجێدەهێڵن، ڕۆماننووس بەم جۆرە پەسنی خوێنی ئەو برینە دەکات «دڵۆپە خوێنەکان لە بەفرەکەدا بچووک بوون، زۆر بچووک، بەڵام کاتێک عەلی ئیحسان لێی دەڕوانین لەبەرچاوی گەورەبوون و گەورەبوون و گەورەبوون تا بوون بە دەریایەک...هەموو بەفرەکە تەواو سووربوو، هەموو شارەکە تەواو سووربوو»(ل، ٤٩٢). ئەم دووبارەکردنەوانە زمانێکی شاعیرانەیە، دەرخەری هەست و دەروونی عەلین، نیشاندەری ئایندەیەکی ڕەق و توندە کە دونیای عەلی و تورکەکان بە خوێنبارین و تووڕەبوونی کوردەکان پێشی گیراوە، سەرەتای تۆڵەیە، ئاماژەیە بە سووربوونی شارەکان و دابارینی ڕق و توڕەیی بە ئایندەی وڵات.

> **ڕۆماننووس لە ڕێگەی زمانەوە وەسفی بوون و دۆخی کورد دەکات، لە ڕوانینە جیاوازەکانی ئەوانەوە ناسنامەیان دەستنیشان دەکات.**

زمانی وەسفی ڕۆماننووس، بەشێوەیەکی هونەری و قوڵ دیوە باریک و دەزوئاساکەی ناوەوە و پێگەی کەسێتییەکان نیشاندەدات، ئەو دەزووەش دەردەخات کە لەسەری پەتپەتێن دەکەن یاخود وەستاون. سەبارەت بە عەلی دەڵێ: ویژدانێکی بێ ئیرادەی هەیە، لە نێوان جەلاد و قوربانییەکاندا گەمە دەکات-ئارسینی برای- وای پێدەڵێت، عەلی ڕۆڵی مرۆڤێکی دووکەرت دەبینێت، بۆیە لە ڕوخساریدا بێگەردیەک هەیە متمانەی پێدەکرێت، بەڵام لەبوونیدا ئیرادەی نیە ئەو ویژدانە سەلیمە ئاراستە بکات. هاوکات لەگەڵ جەلاد و قوربانیەکاندایە، ناتوانێت خۆی یەکلابکاتەوە. «عەلی لەنێو دڵی دوو نەتەوە وەستابوو، تورک و کورد».(ل،٤٧٩). ئەم دوو لەتبوون و پارچەبوونە. پەیوەندی بە باوکی و

مامۆستاکەیەوە هەیە، باوکی دیکتاتۆرێکی تورک و پەروەردەکارێکی کۆماریپەرست و دڵڕەق، مامۆستاکەی کوردێکی جوتیار، کە کوردی فێر دەکات، لەگەڵیدا عەشقی نێو زمانەکەشی پێدەدات، لەبەرئەوە وەک کوڕی خۆی سەیری دەکات، عەلی لە نێوان ئەم دووانەدا گیری خواردووە و نایەوێت خیانەت لە هیچ کامیان بکات. ڕۆماننووسیش بە زمانێکی دەقیقی شاعیرانە ئەو گەمە سێرکییەی عەلی لە نێوان جەلاد و قوربانیدا دەردەخات، ئێمەش بە خیانەتێکی جوانی دەبینین، کە هەر ئەم خیانەتە وا دەکات دووجار بکوژرێت.

یەکێکی دیکە لە دەرخستنی تواناکانی زمانی وەسف و ناونانەوە، بریتییە لە وشەسازیی و دەستکاریکردنی وشە و بەکارهێنانی وشەی نوێ کە هەندێکیان جوان و نوێ و چێژبەخشن، زمانی ڕۆمانەکەیان دەوڵەمەند کردووە، هەندێکیشیان ناجۆر و نەسازن: «پرسچی، خەجلاو، قاچاغبەر، واگرە، کارئاشنا، فێرەپاس، تاکباڵ، خاویلکە...». بۆ نمونە «تاکباڵ» لەبری تەنیاباڵ هاتووە، کە ناساز و هەڵەیە، بەڵام وشەی پرسچی جوان و وردە، مەبەست لەو کەسانەیە ئیشیان پرسینە، نەک ئەوانەی پرسیارسازن.

### زمان و وێنەی کەسێتییەکان

دید و گوتاری ڕۆماننووس لە ڕێگەی زمان و ئەو پەسنانەی بۆ کەسێتی و دۆخەکان دەیکات، دەردەکەوێت. کاتێک وێنەی کەسێتییەکمان لە ڕێگەی زمانەوە بۆ دەکێشێت، بەهۆی وەسفەکانەوە، هەست و سۆزی خوێنەر دەجوڵێنێت، هاوکات بڕیاری پەسەندی و ناپەسەندی کەسێتیەکە دەدەین. ڕۆماننووس بەهۆی گوتاری زمان و لایەنگری زمانییەوە، گۆڕانی کەسێتییەکان و باری گوتاری ڕەخنەیی تورکمان پێدەڵێت، بۆ نمونە کاتێک عەلی ئیحسان دوای زیاتر لە بیست ساڵ چاوی بە سامی[کە ئێستا دکتۆر و بەرپرسی نەخۆشخانە- شێتخانەی کوردەکانە] دەکەوێت، لە ڕێگەی وەسفەوە دەبینین، چۆن سامی لە مرۆڤێکی بێگەردەوە ئێستا بووە بە مرۆڤێکی شەیتانی و ناشیرین. ئەم کەسێتییە پێشتر بەرامبەر بە کورد خراپ نەبووە، بەڵام ئیستا بووەتە مرۆڤێکی خراپ: «عەلی ئیحسان نەیدەتوانی خەیاڵی بۆ ئەوە بچێت، ئەم پیاوە سەرزل و مۆن و وشکە هەمان هاوڕێی لەشسوک و ڕۆحسوکەکەی ئارسینە»(ل ٣٠٤). گۆڕانی هەڵوێستی کەسێتییەکان لە زمانی وەسفکردنی کەسێتیەکاندا دەگۆڕێت، واتە ڕۆحسوکی بە مۆن و سەرزلی گۆڕاوە، ئەم پەسنەش هاوسۆزی و ڕق لای خوێنەر دروست دەکات و لایەنگرانەیە. زمانێکە بێبەشە لە زانیاری بێگەرد، بەڵکو زانیارییەکان هەستی کراونەتەوە، واتا زمان دەبێتە ڕوانگە، نەک زانیاری پوخت. لێرەدا وێنەیەکی ناشیرینی ئێستا و جوانی ڕابردووی کەسێک دەردەخات، کە ئەوەی ناشیرینی کردووە، گۆڕانی هەڵوێستی سیاسی و کردەکانی

ئیستایەتی، جوانیی گەنجیشی پەیوەندی بە لاویەتیەوە نییە، هێندەی پەیوەستە بە خراپە و هاوبەشی نەکردن لە تاوان. یاخود گێڕەرەوە کاتێک ڕقی دیدەم شاهین بۆ زمانی کوردی نیشان دەدات، دەنووسێت «دیدەم شاهین هەتا کاتێک دەنوسێت زمانێکی نەزانراو ڕقێک لە دەست و پەنجەکانیدایە»، هاوکات وەسفی دیدەم خۆیشی دەکات، بەپێچەوانەی ناوە شاعیرانەکەیەوە ڕق و زبرە، نەرمی و جوانی تێدا نابینیت. وا پەسنی دەکات کە تۆی خوێنەر ناشیرین بیبینیت، حەز بەچارەی نەکەیت «ژنێکی ئاسنین دیارە، جوتێک پێڵاوی پاژنە بەرزی لەپێدایە، پێڵاوەکان شێوەیەکی سەربازییان بە وەستان و ڕۆینی بەخشیوە. دەموچاوێکی باریک و نیگایەکی ساردی هەیە، قژێکی کاڵ و لوولی وەک تاج بەرزکردۆتەوە و لە دواوە بەستویەتی، مەکیاژێکی تەنک دەکات و بەردەوامیش جگەرە دەکێشێت» لە شوێنێکی دیکە دەنوسێت»دڵڕەقترین ژنی دونیایە»، ناساندنی کەسێتی و وەسفیان پەیوەستە بە ڕوانگە و هەڵوێستیان، واتە زۆرجار ڕۆماننووس بەرلەوەی کردەکانیان بخاتەڕوو، لە ڕێگەی وەسفی زمانییەوە دەزانیت ئەو کەسێتییە چۆنە و تۆی خوێنەریش هاوسۆزی و گرژیت بەرامبەری دەبێت. بەپێچەوانەی دیدەم کاتێک وەسفی پیرە پیاوێکی کوردی کوردپۆش دەکات، درۆزنیەکەیت خۆش دەوێت، شاعیرانە وێنای دەکات، کە لە بەردەم دەسەڵاتدارە تورکەکان حاشا لە کوردبوونی دەکات و دواتر خێرا ڕادەکات لە تەواولێت دەگری. یاخود کە وێنەی سینەم کچە کوردەکە دەکێشێت، زمانەکەی جوانی دەبەخشێت، نەک نیگەرانی و ڕەقی، ئەمەش باری سەرنج و ڕوانگەی لایەنگرانەی ڕۆماننووسە بۆ کەسێتیەکان: «سینەم کیژێکی باریکی قژڕەش و چاوڕەش بوو، ویقار و هێمنییەکەی چووبووەوە سەر دایکی، وەک سەی قاسم هەموو ڕۆژێک بە کوردی پێیدەگووت، یەکێک بوو لە خاتوونە قەشەنگ و بەژن دەلالەکانی ئامەدە». ئەم پەسنە وێرای نیشاندانی دوانی دایک و کچ، هاوکات کوردیبوونی دەردەخات و جوانی هەڵسوکەت و بەژنوباڵاشی دەردەخات، لەگەڵ ئەوەشدا لە زمانی کەسێکی دیکەوە پەسنی دەکات، نەک تەنیا گێڕەرەوەی هەمووشتزان، ئەمەش تا دیوە لایەنگرانەکە بەتەواوی دەرنەکەوێت.

### بوونی نەتەوە و زمان

لەم ڕۆمانەدا دیوە تاریک و پەنهان و ڕۆشنەکانی زمان دەبینین، بەر نەفرەت و تام و ڕەنگ و بۆنە جیاوازەکانی دەکەوین، زمانێک دەبینین خۆی و دژە خۆی، هەموو شتێک دەردەخات و دەشارێتەوە، شتێک دەڵێ و پەنهانەکەی لە خۆیدا هەڵدەگرێت، دیوە نادیارەکەش مەحکوم دەکرێتەوە بە دەربڕین، بەڵام بە خواروخێچی، کە ڕەنگە هەر دیوە خێڵەکەی زمان هەقیقەتی بوون نیشانبدات. زمان لەم ڕۆمانەدا کە پرسێکی بنەڕەتییە،

دیوە شەیتانی و پەریئاساکەی، ژهر و دەوای، سیحر و واقیعییەتەکەی دەردەکەوێت. وێڕای توانای زمانی ڕۆماننووس لە بەرجەستەکردنی ئەو ڕەهەندە جیاوازانەی زمان کە وەستان و وەسفەکانیشی جوڵە و ڕێخۆشکەری هاتنی ڕووداون، ئەوا پرسی زمان لە ڕۆمانەکەدا دەبێتە ڕایەڵەی کۆپەیوەندی بە کایەو بوارە جیاوازەکانەوە. کاتێک عیسمەت تورکی بیردەچێتەوە و بەر نەفرەتی زمانی کوردی دەکەوێت، سەرەتا شیرینی و ئاهەنگی زمانەکە دەچێژێت، تاڵییەکەی پاش ئەشکەنجەی زۆر دەردەکەوێت و دەڵێت «من هەر تورکم...زمان هەموو شتێک نییە، دڵنیابن بە دڵ و دەروون هەر تورکم...زمان هیچ نییە، من گەر بە ڕۆح تورک بووم با بە هیندی قسەبکەم»(ل، ٢٧٧). ئەمە دەرخەری ئەو ڕەهەندە پێچەوانەیەی زمانە کە خۆی دەشارێتەوە، نیشاندەری ئەو دۆخەیە زمان دەربڕی بوون نییە، هاوکات لەودیویشەوە زمان دەکەینە ئەو کەرەستەیەی کە خۆمانی پێبشارینەوە و ئەویتری پێ فریو بدەین. زمان نابێت بە نیشاندەری باری نەتەوەییمان، بەڵام دووکەرتمان دەکات، ناتوانین ببین بە شتێکی گیرساوە و کۆتاییهاتوو، ناتوانین ببینەوە بە خۆمان، ئەمە نەفرەتی زمانە عیسمەت هەڵدەلوشێت و لەنێوان دوو نەتەوەدا گیری دەدات. هەروەک زانینی زمانی کوردی و تورکیش بۆ عەلی دەبێتە پردی نێوان هەردوو نەتەوەکە، عەلی لەنێو هەردوو نەتەوەکەدا گیر دەخوات، نە تورکە و نە کوردە.

ڕۆحیەتی هاوسۆزی باکلان بۆ کورد سەرەتا لە ڕێگەی زمانەوە دەرناکەوێت، بەڵام بەبێ زمانەکەش هەست بە کەمی و نوقسانی بوونی کوردانەی دەکات. واتا نەزانینی زمانی کوردی، بوونی کوردانەی توشی قەیران دەکات. ئەمەش پێچەوانە و هاوئاهەنگ بە دۆخی عیسمەت کە زمانەکە سەرەتا هیچ نەفرەتێکی نییە و دواتر دەبێت بە نەفرەت و تورکبوون نەک کوردبوونی زەقتر دەکاتەوە. لێرەدا زمانی کوردی ناتوانێت کوردبوون نیشانبدات، بەڵام دیوە ڕاستەقینە و ڕاستگۆکەی زمان دەتوانێت بوونی مرۆڤ و نەتەوەش دەربخات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە پرسێکی گرنگە و ناتوانین زانین و نەزانینی زمان بە بوونەوە گرێبدەین، ئینگلیزی زانی نامانکات بە ئینگلیز، کوردیزانیش مانای کوردبوون ناگەیەنێت. واتە دەکرێت بە زمانی نەتەوەیەک قسەبکەین و ئینتیمامان بۆ نەتەوەیەکی دیکە هەبێت، بەڵام نابێت بە کوڕی ئەو نەتەوەیەی کە زمانەکەی دەزانیت، زۆرتریش ئەمە پەیوەستە بە بیرکردنەوە و ڕوانینەکانمان کە چەند پێشبڕیار و سیاسی و ئایدۆلۆجییانە سەیری زمان بکەین، هێندەش لە بوون و ڕۆحی نەتەوەکە دوورمان دەخاتەوە. سیاسەتی تورکیا، کە بەسەر کۆپرسی بوارەکان پەخش دەبێت، پرسی زمانیش دەبێت بە ڕیشە و بنچینەی نەتەوەیەک، لەبەرئەوە بە درێژایی ڕۆمانەکە کە سیاسەتی جیاوازی دەسەڵاتداران نیشاندەدات، لە ئاستی ڕۆشنبیری و بڵاوکراوەکانیشیاندا، ناوی کورد و زمانی کورد بقەیە، ناوهێنانی زمانەکە گوزارشتە لە کورد خۆی، ئەمەش هاوئاهەنگە بە

دیدی کوردانەوە کە لە ڕێگەی زمانەوە گوزارشت لە بوونی خۆیان دەکەن، مانەوە و هەرمانی لە هەرمانی زمانەوە دەبینن، لەبەرئەوە لە ڕوانگە سیاسیی و نەتەوەییەکەوە زمان بوونی نەتەوە نیشان دەدات، سڕینەوەی زمان، سڕینەوەی نەتەوەیە، ڕێکخراوی دووی شەو، گوزارشت لە خەباتی مانەوەی نەتەوەی کورد لە ڕێگەی زمانەوە دەکات.

د. جەمال نەبەز پێیوایە، ناکرێت بەهۆی زمان و لە ڕێگەی زانینی زمانی کوردییەوە، بڕیار لەسەر کوردبوونی ئەو مرۆڤانە بدەین کە کوردی دەزانن، دەکرێت کوردی نەزانێک لە کوردیزانێک زیاتر کورد بێت. وەک چۆن عیسمەتی خۆبەتورکزانی کوردیزان یان عەلی تورکی کوردیزان خۆیان بە کورد نازانن، بەڵام کوردی دەزانن، کوردیزانیش نەیکردوون بە کورد[هەرچەند لەنێوەی هەردووکیاندا وەستاون]، هاوکات ڕەزا باکلانی کورد، کوردی نەزانییەکەی نەبووەتە هۆی سڕینەوەی کوردبوونی، هەرچەند بۆماوەیەکی زۆر کوردبوونی سڕبووە. کەواتە کوردیزانی عیسمەت لە تورکبوونی نەخستووە، کوردی نەزانی باکلان لە کوردبوونی نەخستووە، ڕۆحیەتی کوردانەی نەکوشتووە و لەوپەڕی دیوە دڕندانەکەشی، دیوە کوردانە ڕەسەنەکەی دەردەکەوێت و نەفرەت لە خۆفریودانی تورکانەی خۆی دەکات. لە بەرامبەردا چەندین کوردی جاش و خۆفرۆشمان هەن کە کوردیزانن، بێ ئەوەی ڕۆحی کوردانە و کوردبوونیان هەبێت، یاخود بە دڵ و گیان کوردبن. لە شێتخانەکە عیسمەت دەڵێ، ئەم سوکایەتییە قەبوڵ ناکەین، لەبەر کوردیزانی بمانخەنە تەنیشت کوردەکانەوە، خوێنی ئێمە هەر تورکییە، لەولاوە کوردێکیش بە توڕەییەوە دەڵێ «ڕاستە زۆر خەڵکمان هەن زمانی خۆیان بیرچۆتەوە و تەنیا تورکی قسە دەکەن، بەڵام ئا لێرەدا، لە سینەماندا دڵێکی کوردی هەیە، بەڵێ وایە زمان هیچ نییە...ئەگەر وشەیەکیش کوردی نەزانین، بەڵام ئەو دڵەی لێرەدا لێدەدا دڵێکی کوردییە»(٣٢١). ئەمە هەمان‌دیدی تورک و کوردێکە، کە زمان هیچ نییە و ئەوەی لە ناوەوە و دڵماندایە گرنگە. جەمال نەبەز دەڵێ: «زمانی کوردی لەلایەن جەماوەری کوردەوە، زۆر نرخی پێدەدرێ، بەپێناسەیەکی یەکجار گرنگ بۆ «بوونی کورد» و «کوردبوون» دەدرێتە قەڵەم. کوردی واش هەن پێیانوایە کە کورد هێندە کوردە تا زمانەکەی ماوە»(٤). ئەم جیهانبینیە لای کوردەکان باوە، کە زمان بە کوردبوونەوە گرێدەدات، جەمال نەبەز بەپێچەوانەوە، پێیوایە زانینی زمانی کوردی کوردبوون ناگەیەنێت. مەهدی، مامۆستا کوردەکەی عەلی ئیحسان، بە عەلی ئیحسان دەڵێ «ئەگەر باوکت بەردەوام بە تۆ دەڵێت»تۆ دەوڵەتی تورکت هەیە». ئێمەش تەنیا شتێکی گرنگ هەمانە ئەو زمانەیە»(ل٢٨٤). لێرەدا هێزی زمان و دەوڵەت بەرامبەر بەیەک وەستاونەتەوە، کە بەهۆی زمانەوە ڕووبەڕووی دەوڵەتی تورک دەبنەوە.

دیارە زمان بۆ کوردەکان [بەتایبەت لە ڕابردوودا] گوزارشتی لە بوون کردووە. بەڵام وەک جەمال نەبەز دەڵێ، لەڕووی بوونەوە ناکرێت زمانزانی بەرگی ئەو بوونەمان

بداتێ کە زمانەکەی دەزانین، نەزانی زمانەکەش بوونە نەتەوەییەکەمان لێوەرناگرێتەوە، ئەمەش لە ڕۆمانەکەدا بە زەقی دەردەکەوێت، کە چەندین کەسێتی بەهۆی لێسەندنەوەی زمانەکەیان کەوتوونەتە دۆخی جیاوازەوە، یاخود بوونەتە تورک و کوردبوونیان لەبیر کردووە، یاخود زمانی تورکیان کردووە بە دەمامک بۆ شاردنەوەی دیوە ڕۆحی و وجودییەکەی کوردبوونیان، هاوکات ئەو کەسێتییانەش دەبینین کە بە هۆکارێک یان لە ڕێگەی دەنگی ویژدانەوە کوردبوونیان دەردەکەوێتەوە، ئەمەش لە ڕێگەی دەرکەوتی دیوە ڕۆحی و ناوەکییەکەی زمان.

کەواتە ڕۆمانەکە هەڵگری ڕەهەندە جیاوازەکانی زمانە، کە دەکرێت تورکێک کوردی فێری کوردەکان بکات، کوردەکانیش کوردی فێری تورکەکان بکەن، ئەمەش لە گوتاری ڕەخنەگرانەی ڕۆمانەکە کەمناکاتەوە، کە ڕەخنەی ئەو مێژووە ترسناک و بێ ویژدانەی تورک لە ئاستی سیاسەت و ئایدۆلۆجیا دەردەخات، نەک ئەوەی تورک خۆی لە خۆیدا هەڵگری دیوە شەیتانییە ڕەتکەرەوەکە بێت، بەواتایەکی دیکە ترسناکی دیوە ناسیۆنالیست و ئایدۆلۆجی و دەوڵەتپەرستیەکەی تورک بەسەر کورد و ئەرمەن و یۆنانی، عەلەوی و کریستیان نیشان دەدات، کە سیاسەتی تورک لەناوبردنی ئەویترە جیاوازەکانە، ئیدی ئەو ئەویترە گرنگ نییە گەر شوناسی نەتەوە، ئاین و مەزهەبی هەڵگرتبێت. کردەی سڕینەوە و ڕەتکردنەوەکەش زۆرتر لە ڕێگەی سڕکردنی زمانەوە ئەنجام دەدرێت و دراوە.

### سەرچاوەکان


١. بەختیار عەلی، داگیرکردنی تاریکی، ناوەندی ڕۆشنبیری ڕەهەند- سلێمانی، چ١، ٢٠٢٠.

٢. عەلی عوسمان یاعقووب، ڕۆمان، ژانری تەکنیکە جوانەکان و ڕەگەزە فرە ڕەهەندەکان، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٩.

٣. ئاهەنگ شەفیق حەمە بچکۆل، گوتاری جەستە لە ڕۆمانی کوردیدا-کرمانجی خواروو سالآنی(١٩٩٥-٢٠٠٥)، [تێزی دکتۆرا] کۆلێژی زمانی زانکۆی سلێمانی، ٢٠١٩، ل٨٧.

٤. جەمال نەبەز، ناسنامە و کێشەی ناسیۆنالی کورد، لێکۆڵینەوەی: پێوەندارێتی کوردی، کورد کێیە و کوردبوون مانای چی؟ چ٢، کتێبفرۆشی سۆران، ٢٠٠٧. ل ١٧.



سەنگەر زراری

# ڕۆمان دۆستی کوردە یان چیاکان؟!
## دیدی ڕەخنەگرانەی یەکەمین ڕۆمانەکانی کورد

ڕۆمان وەکو فۆرمێکی ئەدەبی، بەرهەمی کۆمەڵگایە، لە سەرەتاشەوە دەرکەوتنی ڕۆمان لە کۆمەڵگای ئەوروپی، بەرهەمی ئەو کێشمەکێش و ململانێیە بووە کە لە کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا هەبووە، ئەوەی وایکردووە هونەری ڕۆمان بە زیندوویی بمێنێتەوە و بەرەوپێشیش بچێت، ئەو پەیوەندییە بووە کە لەگەڵ کۆمەڵگا هەیەتی. زۆرێک لە ڕەخنەگران پێیانوایە ڕۆمانە گرنگەکانی جیهان لە کۆنەوە تا ئێستاش، ئەوانەن کە لە دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کۆمەڵگاکانیان سەریانهەڵداوە و گوزارشت لە کۆمەڵگاکانی خۆیان دەکەن، نموونەی ئەوانەش: «شەڕ و ئاشتی»ی تۆڵستۆی، «لەگەڵ بادا ڕۆیی»ی مارگرێت میشێڵ، «مەزرای ئاژەڵان»ی جۆرج ئۆروێل، «بێنەوایان» و «قەمبوورەکەی نۆتردام»ی ڤیکتۆر هۆگۆ، «خۆشەویستی لە زەمانی کۆلێرادا» و «سەد ساڵ تەنیایی»ی گابریێل گارسیا مارکیز، «کوڕانی گەڕەکەکەمان» و ڕۆمانەکانی دیکەی نەجیب مەحفووز و...(١)

دیارە ڕۆمانی کوردییش هەر لە سەرەتاوە ئەم تایبەتمەندییەی هەبووە کە هەڵێنجاو و ڕەنگدانەوەی کۆمەڵگاکەی بووە، ئەوەی جێی لێوردبوونەوە و دڵخۆشیشە ئەوەیە کە ڕۆمانی کوردی هەر لە سەرەتاوە بە ڕیالیزمی ڕەخنەیی دەستپێدەکات و یەکەمین ڕۆمانەکانی کوردی ئەوانەن کە بە دیدێکی ڕەخنەگرانە لە دزێوی و خراپییەکانی کۆمەڵگا دەڕوانن.

ئێمە لێرەدا هەردوو یەکەمین ڕۆمانی کوردی بە نموونە وەردەگرین، کە ئەوانیش ڕۆمانەکانی (مەسەلەی ویژدان- ئەحمەدموختار جاف) و (شڤانێ کورمانجا-عەرەبی شەمۆ)ن. هەردوو ڕۆمانەکە هەم ڕیالیستین و هەم ڕەخنەگرانەن، بێگومان ڕیالیزم هەوڵێکە بۆ وێناکردنی واقیع وەک ئەوەی هەیە، ئەوانیش لەوەدا سەرکەوتوو بوونە. بەهۆی ئەوەش کە هەردووکیان دەچنە چوارچێوەی ڕیالیزمی ڕەخنەگرانەوە، پێویستە لە ڕێگای ئەم میتۆدەوە چاویان لێ بکرێت و بخوێنرێنەوە. لەبارەی ڕیالیزمی ڕەخنەییەوە «ڕەخنەگری هەنگاری جۆرج لۆکاش لە میانی لێکۆڵینەوەکانی لە ئەدەبی ڕیالیستی فەڕەنسی، بەتایبەتی ڕۆمانەکانی بەلزاک و ئیمیل زۆلا، هەروەها ڕۆمانی ڕووسیی دوای شۆڕشی بەلشەفی، ئەم چەمکەی داهێنا. ئەو ڕۆمانانەی لەچوارچێوەی ئەم ڕەوتەی ڕیالیزمدا نووسراون، هەوڵیانداوە لە ڕێگەی شیکردنەوەیەکی ورد بۆ کۆمەڵگا و دەرخستنی دیوە ناکۆکییەکانەوە گوزارشت لە واقیع بکەن و بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە گەشەی کۆمەڵایەتییان پیشانداوە، ئەمە هەڵوێستێکی باش بوو بۆ ئەو کاتە، چونکە ئەو نووسەرانە نەیانویست بێدەنگ بن و ملکەچی بیروباوەڕی بۆرژواکان بن، بەڵکو بەلایانەوە باشتر بوو بەشێوەیەکی زۆر بابەتیانە و بەوپەڕی بوێرییەوە، دیوە شاراوەکانی واقیع دەربخەن.» (٢)

هەردوو ڕۆمانە کوردییەکەی کە ئاماژەمان پێدان، توانیویانە دیوە ناکۆک و شاراوە و خراپەکانی کۆمەڵگاکانیان دەربخەن و لەوێشەوە تاڕادەیەکی زۆر بە زمانێکی سادە گوزارشت لە مەینەتییەکانی کۆمەڵگاکانیان بکەن، بۆیەش توانیان بچنە ناو ئەم ئاڕاستە ئەدەبییەوە، چونکە لە سەرەتاوە «ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە ئاڕاستەیەکی کۆمەڵایەتی ڕەهای هەبوو، بە تەنگ جێبەجێکردنی تیۆرە زانستییەکان و بینینە فەلسەفییە ئامادەکراوەکانەوە نەبوو، بەڵکو لەسەر بنەمای ڕەخنەی بونیادنەر و شیکردنەوەی واقیعییانەی کاراکتەر و دەوروبەردا پەیدابوو.»(٣) ئەوەی لەم دوو ڕۆمانەش پەیڕەوکراوە، بەدەرە لە زمانی فەلسەفی و ئاڵۆز و زمانێکی سادەی ناو کۆمەڵگایان تێدا بەکارهاتووە.

لەم بابەتەدا لەبەر چەند هۆکارێک ئێمە ئەم دوو ڕۆمانە بەیەکەوە وەردەگرین، کە پێویستە هەندێکیان بۆ خوێنەر ڕوون بکەینەوە، لەوانەش:

١- ڕۆمانی یەکەمیان (مەسەلەی ویژدان)، یەکەمین ڕۆمانی نووسراوی کوردییە و ڕۆمانی دووەمیشیان (شڤانێ کورمانجا) یەکەمین ڕۆمانی چاپکراوی کوردییە، واتا

هەردوو ڕۆمانەکە بناغەدانەری ڕۆمانی کوردیین لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا.

٢- هەردوو ڕۆمانەکە هاوسەردەمن و چەند ساڵێکی کەمیان نێوانە، تەنانەت نووسەری هەردوو ڕۆمانەکە کوردن، تەنیا شوێنی جوگرافییان جیاوازە.

٣- ڕاستە هەردوو ڕۆمانەکە کوردیین و نووسەرەکەیان کوردە، بەڵام هەریەکەیان لە وڵاتێکن و لەڕووی ژیانی کلتووریی و کۆمەڵایەتییەوە، زۆر لە یەکتر جیاواز بوونە، بۆئەوەی لە ڕێی ئەم ڕۆمانانەوە تێبگەین مونەوەرانی کورد لەو سەردەمەدا لە پارچە جیاوازەکانی کوردستان چۆنیان بیرکردۆتەوە و لەوەش تێدەگەین کە دیدی هەردووکیان تا چەند لە یەکەوە نزیکە؟ چونکە بە جیاوازیی شوێنی جوگرافی و دیالێکتی نووسینیانەوە، ڕەگوڕیشەی هەردوو ڕۆمانەکە کوردییە و جەبرێکی مێژوویی ئەم وڵاتەی پارچەپارچە کردووە.

**ڕۆمانی مەسەلەی ویژدان:**

ڕۆمانی مەسەلەی ویژدان، ئەگەرچی لە ساڵانی (١٩٢٧-١٩٢٨ز) نووسراوە، بەڵام بەهۆی هەر بارودۆخێک بێت ئەو کات چاپ ناکرێت و بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٧٠ چاپ دەکرێت، بۆیە هەرچەندە یەکەم ڕۆمانی کوردییە، بەڵام نابێتە یەکەم ڕۆمانی چاپکراوی کوردی.

ئەحمەدموختار بەگی جاف (١٨٩٨-١٩٣٥)ی نووسەری ڕۆمانەکە، کەسێکی خانەدان و بەگزادەی جاف بووە، بەڵام هەمیشە لە واقیعی ژیانی ئەو کات ناڕازیی بووە، ئەگەرچی چ لە سەردەمی شێخ مەحموود و چ لە سەردەمی حوکمڕانیی ئینگلیزیش بەهۆی پلەوپایە کۆمەڵایەتییەکەی و پێگەی بنەماڵەکەیان لە پرۆسەی حوکمڕانی بەشداربووە، بەڵام سڵی لە ناڕەزایەتییەکانی نەکردووەتەوە و لە شیعر و نووسینەکان و هەڵوێستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانیشیدا ئەم ناڕەزایەتییەی دەرخستووە، ئەو لە سەردەمی شێخ مەحموود دەکرێتە قایمقام(هەڵەبجە) و دواتریش هەر لە لایەن شێخەوە دەستگیر دەکرێت، لە سەردەمی پەڕلەمانی ئینگلیزەکانیش دەکرێتە مەبعووس (ئەندامی ئەوکاتی پەڕلەمانی عێراق) و دواتریش تاکە مەبعووسە لە دۆخەکە ڕازی نییە و دەستلەکار دەکێشێتەوە(٤). بۆیە شتێکی ئاساییە لە ئەدەبیات و نووسینیشدا ڕەخنە لە دۆخی ئەو کاتی کوردستان و عێراق بگرێت. ئەم ڕۆمانەشی «مەسەلەی ویژدان» بە دیدێکی زۆر ڕەخنەگرانە نووسیوە. ڕۆمانی «مەسەلەی ویژدان» بە شێوازی گێڕانەوەیەکی زۆر سادە و ساکار نووسراوە، کەسی یەکەمی تاک، کە هەر خۆی پاڵەوانی ڕۆمانەکەیە، کەسایەتیی سەرەکی ڕۆمانەکەیە و کردەوە باش و خراپەکان هەر لەلایەن خۆیەوە ئەنجام دەدرێن. ئەمەش بە بۆچوونی من هۆکارەکەی ئەوەیە کە دیارە هیچ تەکنیکێکی دیکەی شک نەبردووە بۆ نووسینی ڕۆمانەکەی، یان لە سەردەمی ئەودا تەنیا ئەم جۆرە گێڕانەوە و گێڕانەوە لە ڕێگای کەسی سێیەمی ئاگادار بە هەموو شتێک باو بووە، وەکو لە داستان و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان

هەیە و ئەحمەدموختار جاف ویستوویەتی بەم شێوە گێڕانەوەیە، چیرۆکەکەی لە داستان و حیکایەتی فۆلکلۆری جیابکاتەوە کە بە زۆری لە ڕێگای کەسی سێیەمی تاک دەگێڕدرێنەوە.

لەم ڕۆمانەدا نووسەر چەندین پرسی جۆراوجۆری خستووەتە ڕوو و ڕەخنەی لێ گرتوون، لەوانەش: فرتوفێڵ و دەستبڕینی خەڵک لە نێوان یەکتر و لە نێوان ئەو کەسانەش کە پلەدار و دەستڕۆیشتوون و چەوسانەوەی هەژار و نەداران، دەردی نەخوێندەواریی و پابەندبوونی خەڵک بە دابونەریتی خراپ، ترسانی پیاو لە ژن و بە پێچەوانەوە، ڕەخنە لە پیسی و ڕەچاونەکردنی پاکوخاوێنی و تەندروستی، ڕەخنە لەو کەسانەی پشت بە شێخ و گۆڕی پیاوچاکان دەبەستن و بڕوایان بە پزیشک و زانست نییە، ڕەخنە لە نەبوونی بیری بازرگانی و زاڵبوونی بیری کۆنی دواکەوتوویی، ڕەخنەگرتن لە نەبوونی بیری برەودان بە گەشتوگوزار، ڕەخنە لە یاسا بە گشتی و یاسای عەشایر کە ئەوکاتە پەیڕەوی لێ کراوە و بە پێویست زانینی کارکردن بە یاسای مەدەنی و تێپەڕاندنی  قۆناغی عەشایریی و خێڵەکی لە لایەن دەوڵەتەوە. ڕەخنە لە تێنەگەیشتنی خەڵک لە ئایین و خراپ تێگەیشتن لە ئایین، ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێت کە باسی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم دەکەن و لە ڕێگای ئەم بیروباوەڕانەوە خەریکی خۆپێگەیاندن و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکن، باسی تریاککێشان و بەنگکێشان و مەیخواردنەوە دەکات و بە کارێکی خراپی دادەنێت، ڕەخنەگرتن لە دیاردەیەکی ناشرینی بەخشینی ژن لە جیاتی خوێن و...

لێرەدا ناکرێ نموونە بۆ هەموو ئەوانە بێنینەوە و بابەتەکە زۆر درێژ بکەینەوە، بەڵام ئەوەی ئەم ڕۆمانە بخوێنێتەوە هەموو ئەو دیدە ڕەخنەگرانەی تێدا دەبینێ، تەنیا چەند نموونەیەک دێنینەوە کە تیایدا ڕەخنە لە حکوومەت و لە دەسەڵاتداران دەگرێت لەوەی کە کەسی شیاو بەپێی لێهاتوویی خۆی لە شوێنی شیاو دانانرێت و دەنووسێت: «واسیتەی تەڕەقیی ئەم زەمانە، ناڕاستی و نەخوێندەواری و ساحێب پارەییە...».(٥) دواتر باسی ئەوە دەکات کە (مەئمووری تەحقیقات) واتا چاودێری لێپرسینەوە دێت و هەندێ لە پلەدارەکانی خوارەوە لە کار دوور دەخاتەوە، بەڵام ئەوانەی پلەی باڵایان هەیە و دەستی سەرەکییان لە خراپەکارییەکان هەیە، لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە، ئەمەش دیسان ڕەخنەگرتنە لەوەی کە لێپێچینەوە، تەنیا ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە پشتئەستوور نین و پلەیان زۆر باڵا نییە و فەرمانبەر و مووچەخۆری ئاساییین و لێپرسراوە گەورەکان ناگرێتەوە و ئەوان لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە.

هەروەها ڕەخنە لەو بەرپرسانە دەگرێت کە دوای ئەوەی پلەیەکیان پێ دەدرێت، هەموو شتێکی پلەدارەکەی پێش خۆیان ڕەتدەکەنەوە و دژی دەوەستنەوە، باسی ئەوە دەکات کە کاتێ دەبێتە ڕەئیسی قەزا چۆن ئەو پۆستەی وەکو هەلێک قۆزتووەتەوە: «بەبێ ئەوەی چاوم کەوتبێ بە ڕەئیسی پێشوو، بەبێ ئەوە بیناسم، لە خۆمەوە قینم لێ

هەڵگرتبوو، ئەم پرۆغرامەم بۆ خۆم دانابوو کە هەرچی ئەو کردبووی، بە عەکسی ئەو معامەلە بکەم...».(٦)

دەرەبەگەکان هەمیشە دژی ئەوە بوونە خەڵک خوێندەوار و تێگەیشتوو بێت و وا تێگەیشتوون کە جێگەی ئەوان دەگرنەوە، ئەمەش باسێکی دیکەی ڕۆمانەکەیە: «هەر وەقت چاوم بکەوتایە بە منداڵێکی مەکتەبلی کە ئەگەر ئەولادی خۆشم بوایە حەزم ئەکرد بیکوژم، چونکە وەهام موازەنە کردبوو کە ئەگەر ئەوانە گەورە ببن، وەزیفە دەست ئێمە ناکەوێت...».(٧)

ڕۆمانی (مەسەلەی ویژدان) ئەگەرچی ڕۆمانێکی کورتە، بەڵام وەکو ئاماژەمان پێ دا، نووسەر تیایدا ڕەخنە لە چەندین لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریی کۆمەڵگا دەگرێت و بە یەکێک لە دەقە گرنگەکانی سەردەمەکەی دادەنرێ کە دەسەڵاتدارانی ناوخۆ و دەرەوە، هەژار و نەداری دواکەوتوو، دیاردە دزێوەکان و... دەداتە بەر نەشتەری ڕەخنە و توانج تێگرتن.

**شڤانێ کورمانجا:**

گرنگیی نووسەری دیاری کوردی ئەرمەنستان عەرەبی شەمۆ (١٨٩٧-١٩٧٨ز) لەوەدایە کە لە ناو کۆمەڵگایەکی زۆر دواکەوتوو گەورە بووە و دواتر بووەتە نووسەر و ڕۆشنبیرێکی دیاری کورد، تەنانەت وەکو دکتۆر مارف خەزنەدار دەڵێت:» لەناو کوردەکانی ئەرمەنستان قسەیەک هەیە دەڵێن: لە پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ تاکەکەسێک خوێندن و نووسینی زانیوە، ئەویش عەرەبی شەمۆ بووە. ئەو پێی وایە کە ئەم قسەیە ورد نییە، بەڵام نزیکە لە ڕاستییەوە و عەرەبی شەمۆ بە لایەنی کەم یەکێکە لە خوێندەوارە یەکەم و دیارەکانی ئەو کات و سەردەمە(٨). کەسێکیش لە بارودۆخێکی لەم شێوەیە گەورە بێت و دەست بۆ نووسین ببات، مایەی تێڕامان و پێزانینە، بێگومانیش کە دەست دەکات بە نووسین، لەژێر کاریگەریی ئەو ئەدەبیات و فەرهەنگەیە کە دەستی پێ ڕادەگات، بۆ ئەویش تەنیا کولتوور و فەرهەنگی یەکێتیی سۆڤییەتی ئەوکات هەبووە دەستی پێی بگات و بکەوێتە ژێر کاریگەرییان. «لە ساڵی ١٩٢١ەوە زۆربەی هەرە زۆری ئەدەبیاتی سۆڤییەتی لە بازنەی شەرح و شرۆڤەی سەربوردی شۆڕش و خەباتی خەڵکیدا دەسووڕایەوە، ئەم بەرهەمانە شێوازێکی تایبەتییان نەبوو، بەشێوەیەکی گشتی زادەی سۆز و گوزارشت بوون و بە جۆرێکی شپرزە دەنووسران، لە ساڵی ١٩٢٤ەوە (ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی) بەشێوەیەکی تازە دەستیپێکرد و نووسەران پەییان بە گرنگیی کار لەناو کۆمەڵگەی خۆیاندا برد و ئیدی ئەو ڕێگەیان گرتەبەر کە لە بەردەمیاندا بوو.»(٩)

(عەرەبی شەمۆ)ش بە هەمان شێوە و بەپێی ڕوانینەکانی خۆی، لەژێر کاریگەریی

ئەدەبیاتی ئەو کاتی ڕووسیا ڕۆمانەکەی دادەڕێژێت. هەربۆیە ئەم ڕۆمانە ڕەنگدانەوەی ژیان و گوزەرانی کوردانی قەفقاس و بەتایبەتییش ئەرمەنستانە، ژیانی خێڵەکی و کۆچەریبوونی کوردەکان دەخاتەڕوو، کە بە چ کوللەمەرگییەک ژیانی خۆیان بەسەر دەبەن، جیاوازییە چینایەتییەکان دەخاتە بەرباس و ئەوە دەخاتەڕوو کە خەڵکی هەژار و لێقەوماوی ئەو کات چۆن بەدەست ئاغا و دەرەبەگەکان دەچەوسێنرانەوە.

لەلایەکی دیکە ڕەخنە لە دیاردە خراپەکانی وەکو شیربایی و ئیرەیی پێ بردن و چەند دیاردەیەکی دیکەی دزێوی ناو کۆمەڵگا دەگرێت. تەنانەت عەرەبی شەمۆ ڕەخنە لە شتێک دەگرێ کە تا ئێستاش لەناو کورد وەکو جۆرێک لە پیرۆزیی سەیر دەکرێت، ئەویش ڕەخنەگرتنە لە پشتبەستن بە چیاکان، ئەو نەک نایەوێ کورد پشت بە چیاکان ببەستێ، بەڵکو چیاکان بە دوژمنی کوردیش دەزانێ: «دووهەمین دوژمنی ئێمە کێوەکانن، -بە قامک ئالاگۆزی پیشان دا- بەڵێ بەڵێ ئاوا سەیری من مەکەن، ئالاگۆز هەم بەخێوتان دەکات و هەم دوژمنتانە، ئالاگۆز وەکو دایکێکی ناژیر منداڵەکەی ناسکۆڵە بار دێنێ، فێری کاری ناکات و پاشانیش هەر لەبەر ئەو کارنەزانینە بە سەختی سزای دەدات، ئەو کوردی نازپەروەردە و فێری تەمبەڵی کرد، کورد تەنیا کاتێک بەفر دەبارێ و برێ لە مێگەل دەمرێ، وەبیر کشتوکاڵ دەکەوێ، ئەگەر کوردەکان لە شوێنێک جێگیر بایەن، لەسەر زەوی بایەن باشتر دەبوو، دەیانزانی پێویستە تفاق بۆ زستانی ئاژەڵەکان پاشەکەوت بکرێ و لەبەر ئەوەش زەوییان دەکێلا و تۆیان لێ دەچاند و دروێنەیان دەکرد، بەڵام هەر جارێ لە شوێنێک جێگیر دەبن و پاش ماوەیەک ئەم شوێنە بەجێدەهێڵن و دەڕۆن، زستان لەبەر بێ ئاوی بە کوێرەوەری بەسەر دەبەن، ئێوە بۆ خۆتان و منداڵەکانتان هەر لەبەر ئەم کۆچەرایەتییە نەخوێندەوارن، ئەگەر ئێوە لە شوێنێکدا سەقامگیر بایەن، لەوێ قوتابخانەی لێ دەبوو، ژیانی بەتەواوی لە چەشنێکی دیکە بوو...».(١٠)

جێی تێڕامانە کە عەرەبی شەمۆ لە ڕێگای ئەم ڕۆمانەوە کار لەسەر دوو شت دەکات، ئەو دوو شتەش هەردووکیان لای کورد بەهادار و خۆشەویستن و هەمیشە بە چاوێکی پیرۆز سەیر کراون، ئەوانیش: چیاکان و ژیانی کۆچەرییە. ژیانی کۆچەری و کوێستان و گەرمیان لە کۆنەوە لەناو کورددا هەبووە و بەها و نرخی خۆی هەبووە، بەڵام عەرەبی شەمۆ ئەمە بە کارێکی خراپ دادەنێت و پێیوایە دوورکەوتنەوەیە لە شارستانییەت و شارنشینی، بە هۆی ئەم گەڕان و سووڕانە هاوینی و زستانییەوە، پێ ڕاناگەن شارستانییەت دامەزرێنن و وەکو گەلانی دیکە پەرە بە لایەنی کولتووری و فەرهەنگی و زانست و خوێندەواری و... زۆر شتی دیکە بدەن. هەروەکو دەشیەوێ ئەوە بسەلمێنێ کە لە زۆر کات و هەڵوێستدا چیاکان ئەو پاڵپشتییە نین ئەوەی چاوەڕوانییان لێ دەکرێت، بەتایبەتییش ئەگەر میللەت پاڵپشتیی یەکتر نەبێت و هەوڵی بەرەوپێشچوونی

خۆی لە هەموو لایەنێک نەدات، ئەمە لە کاتێکدایە کە لە کۆنەوە ئەم وتەیە لەناو کورد باوە کە «جگە لە چیاکان، کورد هیچ دۆستێکی نییە».

کەواتە لە هەردوو ڕۆمانەکەدا هەست بەوە دەکرێت کە لە هەندێ شوێندا هاوشێوەییەک هەیە، واتا سەرەڕای جیاوازیی جوگرافی و دابەشکارییەکان، هێشتا کۆمەڵگای کوردی هەندێ خاڵی هاوبەشی تێدابووە، ئەویش بەداخەوە بە لایەنە خراپەکەیدا، بۆ نموونە مەسەلەکانی شیربایی و جیاوازیی چینایەتی و هەژاری و چەوسانەوەی خەڵک لەلایەن دەرەبەگ و دەسەڵاتداران و... هەروەها هەردووکیش لەم لایەنەوە زۆر گرنگن کە دیدی ڕەخنەیین و دەچنە چوارچێوەی هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی کۆمەڵگا و دەسەڵاتداران.

لێرەوە من پێموایە ئەگەر ئەم ڕۆمانە ڕەخنەییانەی کورد، کە سەرەتا و هەنگاوی یەکەمی ڕۆمانی کوردیین، لەبەرچاو بگیرابان و وەکو چۆن کورد وەک پاڵپشتێکی ماددی شانازیی بە چیاکانی دەکات، ئاواش وەکو پاڵپشتی کولتووری و فەرهەنگی پشتی بەم دوو ڕۆمانەی سەرەتای بەستبا و دەسەڵاتدار و مونەوەر و دەستڕۆیشتووان و تەنانەت کۆمەڵگای کوردییش لەبەرچاویان گرتبان، کۆمەڵگای کوردی جۆرێکی دیکە دەبوو.

### سەرچاوە و پەراوێزەکان


١- الرواية والمجتمع- علاء الدين محمود، موقع: صحيفة الخليج.

٢- ڕۆمان، ژانری تەکنیکە جوانەکان و ڕەگەزە فرەڕەهەندەکان- عەلی عوسمان یاقووب، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠١٩، ل٢٥٩.

٣- هەمان سەرچاوە، ل٢٦٢.

٤- هونەری ڕۆمان، مێژوو، خوێندنەوە، بەردەوامی- سەنگەر زراری، چ١، لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر، ٢٠١٨، ل٩٥ بەدواوە.

٥- مەسەلەی ویژدان، یان چۆن بووم بە خانەدان- ئەحمەدموختار جاف، پێشەکی و لێکۆڵینەوە: دکتۆر ئیحسان فوئاد، چ٢، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠٨، ل٣٧.

٦- مەسەلەی ویژدان، ل٤٠.

٧- مەسەلەی ویژدان..ل٤١.

٨- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم (١٩٤٥-١٩٧٥)- دوکتۆر مارف خەزنەدار، چ٢، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠١٠.

٩- قوتابخانە ئەدەبییەکان – نووسینی: ڕەزا سەید حسێنی، و: حەمەکەریم عارف، چ١، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، ٢٠٠٦، ل١١٢.

١٠- شوانی کورد- نووسینی: عەرەبی شەمۆ، وەرگێڕانی: کامەران ئەمین ئاوە – کۆمەڵگای فەرهەنگیی ئەحمەدی خانی، چ١، ٢٠٢٠، ل٢١٨.



عەبدولکەریم فەتاح

# سەرنجێك لە ڕۆمان و ڕۆماننووس

ڕۆمان لای من ئاوێنەی ژیانە، ژیان جوانی و ناشیرینییەکانی خۆی لە ڕووپەڕی ئاوێنەی ڕۆماندا نمایش دەکات، بۆیە بە بەرینی ژیان بەرینە و هەموو ڕەهەند و ڕووەکان نیشان دەدات. دەکرێ لە خاڵ و لە چەقێکەوە ڕۆمانەکە سەرهەڵبدات، وەلێ ناکۆتا بازنە بەدەوری ئەو چەقەدا دروست دەبێت، تا هەموو ژیان لەئامێز دەگرێت، خاڵی دەستپێکی ڕۆمان هەڵدانی بەردێکە بۆ ناو دەریایەک، شڵەژان دەخولقێنێ و ناکۆتا بازنە بەدەوریدا ڕەنگ دەگرن، دەریاکە ژیانە و بەردەکە بیر و ئازار و خەمی ڕۆماننووس و شەپۆلەکان دیمەنە هەمەڕەنگەکانی شاکارەکە.

هەندێ جار بەرزبوونەوە و بالابوون لە واقیع هێز و پێز بە ڕۆمان دەبەخشێت، بەخشینی تێریی و تەواوی بە ڕووەکان و دیمەنەکان و ڕووداوەکان هەستی خوێنەر تێر دەکات و ماناکان لای نەقش دەگرن، بۆیە خولقانی فەزا ڕۆمان لە چیرۆک جیادەکاتەوە، بەگشتی ڕۆمان پێیەکی لە زەوییە و پێیەکەی تری لە ئاسمان، ساتێک لە شەقەی باڵ دەدات و دواتر دێتەوە بۆ ناو یەخسیربوون لە واقیعدا، بالا دەبێت و دەگاتە لوتکە و بەردەبێتەوە و دێتەوە بۆ پەستترین خاڵ، ئەم جووڵە شەپۆلئامێزەی ڕۆمان ڕۆحی خوێنەر دەخاتە لەرە و باڵەتەپێ، هەر ئەم نهێنییەیە خوێنەر ناتوانێ لە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە داببڕێت.

بەر لە خوێنەری ڕۆمان ڕۆمانووس دەگری، پێدەکەنێ، ئازار دەچێژێ و خۆشی وەردەگرێ، سەرکەوتن بەدەستدەهێنێ و شکست دەخوات، ئەو لەگەڵ وشە بە وشە و دێڕ بە دێڕی ڕۆمانەکەی خۆی کارلێکی کردووە، بەڵکو وشە و دێڕەکان لای ئەو زیندوون و گیانیان لەبەردایە، بۆیە زۆرجار بۆ ئاسوودەکردنی ڕۆحی خۆ ڕۆمانووس دەگەڕێتەوە بۆ خوێندنەوەی دیمەنێک یان چەند دیمەنێک لە ڕۆمانەکەی.

ئەرکی ڕۆماننووس لە ئەرکی وێنەگر و وێنەکێش دەچێت، ئەو دیمەنەکان وەک خۆیان دەگوێزێتەوە، بێلایەنە لە جوانی و ناشیرینییەکان، کە دەڵێم بێلایەنە مەبەستم بێلایەنە لە گواستنەوەی شەڕەنگێزیی و دزێوییەکان، نەک جوان و ناشیرین، دادپەروەریی و ستەم، شەڕەنگێزی و مۆراڵ، بەزەیی و توندوتیژی لای ئەو یەکسان بن، وەلێ پۆشاکی ڕەوایی ناکات بە بەر نادادیدا، ڕووی میهر و جوانی دزێو ناکات، ستەم وەک خۆی وێنا دەکات، تەنانەت پاساوی ئەوانە دەخاتە ڕوو بە کاری ستەمکاری هەڵدەستن، لە یەک دیدگاوە پێناسەی باش و جوان ناکات، بەڵکو باش و جوان لە دیدگای مرۆڤەکانەوە دەبینێت.

بەر لە نووسینی ڕۆمان تەکان و گواستنەوەیەک ڕوو لە ڕۆماننووس دەکات، دەکرێ بالابوونێک بێت لە ڕۆحدا، یان گەستن و ئازارێکی ناخ و دەروون بێت، دەکرێ کاریگەربوون بێت بە دیمەن و ڕوداوێ، خوێندنەوەیە بێت بۆ ڕۆمانێ لای ئەو تەواو نەکرابێت، خۆشەویستی و سۆزێک بێت کانیاوی ناخی تەقاندبێ، مرۆڤی خاڵی ڕۆمانی پێ نانوسرێ، تەنها ئەوانە ڕۆماننووسن پڕبوونێک، پەنگخواردنەوەیەک، دڵ و بیری داگیر کردوون.

هەندێ جار ڕۆماننووس بەسەر ڕۆمانێکی شکستخواردوودا دەکەوێت، هۆی شکستەکەی خاڵی بوون نییە، بەڵکو ئەو لێوانلێوە لە مانای جوان و بالا، بەلام زمانی پێنووسەکەی کۆڵ و نارەوانە، توانای نییە کالای وشە بکات بە بالای ماناداا، ناتوانێ ئاوی سازگاری مانا شیرینەکان بە جۆگەلەی وشەکاندا جاری بکات، ئەمەش بۆ کەمی نووسین و هەژاری زمان و وشە دەگەڕێتەوە، ئەو نەیتوانیوە بە نووسینی بەردەوام بیر

و ناخی خۆی هەڵبکۆڵێت، بۆ گەیشتن بە سەرچاوەی ئاو شوێنی تەڕیی کەوتووە، بەڵام نەیتوانیوە خۆڵ و قوڕ و لیتە ببڕێت و بگاتە سەرچاوەیەکی ڕۆشن.

بەپێچەوانەشەوە کەسێک بەرهەمی فرەیی نووسین زمانی قەڵەمەکەی ڕەوان دەبێت، وەلێ خاڵییە لە مانا و ئەزموون، ئەم جۆرە ڕۆمانەش دیسان ڕۆمانی شکستخواردووە، چونکە تەنها ڕیزکردن و کەڵەکە کردنی وشەیە، بەبێ گواستنەوەی مانای قوڵ و دیمەنی قەشەنگ و هەستی باڵا و سەرکوتانە ناو پەنهان و جیهانە تەماوییەکان و پەردەلادان لەسەر پەی پێ نەبراوەکان، زۆرجار ڕۆماننووسی لاو لە نووسینی ڕۆمان ڕووبەڕووی ئەم جۆرە ئەزموونە دەبێتەوە، چونکە تەمەن کاریگەری هەیە لە پڕبوونی مرۆڤ، بەتایبەت تەمەنی ئەو مرۆڤانەی باڵا لە ژیان دەڕوانن.

نابێ ئەو ڕاستییەش بشارینەوە هەر ڕۆمانێک بووبێت بە شاکارێکی جیهانی بەسەر چەندین ڕۆمانی شکستخواردوودا هەنگاوی هەڵگرتووە، ڕۆمانی شکستخواردووی هەمان ڕۆماننووس، دەکرێ شکستەکانی پێشوو تەکانێ بێت، گەستنێ بێت بۆ ناخی، قوڵپەیەک بێت کانیاوێکی پێ جاری ببێت.

کەسی ڕۆماننووس بەردەوام لە خوێندنەوەی ڕۆماندایە، ڕۆمانی نووسراو بێت، یان ڕۆمانی بینراو، لەسەر شاشەیەک بێت، یان لە واقیعی ژیان، هەموو خوێندنەوەی ڕۆمانێ چۆڕانی کۆمەڵێک مانایە بۆ ناخی خوێنەر(ڕۆماننووس)، مەرج نییە کاتێک دەست بۆ نووسینی ڕۆمان دەبات هەمان ئەو دیمەن و ڕووداو و وشانە-بە کەمێک گۆڕانەوە- دابڕێژێتەوە، بەڵکو لای ئەو ماناکان ڕۆحن، دەکرێ بچنە جەستەی مرۆڤێک یان پەیکەری گیانداری، دەکرێ بەهارێک برەخسێنن، بەزەییەک نمایش بکەن، خۆشەویستییەک ببەخشن، لەوانەش نێڵەی ئازارێ بدەن، لە ڕوخساری ناپاکێکدا ڕەنگبدەنەوە، تەمی ڕەشبینی بەسەر ناخدا بکێشن.

ڕۆمان بەیەک تەکان نانوسرێ، ڕاستە لە پێناسەی ڕۆماندا وتراوە: چیرۆکێکی درێژ و بەرینە، وەلێ هۆنراوە نییە شاعیر بەیەک جار بیچۆڕێنێتە سەر لاپەڕەیەک، یان چەند لاپەڕەیە، کورتە چیرۆکێ نییە سەرەتا و لوتکە و کۆتاییەکەی لەناو زەیندا ڕەنگی گرتبێت، بۆیە نووسینی ڕۆمان پانتاییەک لە زەمەن داگیر دەکات، ڕۆماننووس تیایدا وەک «پاڵە»کانی شارە هەنگە، نەختە نەختە بینای شانە هەنگوینەکانی ناو ڕۆمانەکە دەکات، پاڵەکانی شارە هەنگ لە کارەکەیان پەلە ناکەن، لەگەڵ ئەوەش بەردەوامن و دانابڕێن لە کارەکە، لە دوای نووسینی بەشێک لە ڕۆمانەکە دابڕانی دوور و درێژ لە نووسین و تەواوکردن فەزای ڕۆمانەکە دەگۆڕێت، چونکە زمانی ڕۆمانەکە گۆڕانی بەسەردا دێت، خوێنەر هەست ناکات یەک ڕۆمان دەخوێنێتەوە، بەڵکو هەست بە خوێندنەوەی چەند ڕۆمانێک دەکات، ئەمەش بۆ دوورکەوتنەوەی ڕۆماننووس دەگەڕێتەوە لەو فەزایەی

یەکەمجار بەشێک لە ڕۆمانەکەی تێدا نووسیوە.

هەندێ جار ڕۆمان بەسەر ڕۆماننووسدا زاڵ دەبێت و ڕۆمان دەبێتە بکەر و ڕۆماننووس بەرکار، ڕۆمان کارا و ڕۆماننووس پاسیڤ، ئەمەش سەردەکێشێ بۆ نەکوژانەوەی گڕی ڕۆمانەکە، واتە ڕۆماننووس نازانێ کەی و چۆن و لە کوێدا ڕۆمانەکە بە لوتکە بگەیەنێ و چۆن کۆتایی پێبهێنێ، ئەم پاسیڤبوونەی ڕۆماننووس بۆ نەبوونی نەخشەڕێگەیەک دەگەڕێتەوە هەنگاوەکانی نووسینی ڕۆمانەکەی لەسەر هەڵبگرێت، بزانێ ئاڕاستەی ڕۆمانەکە بۆ کوێیە، شا ڕێگەکە بزر نەکات و شوێنی توولە ڕێگەکانی ناو ڕۆمانەکە نەکەوێت، چونکە هەریەک لەو توولە ڕێیانە توولەڕێی تری بەدوادا دێت و ڕۆماننووس تووشی سەرگەردانی دەکات و ناتوانێت بگەڕێتەوە سەر شا ڕێگەکە، ئەمەش بریتییە لە بزربوون و نغرۆبوون لە ڕۆماندا، هەڵبەت ئەم قسەمان ئەوە ناگەیەنێت ڕۆمان درێژ نەکرێتەوە، چونکە دەکرێت ڕۆمان چەند بەرگێک بێت، قسەکەی ئێمە بۆ ئەو جێگەیە گرنکە چنین لە ڕۆماندا هەبێت، پێش و دوا لەگەڵ یەکتر هەماهەنگ بن، سەرئەنجامەکان ڕوون بن، تەواوکاری لە نێوان دیمەنەکان و ڕووداوەکان هەبێت، ئەوەی دەگیرێتەبەر خزمەت کردن بێت بە هێڵی پانی ناو ڕۆمانەکە.

> **ئەرکی ڕۆماننووس لە ئەرکی وێنەگر و وێنەکێش دەچێت، ئەو دیمەنەکان وەك خۆیان دەگوێزێتەوە، بێلایەنە لە جوانی و ناشیرینییەکان**

ڕۆماننووس کیمیاگەرە و لە کانزاکان زێڕ بەرهەم دەهێنێ، جادووگەرە و بە سەد زمان قسە دەکات، ناکرێت قسەکردن لەسەر زمانی مێیەک وەک قسەکردن بێت لەسەر زمانی نێر، نابێ قسەکانی گوندنشینێک لەگەڵ قسەکانی شارنشینێک وەک یەک بن، گونجاو نییە زمانی منداڵ لە زمانی گەورە بچێت، گفتوگۆی چەتەکان جیاوازە لە کۆڕی هونەرمەندان، وشەکانی پیاوێکی ئایینی لە فەرهەنگی ئایین وەردەگیرێن، لەکاتێکدا دەربڕینەکانی ڕۆشنبیرێکی سیکولار فەرهەنگی تایبەت بەخۆی هەیە، ڕۆماننووس هەموو ئەم زمانانە دەزانێت، بەڵکو تیایاندا قووڵ دەبێتەوە، بە ئەندازەیەک باڵادەستە گومان ببرێت ڕۆمانووس ئەو کاراکتەرەی ناو ڕۆمانەکە بێت ڕۆڵ دەبینێت، بۆیە جارێ تۆمەتی کۆنە دز دەدرێتە پاڵی و جارێکی تر زانا و عاریفێک.

هەندێ جار کارەکتەری زۆری ناو ڕۆمان نیشانەی لاوازی ڕۆمانە، ئەمە کاتێک ڕۆماننووس ناتوانێ بۆ کارەکتەرە سەرەکییەکان ڕووداو بخولقێنێ، یان ناتوانێ لە پەرەسەندنی ئەوانەوە پەرە بە ڕۆمانەکە بدات، ئەم دەستەوسانییە ناچاری دەکات بە هێنانی کارەکتەری نوێ تاکو ڕوداوی نوێیان لێوە بخولقێنێ، لە دەستەکەی ترەوە دەکرێت هێنانی کارەکتەری نوێ نیشانەی بەهێزی ڕۆمان بێت، ئەمە لەکاتێکدا ڕۆمانەکە بە سروشتی گەورە دەبێت و پانتایی بەرینتر داگیردەکات و کەسایەتی تر سەرهەڵدەدات، جیاکاری نێوان ئەم دوو گەورەبوونە زۆر هەستیارە و ڕۆماننووسی بە سەلیقە لە یەکتریان جیادەکاتەوە.

ڕۆماننووسی بەتوانا کەسێکە دەتوانێ لە ڕووداوێکەوە ڕۆمانێک بنووسێ، وەک کورتە ڕۆمانی «پیرەمێرد و زەریا»ی هیمینگوای، دەتوانێ لە یەک دیمەنەوە مێژووی نەتەوەیەک بخوێنێتەوە، وەک ڕۆمانی «چاوەکانی» بوزرگی عەلەوی، لە توانایدایە ئایدۆلۆژیایەک بخاتە بیر و ناخ بێ ئەوەی خوێنەر بە خۆی بزانێت، وەک ڕۆمانی «دایک»ی مەکسیم گۆرکی، ڕۆماننووسی باڵادەست دەتوانێ چەندین ساڵ لە قەڵایەکدا مرۆڤێ بە وەهم و خەیاڵەوە بژێنێت و درێژە بە ڕۆمانەکە بدات و خوێنەر پڕ بکات لە پووچی و نائومێدی، وەک ڕۆمانی «سەحرای تاتاران»ی دینۆ بۆتزانی.





سالم حاجی

# خوێندنەوەیەك بۆ ڕۆمانی سەبا:
## وێنایەکی کۆمەڵایەتی و تراژیدیاییەکی کەسی

ڕۆمانی سەبا تاکە هەوڵی چاپکراوی مامۆستای کۆچکردوو عەلی سالح میرانە لە بواری ڕۆماندا.. کە لە ساڵی ٢٠١٥ بە چاپی گەیاندووە لە دوو تۆی ٣٧٤ لاپەڕەی قەبارە مامناوەند.. ئەم ڕۆمانە سەر بە قوتابخانەی ڕیالیزمە لە ئەدەبیات، ئەو قوتابخانەیەی کە گرنگی تەواو دەدات بە وێناکردنەوەی واقیع وەکو خۆی و، لەو ڕێیەوە هەوڵی دەستنیشانکردنی کەموکوڕییەکان و دروستکردنی گۆڕانکاری دەدات.. کارەکتەرانی سەرەکی ئەم ڕۆمانە، کە لە ٤٦ پارت پێکدێت، چەند کەسایەتێکی سەرەکین، ئەوانیش:

- سەبا، کچە شۆخێکی دێی (زینێ) لە دەشتی خۆشناوەتی، کە لە بەهاری تەمەنیدایە.
- سمکۆ، یار و هاودەمی سەبا.
- مامۆستا خۆشەوەی: مامۆستا لە قوتابخانەی دێی (زینێ).
- شەرمین خان: مامۆستا لە هەمان قوتابخانە و هاوسەری خۆشەوی.
- ئەحمەدی خۆرشیدی: هاوسەری سەپێنراو بەسەر سەبا هەر لە تەمەنی منداڵییەوە، بەهۆی دابونەریتی ژن بە ژنە.
- عەزیزی سەرسپی: هاوسەری دووەمی سەبا.
- چیمەن: هاوسەری یەکەمی عەزیزی سەرسپی و هەوێی سەبا.
- لە گەڵ چەندین کەسایەتی تر...

ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستەم لە کوردستانی عێراق و لە دەڤەری خۆشناوەتی ڕوویانداوە و هەوڵی وێناکردنی ساتەکانی ژیانی ئەو خەڵکە دەدات لە ڕێی ئەو چەند کارەکتەرە و، بەدیاریکراوی لە ساڵانی١٩٨٧- ١٩٨٩دا..

هەڵبەت ناوی شوێن و کارەکتەرانی ڕۆمانەکەش هەمووی زادەی خەیاڵی نوسەرن و، ڕەنگە هەندێ لە ڕووداوەکان بەواقیعی ڕوویدابن یان نووسەر لە نزیکەوە ئاگاداریان بێت و تێکەڵ بە خەیاڵ کراون.. نووسەر هەوڵیداوە لەم ڕۆمانەدا وێنەیەکی واقیعی ژیانی ئافرەتی کورد لەو ساتەدا بخاتە ڕوو لە ڕێی کارەکتەری سەرەکی ئەم ڕۆمانە و، لە ڕێی ئەویشەوە چەندین پرس و ڕووداوی مێژوویی خستۆتە ڕوو.. بۆیە ئێمە هەوڵ دەدەین خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە لە چەند ڕەهەندێکەوە بکەین:

### کێشەکانی ئافرەت لە ڕۆمانی سەبادا:

دەتوانین بڵێین کە سێ کارەکتەری سەرەکی ئافرەت لەم ڕۆمانەدا ڕۆڵ دەگێڕن، ئەوانیش: سەبا، مامۆستا شەرمین و چیمەن (= هەوێی سەبا). لەگەڵ چەندین کارەکتەری تری لاوەکی. ئەم سێ کارەکتەرەش دووانیان دیسان (= مامۆستا شەرمین، چیمەن) هەر خزمەتی کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە دەکەن و زیاتر ڕۆڵی بەرجەستە و بە دیار دەخەن. سەبا کچێکی لادێیە و هەر لە منداڵییەوە لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە بە شوو درا بوو لە بری ژنهێنانی برا گەورەکەی، گرێی ڕۆمانەکە لەم مەسەلەیەوە دەستپێدەکات و لەسەری بنیات دەنرێت..

سەبا زڕ دایکی هەیە و دایکی خۆی هەر لە منداڵییەوە مردووە، کە گەورە دەبێت و ئاگای لە خۆی دەبێت دەبینێت کە بە شوو دراوە و ژنی کەسێکە کە نەیبینیوە و نایناسێت و تەنها دەزانێت ناوی (ئەحمەدی خۆرشیدی)یە و، دەکاتە برای ژنبرای ئەو، کە کاتی خۆی ژن بە ژنی پێوە کراوە..

سەبا لە تافی لاوێتی خۆیدایە و زۆر جوانە و، ئێستا کە گەورە بووە هیچ دڵی بۆ مێردە بەسەر سەپێنراوەکەی لێنادات و حەزی لێ نییە.. بەتایبەتی کە بە شەو و ڕۆژ گوێی لێیە ژنان و خەڵکی دێیەکەیان بە خراپی باسی کەسایەتی و ئاکاری ئەو مێردەی دەکەن (= ئەحمەدی خۆرشیدی).. لە ڕۆمانەکەدا بەم شێوەیە وێنای کەسایەتی کراوە:( زۆرجاریش سەبا ناهەقی نەبوو.. خەڵکی ئەوەندە باسی نارێکی خۆی و ماڵی (ئەحمەدی خورشید)یان بۆ کردبوو، کە پیاوکوژێکی بێڕەحمە و خاوەنی ژنێکی دیکەیە و، چەندە ناکۆکە لەگەڵ ماڵ و خێزانی ئێستای و چەندە زوڵمیان لێ دەکات، بۆیە بەردەوام بیری لە بەختی ڕەشی خۆی دەکردەوە و نەفرەتی لەو ڕۆژە دەکرد کە بە منداڵی ژن بە ژنی پێکراوە) (لاپەڕە ٩).

هەروەها لەسەر زمانی مامۆستا خۆشەوی ئاوا باسی ئەحمەدی خۆرشیدی دەکرێت: (هەموومان باش (ئەحمەدی خورشیدی) دەناسین، کە چەندە بێویژدان و لە خوا نەترسە، لاری نییە سەد کەس بۆ ئارەزووی و مەرامێکی گڵاوی خۆی خەڵتانی خوێن بکات) (لا ٢٥).

واتە سەبا کە خۆی دەزانێ کە هەر لە تەمەنی پێنج ساڵییەوە بە شوو دراوە و، مێردەکەشی کەسایەتییەکی بەم شێوەیەیە کە وێناکراوە، هیچ حەزێکی بۆ ئەو مێردەی نابێت، بەتایبەتی کە ئەو مێردەی خاوەنی ژنی ترە و منداڵیشی لێی هەیە.. بۆیە دەکەوێتە داوی خۆشەویستی لەگەڵ کوڕێکی هاوگوندی خۆیان و، پێکەوە تەکبیری ئەوە دەکەن کە بەر لەم بەشوودانە بگرن و ڕزگاری بێت لێی.. بەڵام سەرکەوتوو نابن و سەبا دەگوازرێتەوە بۆ مێردەکەی (ئەحمەدی خۆرشیدی).. ئەم کارەکتەرە (ئەحمەدی خۆرشیدی) کەسێکی نەخوێندەوارە، بەڵام دەوڵەمەند و سەرۆک جاشە و پیاوی حکومەتە.. بۆیە کە دەزانێت و ئاگای لێیە کە سەبا خۆشی ناوێت و دەستی تێکەڵکردووە لەگەڵ کەسی تر، سوێند دەخوات کە هەر بیهێنێت ئەگەر بۆ ڕۆژێکیش بێت و دوایی بەرەڵای دەکات و تۆڵەی لێدەکاتەوە و.. هەر واشدەکات و.. دوای گواستنەوەی لای خۆی ناهێڵێت و هەر زوو دەینێرێتەوە بۆ ماڵی باوکی و، ئیتر لێی ناپرسێتەوە..

(سمکۆ) کە خۆشەویستی سەبایە و زۆر هەوڵیدا ڕێگری بکات لەم بەشوودانەی سەبا و، تەنانەت هەوڵی کوشتنی ئەحمەدی خۆرشیدیش دەدا، ئێستا و دوای ئەوەی سەبا گەڕایەوە دێیەکە و ئەحمەدی خۆرشیدی دەستی لێ بەرداوە، هەر سووورە لەسەر ئەوەی بگات بە سەبا و ژیانێکی پێکەوەیی و ئاسوودە بۆ خۆیان بنیات بنێن.. بۆیە لەگەڵ سەبا تەکبیری ئەوەی دەکەن کە پێکەوە لە دێیەکە دەربچن و خۆیان داڵدەی لای شێخ عوبێد بکەن، کە کەسایەتییەکی ناسراوە لە شاری (هەولێر) و، لە هەمانکاتدا دەکاتە باوکی مامۆستا خۆشەوی.. و لەوێوە هەوڵی سوڵحی عەشایری بدەن لەگەڵ ئەحمەدی خۆرشیدی.. بەڵام ئەحمەدی خۆرشیدی سەرەڕای ئەوەی کە کەسوکاری سمکۆ زۆر تەنازوولی بۆ دەکەن و، دوو کچی خۆیان دەدەن پێی لەبری سەبا، هەر ڕازی نابێت دەستبەرداری سەبا بێت..

سەرئەنجام و لە ترسی دەستگیرکردنی سمکۆ لە ماڵی شێخ، چونکە فیراری سەربازییە، پێشنیازی ئەوەی بۆ دەکەن کە ببێتە جاش و لەگەڵ یەکێک لە سەرۆک جاشەکان ڕێککەوێ و ماوەیەک لەگەڵ ئەوان بێت.. دواتر بەم هۆیەشەوە و لە هێرشێکی هێزێکی پێشمەرگە بۆ سەر ڕەبیەکانی جاشەکان، سمکۆ لەگەڵ چەند جاشێکی تر دەستگیر دەکرێن و، ئیتر سمکۆ دوای ئەوە نەگەڕاوە و ئاسەواری دیار نەما (ئەمەش لە ڕۆمانەکە بەهۆی ناکۆکی نێوان حیزبە کوردییە شۆڕشگێڕەکان لێکدرایەوە).. دوای زیاتر لە ساڵێک لە سەرنگومکردنەوەی سمکۆ و ژیانی سەبا لە ماڵی مامۆستا خۆشەویی و شەرمین خان (کە پرۆسەی هاوسەرگیرییان کردووە)، کەسێک دێتە داخوازی سەبا، کە ژنەکەی تەڵاقداوە و خاوەنی دوو کچە لێی.. سەباش ڕازی دەبێت و دەبێتە هاوسەری (عەزیزی سەرسپی)، کە خاوەن دوکانێکە لە نزیک ماڵی مامۆستا خۆشەوی..

سەرئەنجام و دوای ئەوەی عەزیز لەژێر هەڕەشەی کەسوکاری ژنی یەکەمیەوە ناچار دەبێت ژنی یەکەمی بگەڕێنێتەوە، ئیتر تراژیدیای ژیانی سەبا قووڵتر دەبێت و کۆتاییەکەی بە مەرگی تەواو دەبێت..

ژیانی سەبا لەم ڕۆمانەدا تیشک دەخاتە سەر چەندین دەرد و بەڵای کۆمەڵایەتی کە ئەوسا زۆر باوبووە و، ئێستاش هەر ماوە، بەتایبەتی لە شوێنە دوورە دەستەکان و دووری شارە گەورەکان.. لەوانەش:

١- مەسەلەی ژن بە ژن پێدانی کچان و، بە شوودانیان بەبێ خواست و تەنانەت بێ ئاگایی خۆیان هەر لە تەمەنی منداڵیدا.. و ئاسەواری ئەم دیاردەیە لەسەر ژیانی ئەو کچانە و لەسەر ژیانی کەسوکاریان..

٢- مەسەلەی پاکیزەیی ئافرەت لەکاتی گواستنەوەیدا و بەربوونی خوێن لێیەوە وەکو بەڵگەی دەرخەری ئەو ڕاستییە لە شەوی بووکینیدا و، ئەگەر ئەو خۆێنە نەبینرا بەواتای ناپاکیزەیی ئەو ئافرەتەیە و زۆرجار کۆتایی بە تەڵاقدانی تەواو دەبێت، یان تەنانەت کوشتنی لەلایەن کوسوکارییەوە.. لەم دیمەنەی ڕۆمانەکە ئەوە دەبینین: (بەڵام شەوی بوکێنییەکەیی و ڕەفتاری مێردەکەی بەپێچەوانەی هەموو لێکدانەوە و بۆچونەکانی بوو، ئاخر قەت باوەڕی نەدەکرد پیاوێک هەبێ و بەرامبەر ژن ئەوەندە دڕندە بێت، ئەو پیاوەش مێردی بێت و باوکی منداڵەکانی دواڕۆژی بێت.. ئای ئەو شەوە چەندە ناخۆش بوو...)

((هەر ئەوەندەی زانی، پیاوێکی گەورەی چوارشانەی باڵا درێژی لێهاتە ژوورەوە، بێ ئەوەی تۆزقاڵێک شادی و خۆشی و نەرمونیانی بنوێنێ، بێ ئەوەی دەمانچە و خەنجەرە دەسک سپییەکەی داکەنێ، یان هەر نەبێ پشدێنەکەی بکاتەوە، بەپەلە شەرواڵەکەی داکەند و لەژێرییەوە دەرپێیە سپییەکەی کە بە دۆخێنێکی مەرەزی درێژ بەسترا بوو دەرکەوت ...

ئەو کاتەی لەسەر لێواری سیسەمەکە بە شەرمەوە دانیشت بوو و سەیری بەردەمی

خۆی دەکرد، واتدەزانی چوارگۆشەکانی سەر ڕایەخە دەستکردە تەوریزییە ڕەنگاو ڕەنگەکان دەژمێرێت... هەردوو دەستە زبرەکانی خستنە ژێر باڵی و لە شوێنی خۆی بەرزی کردەوە و فڕێیدایە سەر ئەو لبادە لاکێشە سپییەی پارچە پەڕۆیەکی سپی چوارگۆشەی لە ناوەڕاستییەوە قایم کرابوو، هێشتا زێڕ و خشلەکانیشی هەر بە سینگ و بەرۆکییەوە بوون، کاتێ بە زبریی و خێراییەکی سەیر دەستی بۆ دامێنی درێژکرد و.... - قیژەیەکی بەهێز - گەر لەبەر دەنگی دەهۆڵ و زورناکە نەبوایە، لە سەدای ئەم قیژەیەی بووکی یەکشەوە، هەموو ئەو خەڵکانەی دەرەوە ڕادەچڵەکین، تەنها چەند ژنێک نەبێت لەوانە (پوورەی بەربووک)، کە لە ژوورەکەی تەنیشتەوە لە چاوەڕوانیدا، خۆیان مات کردبوو..

> **ڕۆمانی سەبا هەرچەندە ڕۆمانێکی کۆمەڵایەتی واقیعییە، بەڵام وێنایەکی تەواوی چەند لایەنێکی شۆڕش و بەرەنگاریی سیاسی میللەتی کورد لەو سەردەمەدا وێنا دەکات.**

دوای چەند خولەکێک هەڵسایەوە و هەر لە ڕێگا خەریکی بەستنەوەی دۆخینەکەی بوو و بێئەوەی قسەیەکی لەگەڵدا بکات، دەرگای ژوورەکەی کردەوە و دەمانچە نیکلە دەسک دانە فیلەکەی کە بە دیاری لە(سەید ڕەئیس)ی وەرگرتبوو، دەرهێناو چەند گوللەیەکی تەقاند، ئەو قەوم و قیلەش کە لەبەر دەرگای ژووری بووک و زاوا وەستابوون و چاوەڕوانی ئەنجام بوون و زۆر لە زاوا پەرۆشتر بوون، لەگەڵ تەقەکانی (ئەحمەدی خورشیدی) ئەوانیش دەستیان کردەوە بە تەقەو تۆق و بەزمی هەڵپەڕکێ ..).(لا ٩٣)

٣- ئاسەوارە خراپەکانی دوو ژنی: دوای ئەوەی سەبا شوو بە عەزیزی سەرسپی دەکات، دوای ماوەیەک و، بەهۆی لاوازی کەسایەتی عەزیزی مێردی سەبا، ناچار دەکرێت لەلایەن ئامۆزایەکی ژنی یەکەمی (کە کابرایەکی سەر بە دەسەڵاتە و ئەویش سەرۆک جاشێکە ناوی ڕەشۆ یە) کە جارێکی تر بگەڕێنێتەوە لای خۆی و مارە بکاتەوە.. ئەمەش دەبێتە سەرەتای نەگبەتییەکی تازە بۆ سەبا و، ژنی یەکەمی عەزیز (کە ناوی چیمەن ـ ە) تاڵاوی ڕەش و سپی ژیان پێشانی سەبا دەدات و، دەبێتەوە هۆی بەدبەختی تەواوەتی (منداڵەکەی لە دەستدەدات و پاشان ژیانی خۆیشی)..

٤- بە کورتی ڕۆمانی سەبا تراژیدیایەکی واقیعییە لە ژیانی ئافرەتی کورد و، دەرخەری کۆتوبەندی کۆمەڵایەتییە کاتێ ناچاریان دەکات دەرگیری ببن و ئاسەوارەکانیشی قەبووڵ بکەن کە زۆرجار بە قوربانیدان بە ژیانیان کۆتایی دێت..

**شۆڕش و بەرخۆدان:**

رۆمانی سەبا هەرچەندە ڕۆمانێکی کۆمەڵایەتی واقیعییە، بەڵام وێنایەکی تەواوی چەند لایەنێکی شۆڕش و بەرەنگاریی سیاسی میللەتی کورد لەو سەردەمەدا وێنا دەکات.. لە وانە:

١- نەفرەتکردنی شەڕی براکوژی: ئەمەش لەسەر زمانی چەند کارەکتەرێکی ناو ڕۆمانەکە.. وەکو لە لاپەڕە ٣٣ لەسەر زمانی مام بابەکر کە دەڵێت:( سمکۆ بە بیانووی ئەوەی دژی براکوژییە، نەچووە ناو پێشمەرگەکانی (سەید مینە)، ئەو پێی وابوو هەقییەتی، خۆ هەردوولا پێشمەرگە بوون، خۆ ئەم شەڕانەی کە لەگەڵ یەکترییان کرد لە ماوەی ئەم هەموو ساڵە (بۆ وێنە سەیدمینە سەد شەڕی زیاتر لەگەڵ پێشمەرگەکانی سۆراندا ئەنجام دابوو)، وەکو مام بابەکر گۆتەنی: گەر نیوەی ئەم شەڕانەی بۆ سەر دام و دەزگا ئەمنیەکانی ڕژێم بوایە کە هەر لە کەرکوکەوە تا سەر سنووری باکوور و ڕۆژهەڵات بارەگایان دانابوو، تەنها بۆ یەک شەویش نەیان دەتوانی بمێننەوە..).

٢- کێبڕکی و ململانێی ناتەندروستی حیزبە کوردییەکان لە نێوان خۆیان: هەروەکو لە دەقی سەرەوە باسی لێوەکراوە، هەروەها لە چەند شوێنێکی ڕۆمانەکە تیشکی خستۆتە سەر ئەم دەردە و بەشێوەیەکی ناپەسەند وێنای کردووە.. بەشێک لە نەهامەتییەکانی مامۆستا خۆشەوی بەهۆی ئەوە بووە سەر بە حیزبێکی تر بووە، هەروەها نەمانی سمکۆ و فەوتانی دوای دەستگیرکردنی لەلایەن پێشمەرگەوە، هەر بەهۆی ئەوە بووە.. وەکو لە لاپەڕە (١٧٨) بەم شێوەیە باسی دەکات:

(هەندێک گووتیان، ئەو لە حیزبەکەی بادینان بووە.. ئەوانەی لەگەڵی بەند بوون، زانییویانە و پێیانگوتووە... (هەنووکە بەرەیەک لە نێوان هەموو حیزبەکانی کوردستان هەیە، خۆت وەکو کادیرێکی حیزبەکەی بادینان ڕابگەیەنە، زووتر، پێش ئێمە ئازادت دەکەن و تکایەکیش بۆ ئێمە بکە.)... دوای ئەمە.. بەرپرسەکان نەیاندەویست هەموو کەسێک بیبێنێ..، تا بۆ دواجار لە هەمووان ونبو..).

٣- مەسەلەی جاشایەتی و ئەفواج خفیفە: لە چەند شوێنێک لە ڕۆمانەکەدا ئاماژە بەم دیاردەیە دەکات و بەشێوەیەک باسی دەکات - لەسەر زمانی کارەکتەرەکان – وەکو کارێک کە دژی بەرژەوەندی گەلی کورد و جۆرێک لە خیانەتی نیشتیمانی بێت.. هەروەکو لە لاپەرەکانی (١٩) و (٢٥) و (٤١) و (٥١) و چەند شوێنێکی تردا.. لەم دوو تێکستی خوارەوە هەندێ لایەنی ئەو دیاردەیە باس دەکات:

(کەس نەبوو چەند کەسێکی سەر بەم فەوجی جاشانە نەبێت، ئەوەی لە ترسی سەربازی، ئەوەی بۆ ڕاوڕووت و ئەوەی بۆ ڕازیکردنی میریی و گرتنەدەستی دەسەڵاتێکی

کاتی و وەهمی، خۆی لەم فەوجانە ناونووس کردبوو.. سەرۆک جاشی وا هەبوو لە ئەفسەرێکی سوپای ڕژێم دڕندەتر بوو، هەش بوو پەیوەندی تەواوی لەگەڵ پێشمەرگەدا هەبوو، هەبوو قسەی لە بەرەکانی شۆڕش لە بەرپرسێکی پێشمەرگە زیاتر بوو) (لا ١٠٢).

(سوپا و سوپای میللی و ئەمن و پۆلیسی ڕژێم، لە سەر داوای میری، زۆر تێکەڵی شەڕی پێشمەرگە نابن.. ئەوان گەر بزانن هێرشی پێشمەرگە بۆ سەر جاشەکانە، قەت نایانەوێ ڕێگری لە هەر پێکدادانێکی نێوانیان بکەن، گرنگ ئەوەیە کوردە و کورد دەکوژێت...

- هەموو فەوجەکان ئەم شتە دەزانن؟

- زۆربەی فەوجەکان ئەمە دەزانن.. هیچ جاشێک حەز بە بەرەنگاربوونەوەی پێشمەرگە ناکات...

- جەنابت لە ڕادەربڕیندا ڕاست و ڕەوانی و، بێ پێچ و پەنا بە جاش دەڵێی جاش..

- (بە پێکەنینەوە...) بۆ خۆمان لە گێلی بدەین.. خۆمان دەزانین چین..) (لا ١٥١- ١٥٢).

٤- کارەساتی ئەنفال: نووسەر هەوڵیداوە ئەو نەهامەتی و ستەمەی لە میللەتی کورد لەم بەشەی کوردستانە دەکرێت زیندوو و بەرجەستە بکات، بۆئەوەی خوێنەر بەئاگا بهێنێتەوە لەوەی کە دەگوزەرا وێنەیەکی ڕاست و دروستی بارودۆخی ئەو کاتە پێشان بدات.. هەروەکو لەم دوو دەقەدا وێنای دەکات:

(- لەم ڕۆژانە ..ڕژێم دەستی بە ڕەشبگیریی دەڤەری گەرمیان کردووە.

- چۆن..؟

- هیچ ناپارێزێ، پیاو و ژن و گەنج و پیر و منداڵ، هەمووی دەستگیر دەکات.

- چیان لێدەکات ؟؟

- بەتەواوی نازانم، چونکە هەواڵەکان هەمەجۆرن، ئەوەی دیارە ئەوەیە کە هەنووکە خەڵکی هەموو دێهاتەکانی کوردستانی گرتۆتەوە و بەرەو ناوچەکانی باشوور دەیانگوێزێتەوە..

- ئەی هاوار .. چۆن؟ هەموو خەڵکی دێهاتەکان چۆن دەگوێزرێنەوە.. لە کوێ شوێنیان دەبێتەوە؟!

- بەڵێ.. سەدان هەزار کەسی وڵاتەکەمان، بەتایبەتی گەنجە تازە پێگەیشتوەکانمان کە ستوون و پاڵگەی هێزی دواڕۆژی ئێمەن، شەپۆل دوای شەپۆل دەیانئاخنە زیل و لۆری و تراکتۆرەکانیان و....

- خۆشەوی دیسان گریان بەرۆکی گرتەوە، لە قسەکردن وەستا و دەستی بۆ پەرداخە ئاوەکە برد کە هێشتا نیوە ئاوی تێدا مابوو، بە دوو قووم قوڕگی تەڕ کردەوە...

- دەبێ بۆ کوێیان بەرێت ؟! خۆ شەڕی ئێران و عێراق لەکۆتاییدایە؟!
- براکەم.. مەرگەساتە.. بڕواناکەم کەسیان لێدەرچێت..
- ئێ لەبەرچی؟ خۆ ئەو هەموو خەڵکە پێشمەرگە و چەکدارنین .. چۆن وادەبێ..!
- هەقتە.. هێشتا کەڵبەی دڕندەیی ئەم ڕژێمەت لێگیر نەبووە، هێشتا ژەهری ماری کۆروەیبابی ئەم ڕژێمەت لە جەستە نەگەڕاوە.. خوایە نەیبینی و هیچ مرۆڤێکیش نەیچێژێ..) (لا ٢١٢- ٢١٣).

(تا ئەوکاتە بەمجۆرە و بەم شێوە دڕندانە ئاگاداری پاکتاوکردنی نەتەوەکەی نەبوو.. بێ پەروا نەیدەزانی گەلانی دەوروبەر و دەسەڵاتدارانیان، ئەوەندە بێڕەحمانە مامەڵە لەگەڵ گەلێکی دیندار و خواناس و ئاشتیخواز دەکەن..

لەمەودوا خەمی گەورەی ئەو، ئەم دیمەنە نادروست و نەخوازراوانە بوون کە بەرامبەر نەتەوەکەی دەکران و، لەمیانەی قسەکانی براکەی بۆی دروست ببوون.. ئەو خەمی گەنجەکانی وەکو خۆی نەبوو، چونکە خۆی گوتەنی بەرخی نێر بۆ سەر بڕینە، بەڵام شەوان هەر سەری دەخستە سەرسەرین، دیمەنی ترسناک لەسەر پەردەی مێشکیدا هات و چۆیان دەکرد و خەویان دەزڕاند، ئازاریان دەدا، هەزار حەیفێ پیرەکانیان بە جامانەیان و بە ڕیشیان و، ئافرەتەکانیش بە کەزییەدرێژەکانیان و، منداڵانیش دەستە زبرە ڕەشەکانیان لە بینە قاقا گیر ببوو و پەلکێشی لێواری مردن دەکران ..) (لا ٢١٦- ٢١٧).

٥- چەند لایەنێکی تری پەیوەست بە خەبات و نەهامەتییەکانی گەلی کورد لەو سەردەمەدا، تەنها بەکورتی ئاماژەیان بۆ دەکەین. دەتوانین لەم چەند ناونیشانە گوازرشتیان لێ بکەین:

أ- خەباتی نهێنی ناو شار (لا ٥٧ و ١٤٤ و٢١٩-٢٢٢).

ب- دڕندەیی پیاوانی سەر بە دەسەڵات، لە نموونەی ئەحمەدی خۆرشیدی و مولازم نەجیم و ڕەشۆی ئامۆزای چیمەن: (لا ١٠١ و ١٠٩ و ١٢٦ و ١٤٥ و ١٧٤ و ٢٩٤).

ت- ناچاربوونی خەڵک بە بوون بە جاش: زۆرێک لە خەڵکی لەوکاتەدا لەبەر زۆر هۆکار ناچار دەبوون ببن بە جاش، کە سەرەکیترین هۆکار ئەوە بوو وەکو پەناگایەک بوو بۆیان لە جیاتی بوون بە سەرباز و جەیشی شعبی: (لا ٢١ و ١٣٣-١٣٤ و ١٤٣).

پ- ترس لە بازگە و لێپێچینەوەی سەربازانی حکومەت: حکومەتی (بەعس) لەوکاتەدا زۆر بە دڕندەیی و بێ بەزەیی ناسراو بوو لەگەڵ گەلی کورد بە زەبری هێز و شەق مامەڵەی دەکرد، بۆیە ترسێکی تەواو لە حکومەت و دەزگای میریی و بەتایبەت ئەمنییەکان لای خەڵکی هەبوو: (لا ١٧ و٦٩ و ١١٧- ١١٨ و ١٣٠).

ج- پەیوەندی نێوان پێشمەرگە و خەڵکی دێهاتەکان: (لا ٣٧ و ٥١- ٥٧ و ٥٨- ٦٢ و ١٠٥).

**نموونەی گەنجی خەباتکار و بە ئاگا لە نەهامەتییەکانی گەلەکەی و بە سۆز بۆیان:**

لەم ڕۆمانەدا کارەکتەرێکی سەرەکی وەکو مامۆستا خۆشەوی نموونەی ئەو گەنجە بە ئاگا و خەباتکارانە دەخرێتە ڕوو، کە خەباتێکی مەدەنی ناوشاریان دەکرد و هۆشیاریی ڕاست و دروستی بڵاودەکردەوە.. کە خۆشی مامۆستا دێی (زینێ) بوو (هەڵبەت لێرەدا نموونەی شەرمین خان وەکو ئافرەتی ڕۆشنبیر و بە ئاگا دێتە پێشێ، کە ئەویش مامۆستا بوو لە هەمان دێ و پێکەوە لەگەڵ خۆشەوی دووانەیەکیان دروستکردبوو)، بەهۆی ئەو پێگەیە توانی نەوەیەکی ئاگا و هۆشیار پەروەردە بکات (لە نموونەی سمکۆ و سەبا؛ کە هەردووکیان قووتابی ئەو دوو مامۆستایانە بوون و پەروەردەی دەستی ئەوان بوون). هەروەها لێرەدا دەبێ ئاماژە بە کەسایەتی (کامو) بکەین کە دەکاتە برای مامۆستا خۆشەوی، بەهۆی کارتێکردنی ئەوەوە هاتە ناو مەیدانی خەبات و ژیانی خۆی لەو ڕێگەیەدا بەخت کرد.

> **نووسەر هەوڵیداوە لەم ڕۆمانەدا وێنەیەکی واقیعی ژیانی ئافرەتی کورد لەو ساتەدا بخاتە ڕوو لە ڕێی کارەکتەری سەرەکی ئەم ڕۆمانە و، لە ڕێی ئەویشەوە چەندین پرس و ڕووداوی مێژوویی خستۆتە ڕوو.**

**وێنەی ئافرەت لە ڕۆمانی سەبادا:**

ئەم ڕۆمانە بەناوی کەسایەتییەکی ئافرەت ناونراوە و، (سەبا) تێیدا ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت و، باسی ژیان و سەرگوزەشتەی ئەو دەکات.. سەبا لەم ڕۆمانەدا نموونەی ئافرەتی خۆڕاگر و داوێنپاک و خۆشەویست و خۆنەویستە.. نموونەی ئافرەتێکی ستەملێکراوی دەستی دابونەریت و کلتووری دواکەوتووی کۆمەڵایەتییە..

لە بەرامبەردا کەسایەتی (چیمەن) هەیە، کە ژنی یەکەمی (عەزیز)ە و هەوێی (سەبا) یە.. ئەمیش نموونەی ئافرەتی قوربانی دەستی دواکەوتوویی کومەڵگە و شەڕانگیزیی و ئیستغلالی پیاو بۆ مەرام و حەزە ناشەرعییەکانی خۆی.. کە نموونەیەکی خراپی ئافرەت بەرجەستە دەکات، هەم لە ڕووی ئاکار و ڕەفتارەکانی و هەم لە ڕووی دڵڕەقی و نا تەندروستی دەروونییەوە.. لەو نێوەندەشدا کەسایەتی (شەرمین خان) هەیە، کە کەسایەتییەکی ئەرێنی و ڕۆشنبیرە و مامۆستای دێیەکەیە و، لەنێو بنەماڵەیەکی تێکۆشەر و ڕۆشنبیر پەروەردە بووە..

**ڕۆڵ و پێگەی مەلا و ئایین:**

لەم ڕۆمانەدا زۆر کەم تیشک خراوەتە سەر ڕۆڵی ئایین و پێگەی مەلا.. بەڵام لە چەند شوێنێک ئاماژەیان بۆ کراوە، هەروەکو لە لاپەڕە (٥٩ -٦٢) وێنای گفتوگۆیەک لە نێوان مەلای دێیەکە (کە ناوی مەلا فیکرەتە) و کەسایەتی شەڕانگیز و خۆفرۆش و دوژمن بە دۆزی میللەتەکەی (مولازم نەجیم) کراوە.. هەروەها لە لاپەڕەکانی (٧ و ٨ و ٢١ و ٧٢) سووکە ئاماژەیەک بە ڕۆڵی باشی مەلاکان لە چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکانی خەڵکی کراوە. لە بەرامبەردا ڕۆڵی کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی – ئایینی (وەکو شێخ عوبێد، کە باوکی مامۆستا خۆشەوی یە) لە هاوکاری خەڵکی و چارەسەرکردنی گرفتەکانیان زیاتر بایەخی پێدراوە.. خۆشەوی ئاوا باسی باوکی دەکات:( خۆ تۆ باش باوکم دەناسی و خەڵکی یەک دەڤەرن و..گومانم نییە کە زۆریشت خۆش دەوێ، باش دەزانی باوکم شێخێکی گەورەیە و، لەگەڵ ئاغاو بەگەکانیش زاواو خەزوورن... بەڵام لەبەرئەوەی لە جیاتی دەمانچەیەک دارسیواکێکی خستۆتە پشتێنی و زۆربەی کاتی لە مزگەوتە، خۆ لەبیرتە چەند جارێک خەڵکێکی زۆری ناوچەکەمان ڕوویان تێکرد، تا (سوکە فەوج)ێک وەربگرێت و خۆیان گۆتەنی: بیانگرێتە خۆی، باشترە با نەبنە جاشی یەکێکی دیکە.. کەچی ئەو هەموو جار بەم قسەیە بڵاوەی پێدەکردن و دەیگوت:(کوڕینە جاشایەتی و مزگەوتیان نەگوتووە، من مزگەوتم هەڵبژاردووە... ئێوەش مەرج نییە تەنها جاشایەتی بکەن، خۆ کاسپی زۆرە..) (لا ٢٠-٢١).

ڕەنگە زۆر لایەنی تر هەبێت تیشکی بیخرێتە سەر، بەڵام بۆ مەبەستەکانی ئەم وتارە هەر ئەم چەند دێڕە گوزارشت لە ناوەڕۆکی مەبەستەکەمان دەکات..

ماوەتەوە کە بڵێم، ئەم ڕۆمانە سەلیقەی هونەریی و حیکایەتخوانی نووسەر عەلی ساڵح میران بە جوانی دەردەخات، کە بەداخەوە مەرگ ڕێگر بوو لەوەی بەرهەمی زیاتر و ئەزموونی پوختەتر تاقی بکاتەوە.. خودای گەورە لە هەموو لایەکمان خۆش بێت.



سیروان عباس

# ڕۆمانی کوردی دوای 100 ساڵ!

ڕۆمان، وەکو بەشێک یاخود پایەیەکی سەرەکییە لە ئەدەبیاتدا، هەرچەندە لە ئەدەبیاتی وڵاتاندا ڕۆمان مێژووی لە کورتەچیرۆک کۆنترە، بەڵام مێژووی ڕۆمانی کوردی، مێژوویەکی هاوچەرخە و لە دوای هەموو ژانرە ئەدەبییەکانی دیکە هاتووەتە ناو ئەدەبیاتییەوە. یەکەم ڕۆمانی کوردی مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم، کە لەلایەن عەرەبی شەمۆ یان عەرەب شامیلۆف (١٨٩٧–١٩٨٧) کە بە شێوەزاری کورمانجی بەنێوی (شوانی کورمانج) یان (شوانی باکووری) لە ئێرەوانی ئەرمەنستان بڵاویکردەوە. لە سەرەتای پەیدابوونی ڕۆمان لە ئەدەبیاتی کوردیدا، ئەویش هاوشانی ژانرەکانی دیکە، قۆناغگەلێکی بڕیوە، بەڵام ناتوانین وەکو شیعر قۆناغەکان دیاری بکەین، چونکە ڕۆمان بەگوێرەی کات (زەمەن) گۆڕانکاریی بەسەر خۆیدا هێناوە.

**ڕۆماننووس دڵزار حەسەن دەڵێت:** مێژووی نووسینی ڕۆمان لەناو کورد، وەک نموونەی دەقی کاغەزی دیرۆکێکی زۆر درێژی نییە، جگەلەوەش تا کۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیست ڕۆمانی چاپکراو لە باشوری کوردستان چەند ڕۆمانێکی دیاریکراو بووە، یانی لە ڕووی چەندایەتییەوە نزیکەی بیست دانەیەک دەبن، بەڵام لە دوای ڕاپەڕین و بەتایبەت دوای ساڵانی دوو هەزار و تا ئێستاکە، ئیدی شەپۆلی ڕۆماننووسین لە باشوور و بەشەکانی دیکەی کوردستان، ڕۆمان و ڕۆماننووسی کوردی گەیاندە قۆناغێکی دیکەوە.

«کورد ڕۆمانی زۆرباشی هەن، بەڵام نەگەیشتووەتە شوێنی خۆیان و ئەدەبی کوردی نەبووەتە ئەدەبێکی جیهانی»

**نووسەر و شاعیر ئەسکەندەر زرار،** پێیوایە، شتێک نییە بەناوی ململانێ لەنێو ئەدەبیاتدا، یان پێشبڕکێ. دانانی ئاست و پلەبەندی بۆ ڕۆمانی زمانێک یا نەتەوەیەک شتێکی ئاسان نییە، دادپەروەرانەش نییە، تۆ گەر دوو ڕۆمانی یان دوو ڕۆماننووسی باش و ئاست بەرزت هەبوو، واتە ڕۆمانی کوردی لە ئاستێکی باشە؟

ئەسکەندەر زرار کە قسەی بۆ گۆڤاری خاڵ کردووە، نموونە بۆ قسەکانی دەهێنێتەوە و دەڵێت:» تۆ ئاستی ڕۆمانی کوردی لەسەر بنەمای ڕۆمانەکانی بەختیار عەلی دیاری دەکەیت؟ یان ئەو تێکستە خراپانەی بەناوی ڕۆمانەوە لاپەڕەیان پێ ڕەش دەکرێت. بەشێوەیەکی تر وەڵامت بدەمەوە، کورد ڕۆماننووسی باش و ڕۆمانی زۆر باشی هەیە، کە لەسەر ئاستی دونیا ڕۆمانی ئاست بەرزن، بەڵام ڕەنگە نەگەیشتبنە شوێنی خۆیان. ئەدەبی کوردی بەگشتی بەهۆی کەمی وەرگێڕانەوە نەبووەتە ئەدەبێکی جیهانیی».

## «لە حیکایەت و داستان و شێوازی گێڕانەوەدا، میراتێکی زەنگینمان هەیە»

بەڵام دڵزار حەسەن، کە یەکێکە لە ڕۆماننووسەکانی کورد و لە سەروبەندی ئامادەکردنی ئەم ڕاپۆرتەدا دوو ڕۆمانی نوێی بڵاوکردەوە لەوبارەوە قسەی بۆ خاڵ کرد و گووتی: بە بەراورد بە ساڵانی زوو، چاپکردنی ڕۆمان هێندە بەخێرایی گەشەی کرد، تا ئەو ساتەش جگەلە هەندێ هەوڵی جیددی توێژەر و ڕەخنەگرانی کورد «کە بەپەنچەی دەست دەژمێردرێت» نەتواندراوە وەک پێویست ئەو قۆناغە هەڵسەنگێنن، ئەرکی ناوەندە زانستیی و زانکۆکانە ئەو جیاکارییە دەستنیشان بکات، نەک ئێمە و مانان؟!. خوێندکارانی زانکۆ بە توێژینەوە و تێزی ماستێر و دکتۆراکانیان دەتوانن بۆمان شیبکەنەوە و بگەنە دەرئەنجامێک کە ڕۆمانی کوردی لە کوێی ڕۆمانی جیهانیدایە. تاکو ئێستا هەوڵەکان لەو ئاستەدا نین، تا ئێمە لەو دیدارەدا بێین قسە لەسەر ئەوە بکەین، ئاخۆ ڕۆمانی کوردی دەتوانێ ململانێ لەگەڵ ڕۆمانی جیهانیدا بکات؟!.

بەڕاستی من لەگەڵ ئەو زاراوەی ململانێی و پێشبڕکێی و ئەو شتانەدا نیم بۆ دنیای

ئەدەب، چونکە ئەدەب پەیوەندی بە هەست و خەیاڵ و جیهانبینی تاکەوە هەیە، ئەدەب بەرهەمی بیرکردنەوەی تاکە، جا ئەو تاکە کەمبۆدی بێت، یان بەرازیلی، یان ئەورووپی، یان ئاسیایی و کورد بێ، یان تاکێکی دیکە بێت. مادامەکی قسە لەسەر دەقە وەک بەرهەمی ئینسان، کەواتە تۆ مامەڵە لەگەڵ ماهییەتی دەق دەکەیت، نەک کەس و نەتەوە و ڕەگەز و هتد...، بەڵام دەتوانین پرسیارەکە بەوشێوەیەی لێ بکەین، ئایا کورد توانیویەتی مامەڵەیەکی ئەدەبیانە لەگەڵ ڕۆماندا بکات؟! پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوە دەمەوێت لەسەر ئەدەبیاتی زارەکی و ئاخافتن و زمانی دایک و حیکایەت و گێڕانەوە و داستان لەناو کورددا، هەڵوەستەیەک بکەم. گەر سەرنج بدەینە مێژووی ئەدەبیاتە زارەکییەکان، کورد لەوەدا زۆر دەوڵەمەندە. هەروەها لە حیکایەت و داستان و شێوازی گێڕانەوەدا، لەمەشیان میراتێکی زەنگینمان هەیە. کۆڕ و مەجلیس و دیوەخانی کوردەواری، پاشخانێکی زەنگینی لەو بوارەدا بۆمانی بەرهەمهێناوە. زمانی کوردیش بە هەموو زار و بنزارەکانییەوە، بەتایبەت لە باشووری کوردستان و خۆرهەڵاتی کوردستان میراتێکی گەورەیان بۆ جێهێشتووین. بیرمان نەچێت خۆی کێشەکە لە تەوزیفکردنی ئەو میراتە دەوڵەمەندەیە بۆ سەر کاغەز، بۆسەر دنیای ئەدەب و گێڕانەوە، یان بە مانایەکی دیکە دەتوانین بپرسین ئەدیب و ڕۆماننوسی ئێمە چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو کەرەستانەدا کردووە؟

دیارە ڕۆمان جگەلە زمان و تەکنیک و شێوازی گێڕانەوەی، دوو بونیادی سەرەکی هەن کە پایەکانی ڕۆمانی لەسەر بینادەکرێت، ئەمیش ئایدیا و ماتریالەکەیەتی، واتا فکر و کەرەستەکانی. ڕۆماننووسی کورد زۆر بەکەمی توانیویەتی کار لەناو ئەو دوو چەمکەدا بکات، هەرئەوەش بووەتە هۆی ئەوەی تۆ ئەو پرسیارە بکەیت، چونکە لەوکایەدا بۆشاییەکی زۆرمان هەیە و نەمانتوانیوە لەناو ڕۆماندا تەوزیفی بکەین. کورد یەک دنیا کەرەستەی ڕۆمانی هەیە و خاوەنی ئایدیا و فکر و ئەندێشەی خۆیەتی، بەس کاتێک تۆ نەتوانی کۆی ئەوانە لەناو دەقدا جێ بکەیتەوە و لەناو ڕۆمانیشدا دواجار قووڵ بەر ڕوودا و کەرەستە و فکر نەکەوتی، ئەو کاتە ئەو پرسیارە دروست دەبێت، ئاخۆ ئێمە لە کوێی ڕۆمانی جیهانیداین؟ هەرچەندە من هەندێک لە ڕۆمانەکانی کاروان کاکە سوور و کەریم کاکە و بەیان سەلمان و عەتا نهایی و جەبار جەمال غەریب و لە پێشتردا حوسێن عارف و عەبدوڵڵا سەراج و جەلیل کاکەویس و ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل بەو ڕۆماننووسە جیهانیانە دادەنێم کە قووڵ بەر تەکنیک و ئایدیا و ماتریالەکان کەوتوون و زۆرباش ئیشیان لە جەوهەری ڕۆماندا کردووە.

لە ئەدەبیاتی جیهانیدا ڕۆمان پێش کورتە چیرۆک سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەم ڕەوتە لە ئەدەبی کوردیدا بەپێچەوانەیە. واتە چیرۆک چەن دەیەیەک پێش ڕۆمان لە ناو ئەدەبیاتی کوردیدا سەرهەڵدەدات. ئەدیبانی کورد بۆ دوو هۆکاری دەگەڕێننەوە، یەکەم: وەرگێڕی کورد،

زیاتر ڕوویان لە کورتە چیرۆک بوو تا ڕۆمان، وەرگێڕانەکانیان لە چیرۆکی عەربی، فارسی و تورکی ئەنجامدەدا. دووەم: نووسینی ڕۆمان بەهۆی فۆرم و چەشنی تایبەت، هەڵگری دەرفەتی بەرفراوانتر و دۆخێکی باشترە. ئەمە بۆ کورد درەنگ فەراهەم بوو، چونکە بەهۆی داگیرکاریی و شەڕەوە، ڕەنگە ئەو دەرفەتە درەنگ بۆ کورد ڕەخسابێت، لەوەش کاریگەرتر نەکرانەوەبووە بە ڕووی جیهاندا و قەتیسبوونی نووسەرانی کوردە لە سنوورێکی جوگرافی دیاریکراودا. ئەم کۆتە دوای کۆچکردنی کورد بۆ وڵاتانی ئەورووپا شکێنرا، نموونە: عەرەبی شەمۆیە، کە خاوەن یەکەمین ڕۆمانی چاپکراوی کوردییە و لە ئەرمەنستان نووسیویەتی.

**« کورد پێش ڕۆمانیش چیرۆکی درێژی هەیە کە دەکرێ وەک ڕۆمان پۆلێن بکرێ»**

ئەسکەندەر زرار دەڵێت: کورد بەبەراورد بە مێژووی دونیا، لە هەموو شتێک نوێیە، بەڵام بۆ ڕۆمان نوێ نییە، خۆی ڕۆمان ژانرێکی نوێیە. کورد پێش ڕۆمانیش چیرۆکی درێژی هەیە کە دەکرێ وەک ڕومان پۆلێن بکرێ. چیرۆکی درێژی (لە خەوما)ی جەمیل سائیب و چیرۆکی درێژی (مەسەلەی ویژدان)ی ئەحمەد موختار جاف دوو نموونەن. واتە نزیکی سەت ساڵە کورد ڕۆمانی نووسیووە.

**«نووسەری کورد شەرمنانە مامەڵەی لەگەڵ ژینگەی ئەدەب بەگشتی و ژینگەی ڕۆماندا کردووە»**

بەڵام دڵزار حەسەن هۆکارگەلێک بۆ دواکەوتنی کورد لە نووسینی ڕۆمان باس دەکات و دەڵێت: دۆخی سیاسیی و کلتووریی و کۆمەڵایەتی کورد، هۆکارگەلێک بوون کە ئەو ژانرە درەنگ بە ئێمە بگات و نووسەری ئێمەش شەرمنانە مامەڵەی لەگەڵ ژینگەی ئەدەب بەگشتی و ژینگەی ڕۆماندا کردووە، واتە وەکخۆی تەکنیک و زمان و شێوازی ڕۆمانی نەناسیوە، زیاتر گرنگی بە شیعر و هۆنراوە و لاواندنەوە داوە، یانی قووڵ بەر ئەدەبیات نەکەوتووە. نووسەری کورد زیاتر مامەڵەیەکی هەستەکیی و ڕۆمانسییانەی لەگەڵ ئەدەبدا کردووە، نەک ئاوێتەبوونێکی فکریی و مەعریفی، بۆیە هەلومەرجی گەشەی ئەدەب لای ئێمە دۆخێکی شیعریانەی وەرگرتووە، ئەو فۆرمە لە ئەدەب زیاتر هی گەلانی ژێردەستە و کشتوکاڵین، کۆمەڵگەی کشتوکاڵی موفرەدەکانیان زیاتر هۆنینەوە و دەردەشە و سۆز و لاواندنەوەیە، بۆیە زۆر بەکەمی ئاوڕمان لە ڕۆمان و فکر و فەلسەفە داوەتەوە. کاتێک تۆ سۆزدارانە ئیش لە دنیای ئەدەبدا دەکەیت، ئەوکات بەرهەمی تۆ هەر شیعر و لاوک و حەیران دەبێت. کاتێکیش دەڵێن لاوک و حەیران مەبەستم ئەوەیە کە بەرکەوتنی ئێمە لەگەڵ ئەدەبیاتی زارەکی و فۆلکلۆر و تەنانەت داستان و ئەفسانە و حیکایەتەکانیش هێندە شیعرئامێز بووە، هێندە فەزایەکی کراوەی بۆ جیهانبینی نووسەر نەخوڵقاندووە.

**«ڕۆشنبیری کورد زۆر لە پاش عەرەب و فارس، سەردەمی ڕۆشنگەری ئەورووپای ناسی»**

ڕۆشنبیری کورد زۆر لە پاش عەرەب و فارس، سەردەمی ڕۆشنگەری ئەورووپای ناسی. بەداخەوە چەرخی درەوشانەوەی ڕێنیسانس، زۆر درەنگ بە ئێمە گەیشت. ئەمە قسەی دڵزار حەسەنە و زیاتر دەڵێت: لەناو کورد ئەوانەی ئەورووپایان دیتبوو، بە پەنچەی دەست دەژمێردران، بەداخەوە لە ڕێگای ئەو زمانزانیی و شارەزایی و تواناییەی کە هەیانبووە، هێشتاکێ توانستی ئەوەیان نەبووە کە وێنە گەورەکەی خۆرئاوا وەک خۆی بۆمان بگوازنەوە. لێرەدا پێویستە قسەیەکیش لەسەر حەرەکەی وەرگێڕان بکەین، نموونەی نووسەر و ڕۆشنفکرێکی کوردم بۆ بهێنەوە، فەڕەنسی زان، ئەڵمانی زان، ئینگلیزی زانێک کە وەک پرۆژە کاری لەسەر بە کوردیکردنی ئەدەب و فکر و فەلەسەفەی خۆرئاوایی کردبێ. مەبەستم ئەوانەیە، کە لەسەدەی بیستدا خاوەن قەڵەم و ڕۆشنفکربوون. نموونەی ماڵباتی بەدرخانییەکان، کەسایەتییەکی وەک (میقداد مەدحەت بەدرخان) کە لە ساڵی ١٨٩١ چووەتە میسر و پێنج ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان چاپ دەکات (کە بە یەکەم ڕۆژنامەی کوردی کاغەزی دادەندرێت). زمانی کوردی، تورکی، عەرەبی و فەڕەنسیشی بەباشی زانیوە، جگەلەوەش بە دامەزرێنەری ئەلف و بێی لاتینی کوردی دادەندرێت، بەڵام هیچ کامێکیان کاریان لەسەر گواستنەوەی ئەدەبیاتی بیانی نەکردووە، بۆ سەر ئەلف و بێی کوردی، مەبەست ئەلف و بێی لاتینی کوردییە.

**«میر جەلادەت بەدرخان حەوت زمانی زانیوە، بەڵام هیچی لە ئەدەبیاتی گەلان وەرنەگێڕاوە»**

میر جەلادەت بەدرخان لە نێوان ساڵانی ١٨٩٣ – ١٩٥١ ژیاوە، بە حەوت زمان قسە و نووسینی پێکردووە، وەک کوردی، ئینگلیزی، فەڕەنسی، ئەڵمانی، تورکی، فارسی، عەرەبی، عیبریی و یۆنانیشی زانیوە، بەڵام هیچێک لەو زمانانە کۆمەکی ئەوەی ناکەن ئەدەبیاتی گەلان وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی. محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە نێوان ساڵانی ١٨٨٠ – ١٩٤٨ ژیاوە، زمانەکانی کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی، ئەڵمانی، فەڕەنسی بەباشی زانیوە و لەبەر زیرەکی و لێوەشاوەیی بە «زەکی» ناوبانگی دەرکردووە. خاوەنی زیاتر لە دوانزە کتێبە، بەڵام هەوڵی نەداوە بەهۆی ئەو هەموو زانینەی زمانەوە کە هەیبووە، ئەدەبیاتی خۆرئاوایی بکاتە کوردی.

ڕەفیق حیلمی کە لە نێوان ساڵانی ١٨٩٨- ١٩٦٠ ژیاوە، عەرەبی، تورکی و فەڕەنسی زانیوە، کتێبی (خولاسەی مەسەلەی کورد) کە لە فەڕەنسی بە کوردی کردووە، لەگەڵ کتێبی (کورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ١٩٢٠) بە عەرەبی نووسیویەتی، چەند پەرتووکێکی بە زمانی کوردی لەسەر شیعر و ئەدەبیاتی کوردی نووسیوە، ئایا هەوڵیداوە ئەو میراتە فکریی و فەلسەفی و ئەدەبیەی خۆرئاوا بگوازێتەوە ناو کورد؟! بێگومان نەخێر. تۆفیق وەهبی کە لە نێوان ساڵانی ١٨٩١- ١٩٨٤ ژیاوە، جگەلە زمانی کوردی، شەش زمانی

بەباشی زانیوە. ئەندامی کۆمەڵەی جوگرافیاناسانی بەریتانیا بووە، بە کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی کتێبی هەیە، بەڵام هەوڵی نەداوە لە ڕێگای وەرگێڕانەوە، ژیاری خۆرئاوا بە ئێمە بناسێنێت. پیرەمێرد کە لە نێوان ١٨٦٧ – ١٩٥٠ ژیاوە، بە چاکی زمانەکانی کوردی، تورکی، فارسی و عەرەبی قسە و نووسینی پێکردووە. گۆران کە لەنێوان سالآنی ١٩٠٤ – ١٩٦٢ ژیاوە، زمانەکانی کوردی، عەرەبی، تورکی و ئینگلیزی زانیوە و زۆرباش ئاگاداری ئەدەبیاتی گەلان بووە. عەرەبی شەمۆ کە لە نێوان سالآنی ١٨٩٧ – ١٩٧٨ ژیاوە، زمانی کوردی و ڕووسی بەباشی زانیوە، داستانی «قەڵای دمدمی» کردووە بە زمانی ڕووسی بە پیتی سلاڤی لە یەریڤان.

> **کەمی ڕۆمـــانی کوردی لـــە مێژوودا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کورد نەیتوانیوە مامەڵەیەکی ئەدەبی و مەعریفییانە لەگەڵ ژانری ڕۆمان و گێڕانەوەدا بکات.**

هەڵبەت پیرەمێرد و گۆران و عەرەبی شەمۆش وەکو ئەوانی دیکە کاریان لەسەر گواستنەوەی ئەدەبیاتی گەلان نەکردووە بۆ سەر زمانی کوردی، بەس دەبینین زانایەکی وەک (ئیبن ڕوشد) کە لە نێوان سالآنی ١١٢٦ – ١١٩٨ ژیاوە، زمانی عەرەبی، ئیسپانی، فەرەنسی، عیبری و یۆنانی بەباشی زانیوە و ئەو تخوبە تێک دەدات و دەپەڕێتەوە بۆ خۆرئاوا، خۆرئاوایەک هێشتا خۆی وەک ئیبن ڕوشد، کە ناسیویەتی خۆی نەناسیوە و دواجار لە ڕێگای ئیبن ڕوشدەوە بەخۆی ئاشنا دەبێتەوە. لە ڕێگای زمانزانییەکەیەوە، تەواوی فەلسەفەی یۆنانی دەگوازێتەوە ناو کلتووری عەرەبی و ئیسلامی. باشە نموونەی زانایەکی کوردی بلیمەتی وەک (ئیبن و ئادەم)مان هەیە، لە نێوان سالآنی ١٧٤٧ – ١٨٣٦ ژیاوە، کۆمەڵێک دانراوی هەیە لە زانستی ئەقڵی و نەقلیدا، زمانی کوردی و عەرەبی و فارسی زۆر بەباشی زانیوە، پەرتوکێکی بەزمانی کوردی هەیە بەناوی «مشكاه المنقول» مەلا کوردەکان ڕەخنەیان لێگرتووە و پێیان گوتووە تا زمانی عەرەبی هەبێت، دروست نییە بە زمانی دیکە شت بنووسرێت. ئەویش لە حاشیەکەیدا نووسیویەتی: (سەرم سوڕما لە گوتنی ئەو مەلایانە، ئەوانە وەکو هێلکە لە تووکڵەی خۆی هاتوونەدەر).

**دڵزار حەسەن دەڵێت:** سەیرەکە لەوەدایە ئیبن و ئادەمیش دواجار جورئەتی ئەوەی نەکردووە، بپەڕێتەوە ناو ژیان و دنیابینی ئاینیی و کلتووری گەلانی دیکە. هۆیەکەی ئەوەیە کە نووسەری ئێمە، پرۆژەی نەبووە و وەک پێویست نەیڕوانیوەتە کتێب و مەعریفە.

**« زۆرێک لە زانا و دانای کورد لەنێو کلتووری دینیدا ونبوون»**

دڵزار حەسەن پێیوایە، زۆرێک لە زانا و دانای کورد هەن لە نێو کلتووری دینیدا ونبوون، لەکاتێکدا ئەوان جگەلە زمانی کوردی، بەشی زۆریان عەرەبی، فارسی و تورکیان زانیوە، بەڵام ئەو دۆخە درەوشاوەی خۆرئاوا نابینن، وەک ئیبن و ڕوشد بیرمەندانی دیکەی جیهانی ئیسلامی ناچن تێکەڵ بە جەوهەر و کلتووری دنیای دیکە بن، بەڵکو دێن بەگژ کلتوورێکدا دەچنەوە کە بێ ئەوەی بیزانێت ونی دەکات. کێ لە ئێمە وەکخۆی بەشێک لەو زانایانە دەناسێت کە لەناو دنیای ئاینییدا بیریانکردووەتەوە و چەندان دانراویان بە زمانی عەرەبی هەیە؟ کێ لە ئێمە وەکخۆی ئەوان دەناسێت، کە شەرعزان و زمانزان و فەقهی و زانای بلیمەت بووین؟ بەڵام دەبینین زۆربەیان ونبووین، چونکە بە زمانی خۆیان بیریان نەکردووەتەوە، بە زمانی دایک خەیاڵیان نەجووڵاوە، خەونیان نەبینیوە، یان کاریان لەسەر ڕۆشنکردنەوەی فکر نەکردووە، بەو زمانەی کە هی دایکییەتی. زمانی دایک، کاتێک دەبێت بە هۆش و هۆشمەندی کە شتی لێ بەرهەم بێت، نووسەر بەو زمانەی کە بیردەکاتەوە، بەو زمانەش دەنووسێت.

**« تاکو ئێستاش ڕۆمانی ئێمە لە حیکایەتی شیرین و فەرهاد دەربازی نەبووە»**

ئەدەبیاتی ئێمە زۆربەی یان سیاسی بووە، یان کرووزانەوە و باس و خواسی ڕۆمانسییانە بووە، تاکو ئێستاکەش ڕۆمانی ئێمە لە حیکایەتی شیرین و فەرهاد دەربازی نەبووە. ئەمە قسەی دڵزار حەسەنە و لە وەڵامی پرسیاری گۆڤاری خاڵدا زیاتر دەڵێت: کەمی ڕۆمانی کوردیش لە مێژوودا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کورد نەیتوانیوە مامەڵەیەکی ئەدەبی و مەعریفییانە لەگەڵ ژانری ڕۆمان و گێڕانەوەدا بکات. سەرسام بووە بە ئەدەبێک کە فکری نەگۆڕیوە، بەڵکو زیاتر کاری لەسەر متبوون و خۆ جوینەوە کردووە، لە سەرەتاوەش زۆر بە کزۆڵی ڕۆمان دەرکەوتووە، هیچ هونەرکارییەکی لەو بوارەدا نەکردووە، تەنها حیکایەتی گێڕاوەتەوە. زمان و تەکنیک و شێوازی گێڕانەوەی جۆرێک بووە لە ئەدەبیاتی سەرگوزەشتە، هەر بەو شێوازەش مامەڵەی لەگەڵ دۆخی ڕۆماندا کردووە. دیارە دەرکەوتنی ڕۆمانی کوردی بۆ ساڵانی بیستەکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە، هەرچەند ئەو ڕۆمانانەی لەو ماوەیەدا نووسراون، نابێت نادیدە بگیرێن و بە بایەخەوە وەک سەرەتایەک بۆ ڕۆماننوسین لەناو کوردا سەیری نەکەین، ئەوەش کاری ڕەخنەگر و ئەکادیمیستەکانە، توێژینەوە بکەن و لایەنە هونەرییەکانیان هەڵبسەنگێنن. (مەسەلەی ویژدان)ی ئەحمەدموختار جاف و (لە خەومای) جەمیل سائیب، هەرچەندە وەک ژانر شوناسی ڕۆمانی پێوە نەلکاوە، بەڵام ئەدەبناسان ناویان ناوە چیرۆکی درێژ و بە پێوەری میتۆدی ڕۆماننووسین، بە بەراورد بە ڕۆمانی ئێستا ئەو دوو دەقەش

خراوەتە لیستی ڕۆمانەوە، کە بەیەکەم دەرکەوتنی ڕۆمانی کوردی لە باشوور دادەندرێت. نووسەر و ئەکادیمیست و شارەزایانی بواری ئەدەب، ڕۆمانی (پێشمەرگە)ی ڕەحیمی قازی و (ئاشتی کوردستان)ی محەمەد ساڵح سەعید و (ژانی گەل)ەکەی ئیبراهیم ئەحمەد بە وەرچەخانێک دەزانن لە بواری ڕۆماندا.

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا ڕۆمانی کوردی گەشەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بەتایبەت لە سێ دەیەی ڕابردوودا زیاتر لە ٩٠ ساڵی سەدەی بیستەم ڕۆمان نووسراوە، بەڵام لە کتێبخانەی کوردیدا ئەگەر بەراوردکارییەک بکرێت، ڕەنگە ڕۆمانی وەرگێڕدراو چەندین ئەوەندەی ڕۆمانی نووسراوبێت. ئەسکەندەر زرار لەوبارەوە دەڵێت: شتێکی زۆرباشە و جێگای دڵخۆشییە نەک نیگەرانیی. بۆ نموونە بیست ڕۆماننووست هەیە بە کوردی دەنووسن، عەرەب سەت و فارس سەت و تورک سەت و نەتەوەکانی تر هەزاریان هەیە... تۆ بێی نموونەی ڕۆمانە باشەکانیان وەرگێڕیت بێگومان چەند بەرامبەر دەبن. زۆریی گرینگ نییە ئەگەر بۆر بن.

## «وەرگێڕ هەیە لە یەککاتدا (نیتچە) دەکاتە کوردی و کتێبی (چۆن دەبیت بە کەسێکی سەرکەوتوو)ش تەرجەمە دەکات»

بەڵام دڵزار حەسەن پێیوایە، بزووتنەوەی بە کوردیکردنی ئەدەبیاتی گەلان، لەناو کورددا زۆر درەنگ دەستیپێکردووە و دەشڵێت: نیگەرانیشم لەوەی کە بەشی زۆری ئەو قەڵەمبەدەست و ڕۆشنفکرانەی ئێمە لەبری ئەوەی سەرقاڵی دۆخی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی و فکری جیهان بن، هاتوون بە شتی دیکەوە خەریک بوون، یان دەکرا لە پەنا ئەو شتانەوە وەک پرۆژە و کارێکی درێژخایەن و ئەزموونی سەیری گرنگی گواستنەوەی ئەدەبیاتی بیانیان بکردایە، چونکە ئەوان چەندان زمانیان زانیوە و لە نزیکەوە دۆخی خۆرئاوایان بینیوە و لە بەهاکەی تێگەیشتوون. سەبارەت بە ڕۆمانی وەرگێڕدراویش من بە شتێکی لەنگ و ناڕێکی نابینم، بەڵکو هەمیشە لایەنگری ئەوە بووم کە وەرگێڕان دەکرێ زیاتر بە ئۆرگانی بکرێت و ناوەندەکانی چاپەمەنی و دەزگا و کەسە وەرگێڕەکان بە بەرنامە و پلانەوە کار بکەن، هەرچەندە لەوەشیان دنیایەک گرفتمان هەیە، وەرگێڕ هەیە لەیەککاتدا (نیتچە) دەکاتە کوردی و کتێبی (چۆن دەبیت بە کەسێکی سەرکەوتوو)ش تەرجەمە دەکات، دێت ئیش لەسەر (فۆکۆ) دەکات و ڕۆمانیش تەرجەمە دەکات، کتێبی سیاسی و دەروونشیکاریی و شیعریش تەرجەمە دەکات، ئەو ناڕێکییە گومانمان لا دروست دەکات، چونکە وەرگێڕ نابێت بەوشێوە پەرتبێت، تۆ دەبێ وەک پرۆژە سەیری وەرگێڕانی نووسراوی دەرەوەی خۆت بکەیت، بۆ نموونە سەیرە تۆ لە (نیچە و هیگڵ و هایدگەر)

نەگەیشتبی، لەولاوەش خەریکی گواستنەوەی فکری ئەوان بیت، جاریّ ئێمە کلۆڵین لە ناساندن و تێگەیشتن لە چەمک، هەموومان بەدەست ئەو چەمکە فکریی و مەعریفیی و فەلسەفی و ئەدەبیانەوە گیرمانخواردووە، نازانین چۆن و لە چ شوێنێک بەکاری دەهێنین. کەواتە پرۆسەی وەرگێڕان کارێکی کلتووری قووڵە، بەرپرسیاریەتییە، ناکریّ بەو فۆرمە ئەو مەکینە زەبەلاحە بسوڕێنین، کارگەی وەرگێڕان بنەمای خۆی هەیە، ئاخر ئاسان نییە تێگەیشتن لەو بیرمەندانە. هەرچەندە من هەمیشە لایەنگری ئەوە بووم کە دەبێ پرۆسەی وەرگێڕان زیاتر گرنگی پێبدرێت، بەس لە زمانی یەکەمەوە. کاتێک ڕەخنەم لە نووسەرانی کۆن گرت کە ئیشیان لەسەر گواستنەوەی ئەدەبیاتی گەلان نەکردووە، مەبەستم لەوەدا ئەوەیە بڵێم کە ئەوان زمانی یەکەمیان زانیوە و دەیانتوانی ئەو کارە بکەن، بەڵام ئێستا تۆ بێیت فۆکۆ لە عەرەبیەوە بە من بناسێنی و (فرۆید) لە تورکی و (دریدا) لە فارسی و (دۆلۆز) لە عەرەبییەوە هتد... بەڕاستی بەوە زیاتر دوور دەکەوینەوە لە فکر و تێڕوانینی ئەوان، چونکە تۆ لە زمانی دووەم و سێیەمەوە وەرتگرتووە، کە ئەمە دۆخی مانا و دال و مەدلولی چەمک و تێڕوانینەکان دەگۆڕێت، من هەمیشە نموونەی نووسەر و وەرگێڕێکی وەک (هاشم سالح) دەهێنمەوە، کە وەرگێڕێکی سەرکەوتووی دنیای عەرەبە. کارەکانی (محەمەد ئارەگۆن)ی بیرمەند تەرجەمەی عەرەبی کردووە، خۆی خوێندکاری ئارەگۆن بووە، فەڕەنسی زانە و عەرەبی زانێکی باشیشە. ئینجا وەک خۆی دەڵێت: بەترسەوە کار لەسەر فکری ئارەگۆن دەکەم. سەبارەت بە پرسیارەکەش، کێشە لەوەدانییە تەرجەمەی ڕۆمان زیاترە، لە بەرهەمی کورد خۆی، بەڵکو قسە لەسەر ماهیەتی نووسین و دەقە، کە ئێمە چ دەنووسین و چ تەرجەمە دەکەین. ڕەنگە شەپۆلی وەرگێڕانی ڕۆمان لە نووسینی ڕۆماننوسی کورد زیاتر بێت، ئەمەش دیاردەیەکی ئاساییە و بەڵکو یارمەتی دۆخی ئەدەبی ئێمەش دەدات، بەڵام با پرسیارەکە بەوشێوەیە بکەین، بۆ زیاتر ڕۆمانی بیانی دەخوێندرێتەوە و کەمتر لەوە ڕۆمانی کوردی دەخوێندرێتەوە؟! ئەو پرسیارە باس و خواسێکی جددی دەورووژێنێت، کە لێرەدا ڕەنگە بوار نەبێت و بە وردی و پۆختی توێژینەوەی لەسەر بکەم، بەڵام لە دەرفەتی دیکەدا دەتوانین بەیەکەوە بچینەوە سەری.





عومەر ڕەشید

# پێگەی ڕۆمان

## لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامییدا

پێش ئەوەی ئاماژە بە چیرۆک بکەین لە قورئانی پیرۆز و فەرمایشتەکانی پەیامبەردا پێویستە گوزەرێک بکەین بە مێژووی دروستبوونی چیرۆک و ڕۆماندا، چونکە بێگومان بەهەزاران ساڵ پێش هاتنی ئیسلامیش ئەدەب پێگەیەکی فراوان و گەورەی هەبووە لە جیهاندا بەتایبەت چیرۆکە کورت و درێژەکان و حیکایەتەکان، دواجاریش کە قورئان دێت گفتوگۆ لەگەڵ ئەو مرۆڤانە دەکات کە کاریگەرن بە چواردەوریان، کاریگەرن بە شیعر و چیرۆک، بە زمانێکی جیاواز لە قسەکردن، هەرلەبەرئەوە دەبینین قورئان لە بەرزترین ئاستی بەلاغە و فەساحەتدا داڕێژراوە، زانایانی بەلاغە قورئانیان ناوناوە (افصح الكلام)، چونکە لە سەرەتای هاتنی قورئانەوە هەتا کۆتایی جیهان کەس ناتوانێت لە بەرامبەر ئەو ئاڵنگارییەی قورئاندا بوەستێت کە داوادەکات نمونەی ئەم قورئانە یان سورەتێکی تەنانەت ئایەتیش بێنن، بەشێکی ئەم ئیعجازەش دەگەڕێتەوە بۆ لایەنە بەلاغی و هونەرییەکەی، چونکە گێڕەرەوەی چیرۆکە قورئانییەکانی خودی خوای گەورەیە کە خۆی دروستکاری پیت و وشەکانە، هەرخۆیەتی مرۆڤی هێناوەتە قسە و فێری نووسینی کردووە بەهۆی قەڵەمەمەوە.

بەداخەوە لە پاش ئەم پاشخانە ئەدەبی و مەعریفیی و ئیمانییە، پاش نازڵبوونی قورئان و هاتنی پەیامبەر جیهانی عەرەبی و ئیسلامیی یەکەم نەبوون لە نووسینی چیرۆک و ڕۆماندا، ئەمەش لەوانەیە لە هۆکارێک زیاتری هەبێت.

دیاریکردنی سەرەتایەک بۆ ڕۆمان یان بۆ هەر ژانرێکی ئەدەبی تر لەوانەیە زۆر ئاسان نەبێت، بەڵام ئەمەش واتای ئەوە نییە کە سەرەتای ڕۆمان بەتەواوی نادیار و ونبێت «دەقی ڕۆمانێک کە بەشێوەی پەخشان نووسرابێت نەک شیعر، بەیەکەم ڕۆمان لە مێژووی مرۆڤایەتی دابنرێت و تەواوی بەشەکانی مابێتەوە، ڕۆمانی (کەری زێڕینی) ە لە نووسینی نووسەر و فەیلەسوفی ئەمازیغی (لۆکیوس ئەپۆلیوسە – ١٢٥ –١٨٠ز)».

ئەمە وەک سەرەتایەک بۆ ڕۆمانی سەرەتایی لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، بەڵام زۆرێک لە نووسەرەکان سەرەتای ڕۆمانی هونەری لە ئەورووپادا دەگێڕنەوە بۆ سەدەی هەژدە، ئەگەرچی بەشێکیان سەدەی شانزەیان دیاریکردووە، ئاشکراشە پێشەوایەتی ئەم هونەرە ئەورووپا بووە دواتر و پاش زیاتر لە سەدەیەک گوازراوەتەوە بۆ جیهانی عەرەبی و ئیسلامی، ڕۆمانی عەرەبی ڕاستە بە زمانی عەرەبی نووسراوە، بەڵام لەژێر هەیمەنەی خۆرئاوادا ماوەتەوە، ئەمە جگەلەوەی خاڵی بووە لە زۆربەی بنەما سەرەکییەکانی ڕۆمان، بەڵام بەشێوازێکی گشتی لە ڕیزی ڕۆماندا ئەژمارکراون، «یەکەم دەرکەوتنی ڕۆمانی عەرەبی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٦٧ لە سەرەتاوە لەژێر دوو کاریگەریدا عەرەب ڕۆمانی نووسیوە، یەکەمیان سۆزیان بۆ ڕابردوو، دووەمیان سەراسیمەبوونیان بە خۆرئاوا و هەیمەنەیان لەو بوارەدا... لە جیهانی خۆرئاوادا سێ سەدەی تێپەڕاندووە، بەڵام لە جیهانی عەرەبییدا سەدەو نیوێک».

ئەم دەرکەوتنە بەشێوەیەکی هونەری خۆی نەنواند، ئەگەرچی وەک سەرەتایەک بۆ ڕۆمانی عەرەبی دیاریکرا، بەڵام جیهانێکی شێواو و دوور لە بنەماکانی ڕۆمان بووە، ئەمەش بۆ هەموو کایەکانی ژیان ڕاستە، کە بە قۆناغی شێواوی و کرچ و کاڵی دەستپێدەکات، بەرەو کامڵبوون هەنگاو دەنێت، بێگومان ئەمە بۆ ڕۆمانی خۆرئاواییش ڕاستە چۆن بۆ ڕۆمانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامییش ڕاستە، دیارە کۆتایی بەم سەردەمەش دێت، واتا سەردەمی کرچ و کاڵی ڕۆمانی عەرەبی، پاشان سەردەمی ڕۆمانی هونەریی عەرەبی لەدایک دەبێت، ئەویش بە حسێن هەیکەل (١٨٨٨ – ١٩٥٦) دەستپێدەکات «پێش جەنگی یەکەمی جیهانی ڕۆمانی عەرەبی لە قۆناغێکی شێواویدا بوو، دووربووە لەو بنەما هونەریانەی بۆ ڕۆمان دیاریکرابوون ئەمەش بەردەوام بوو هەتا ڕۆمانی (زەینەب)ی نووسەری میسری حسێن هەیکەل، ئیتر تەواوی ڕەخنەگران کۆکبوون لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕۆمانە هەنگاوی یەکەمی ڕۆمانی هونەری عەرەبییە، ئەم ڕۆمانە باسی لە واقیعی گوندنشینانی میسری دەکرد، کە پێشتر ڕۆمانی عەرەبی لەوبارەیەوە نەبوو».

پاشان ڕۆمان لە ئەوروپادا دەست بەنوێبوونەوە دەکات، نوێبوونەوە لە زمان و داڕشتن و تەکنیک و ئاراستەکردندا، دووبارە لەمەشدا جیهانی ئەوروپا دەستپێشخەربوون «لە ساڵی ١٩٠٠ بەدواوە بەشێوەیەکی بەرچاو چەمکی نوێبوونەوە (الحداثة) بەکارهاتووە، چونکە هەموو بوارەکان بە بەراورد بە ڕابردوو نوێبوونەوەی بەخۆیەوە بینیبوو، دەتوانین بڵێین لەو مێژووەدا چەمکی نوێبوونەوە جیهانی کردبووە دووبەش».

بەڵام قۆناغی خۆماڵیکردنی ڕۆمان و نوێبوونەوەی ئەم هونەرە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامییدا و زۆر لە دوای ئەو بەروارەی ئەوروپا سەریهەڵدا، بەشێک لە نووسەران ئەو شانازییە دەگێڕنەوە بۆ چیرۆکنووسی میسری نەجیب مەحفوز (١٩١١-٢٠٠٦) تەنانەت دەسپێکی ئەو قۆناغەیان بەناوی ئەوەوە ناوناوە «قۆناغی نەجیب مەحفوز، قۆناغی ڕیشەداکوتانی هونەری ڕۆمانە، ئەم قۆناغە بە بەهێزترین قۆناغ ئەژمار دەکرێت لە بەرامبەر قوناغەکانی پێش خۆی، لەم قوناغەدا ئاسۆکان بەڕووی نووسەرانی ڕۆماندا کرانەوە، بەشێوەیەک گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەی میسریدا کرد.... ڕۆمانەکانی نەجیب مەحفوز بەم قۆناغانەدا تێپەڕیوە: مێژوویی، کۆمەڵایەتی، فەلسەفی».

## چیرۆکەکانی قورئان و فەرمودەکان

«ئەو پانتاییەی لە کتێبی خودا بۆ چیرۆک تەرخانکراوە پانتاییەکی فراوانە، بڕواناکەم هیچ بابەتێکی تر ئەو پانتاییەی داگیرکردبێت، چیرۆکەکان چارەکێکی قورئانیان داگیرکردووە ئەگەر زیاتریش نەبێت، لەکاتێکدا قورئان سی جزمە نزیکەی هەشت جزمی چیرۆکە».

ئەم گرنگیدانە زۆرەی خوای گەورە بە گێڕانەوەی چیرۆکەکان واتای گەورە دەگەیەنێت، ئەویش ئەوەیە کە چیرۆک کاریگەری بێوێنە لە زیهن و ژیانی مرۆڤدا دروست دەکات، ئەمە لەکاتێکدا فەرمایشتەکانی پەیامبەریش خاڵی نین لە سەدان چیرۆک و گێڕانەوەی بەسود، لێرەوە دەتوانین بگەینە ئەو ڕاستییە کە سەرەتای چیرۆکی ئیسلامیی و جیهانی ئیسلامیی دەگەڕێتەوە بۆ خودی قورئان و فەرموودەکان. کەواتە کتێبی یەکەم و دووەمی مسوڵمانان بە ئاستێکی بەرز گرنگیانداوە بە چیرۆک و گێڕانەوەکان، ئەگەر مسوڵمانان ئەم لایەنەیان بەهەند وەرگرتایە بە سەدان ساڵ نەدەکەوتنە پاش خۆرئاوا لە نووسینی ڕۆماندا. کورتە چیرۆکەکان لە جیهانی ئیسلامییدا پێش ڕۆمان کەوتوون ئەمە بەپێچەوانەی ئەوروپاوە، لەوانەش ڕیشەی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ چیرۆکە قورئانییەکان کە زۆربەیان بەشێوەیەکی کورت باسکراون.

کاتێک کە لەجیهانی ئیسلامییدا ڕۆمان سەرهەڵدەدات بەتایبەت ڕۆمانی خەیاڵی، یەکسەر دەکەوێتە بەرهێرشی زۆرێک لە موفتییەکان و مۆرکی حەرامی لێدەدرێت، ئەم حاڵەتە هەتا ئەمڕۆش بەردەوامی هەیە، لەوانەیە ئەمە بۆ بوارە هونەرییەکەش ڕاستبێت،

هەتا ئەمڕۆش ململانێی حەرام و حەڵاڵی مۆسیقا و نواندن و پەیکەرتاشی بەردەوامی هەیە. ئەوان ڕۆمان دابەش دەکەن بەسەر خەیاڵی و واقیعیدا، هەرچی چیرۆکی واقیعییە وەک ئەوانەی لە قورئان و فەرمووده و بەشێک لە کتێبی نووسەرە ئیسلامییەکاندا هاتوون حەڵاڵن، لەبەر واقیعی بوونەکەیان، هەرچیش زادەی خەیاڵ و ئەندێشەی مرۆڤەکانە و ناواقیعین بە بەڵگەی ئەوەی درۆن حەرامکراون، لێرەوە جیهانی ئیسلامیی و نووسەرە مولتەزیمەکان دەکەونە بەردەم دووڕیانێک ئایا بۆ دەرچەیەک بگەڕێن کە ڕۆمانە خەیاڵییەکان بەحەڵاڵ بزانێت، یان لەبەر حەرامییەکەی دەستی لێ هەڵبگرن و لەکایەیەکی تری حەڵاڵدا بنووسن، لانیکەم چیرۆکە واقیعییەکان بنووسنەوە، بۆیە سەیردەکەین چەندان کتێبمان لە کتێبخانە ئیسلامییەکاندا هەیە کۆکەرەوەی چیرۆکە واقیعییەکانن، ئەگەرچی ئەمانەش سەرچاوەیەکی باشی ئەدەبی ئیسلامین، بەڵام بەبێ ڕۆڵی خەیاڵ لە دارشتنی چیرۆک و ڕۆمانەکاندا ئەدەبی ئیسلامیی ناتوانێت هاوشانی جیهان هەنگاوەکانی هەڵگرێت.

> **«ڕۆمان دەقێکی ئەدەبی خەیاڵی گێڕانەوەیە، زۆرجاریش واقیعییە، باس لە کۆمەڵە کەسێك دەکات بەچواردەوری ڕووداوێکی گرنگەوە، ڕۆمان ئاوێنەی ژیان و ئەزموون و بەدەستهێنانی مەعریفەیە»**

ئیتر لێرەوە و لە جیهانی ئیسلامییدا کۆمەڵە نووسەرێکی نامولتەزیم یان دژەئاین سەرهەڵدەدەن کە دەنووسن بەبێ ئەوەی گوێ بە خیتابە ئاینییەکە بدەن، تەنانەت هەندێک جار ڕۆمانەکانیان بەکارهێناوە بۆ لێدان لەو جۆرە خیتابە یان لە خودی دینەکەش، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە تێکرای ئەو جۆرە ئەدیبانە لە دژی ئەو فەتوایانە بەو جۆرە نووسیویانە، بەڵام دواجار جیهانی ئیسلامیی خاڵی نەبووە لەو نووسەرانەی کە هیچ پابەندیەکیان بە ئیسلامەوە نەبووە. کاتێک پرسیار لە لیژنەی فەتوای سعودی دەکرێت دەربارەی حەڵاڵی ڕۆمانی خەیاڵی بەم جۆرە وەڵام دەدەنەوە:» حەرامە مسوڵمان ئەم چیرۆکە درۆیینانە بنووسێت، لە قورئان و فەرمودەکان و وتەی زانایاندا چیرۆکی ڕاست و واقیعی و بەسود هەن ئەوانە بەسن».

ئەگەرچی لە بەرامبەر ئەم جۆرە فەتوایانەدا قسەی جیاواز هەن، هەندێک وتوویانە ئەگەر گێڕانەوە خەیاڵییەکان سودێکیان هەبێت لەسەر ئاستی تاک یان کۆمەڵگا، حەڵاڵە بەڵام

تەنها بۆ کات بەسەربردن بێت حەرامە. هەرووەک چۆن هەمان جۆرە فەتواش بۆ مۆسیقاش دراوە. لەوانەیە لەملاولا بۆچوونی سێیەمیش هەبێت «هیچ کات لە بەهای خوێندنەوە کەم مەکەنەوە، کاتێک دەبینن خۆرئاواییەکان لە سەرشەقام و وێستگەکانی شەمەندەفەر و پاسدا کتێبێکیان بەدەستەوەیە و دەیخوێننەوە، زۆر بیستوومە وتراوە ئەوان چیرۆک و ڕۆمانی خەیاڵی دەخوێننەوە ئەوەش تەنها کات بەسەربردنە، ئەم قسەیە تەواو نییە، چونکە ڕۆمانە خەیاڵییەکانیش سودی زۆریان هەیە، لانیکەم باشترە لە نەخوێندنەوە و غەیبەتکردن».

## هۆکارەکانی دواکەوتنی ڕۆمانی ئیسلامیی:

بەدیقەتدان لەڕووی کات و تەنانەت جیهانی بوونی ڕۆمانەکانەوە دەبینین دنیای عەرەبی و ئیسلامی دواکەوتووە و هەندێک جار لە پێشکەوتنەکانی خۆشیان پاشەکشەیان کردووە:

ـ لەوانەیە یەکێک لە هۆکارەکانی دواکەوتن و پاشەکشەی ڕۆمانی ئیسلامیی بگەڕێتەوە بۆ فەتوای حەرامی ئەگەرچی لەگەڵ ئەوەشدا جیهانی عەرەبی و ئیسلامیی خاڵی نەبووە لە ڕۆمانی زۆر بەهێز و کاریگەر، تەنانەت بەشێک لە ڕۆمانەکان لەلایەن کەسانی مولتەزیم بە ئاینی ئیسلامەوە نووسراون.

ـ ئەشکرێت هۆکارێکی تری سستی ڕۆمانی ئیسلامیی بگەڕێتەوە بۆ سستی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی، بەپێچەوانەی ئەو بۆچوونەوە کە پێیوایە تەکنەلۆژیا جێی بە ئەدەب لێژ کردووە، هەتا ئێستاش ڕۆمانە جیهانییەکان لەو وڵاتانە دەنووسرێن کە تەکنەلۆژیا تیایاندا لە ئاستێکی زۆر بەرزدان، چونکە تەکنەلۆژیا نەست و ڕۆح و خەیاڵی مرۆڤەکان وەلادەنێت، تەنها ئیش لەسەر ڕواڵەت و لایەنی دارایی دەکات، بۆ لەئامێزگرتنی ئەو لایەنانەی تەکنەلۆژیا دەیانخاتە پەراوێزەوە ئەدەب دێت باوەشیان بۆ دەگرێتەوە، هەرئەمە وایکردووە پیرەژنێک یان پیرەپیاوێکی خۆرئاوایی چەندان سەعات خەریکی خوێندنەوەی چیرۆکێکی خەیاڵی بێت «کاتێک وەک یارییەکی زیهنی دەڕوانین بۆ ڕۆمان دەبێتە یەکێک لە چالاکییە عەقڵییەکان، هەر لەبەرئەوە ڕۆمانە گەورەکان بەرهەمی ئەو کۆمەڵگایانەن کە لە لوتکەی بەدەستهێنانی داهێنراوە زانستی و تەکنەلۆژی و سیاسی و ئابورییەکانن، لەهەمانکاتدا لەو کۆمەڵگایانەدا لە پاشەکشەدایە کە دەناڵێنن بەدەست قەیرانی ڕۆشنبیری و ژیاری، لەبەرئەوە ئەم هونەرەیان کورتکردووەتەوە لە چەند بەڵگەنامەیەکی تۆمارکراودا کە توانای ئەوەی نییە بیگەیەنێتە لوتکەی جوانی و داهێنانی خەیاڵی».

ـ هۆکارێکی تر ئاستی خوێندنەوە و خوێنەرە لەڕووی چەندێتییەوە، خوێنەر کەمترە بە بەراورد بە خۆرئاوا، لەڕووی چۆنێتیشەوە خوێنەری جدی و ناجدی ڕۆڵی هەیە، خوێنەر باشترین پاڵپشتی ماددیی و مەعنەوییە بۆ نووسەر، بەتایبەت خوێنەری جددی، چونکە زۆرجار خوێنەری کوشندە هەم نووسراوەکە و هەم نووسەرەکەش دەکوژێن.



د. عەبدوڵڵا ڕەحمان

# ڕەنگدانەوەی حوجرەی ئایینی لە چەند ڕۆمانێکی کوردیدا

هەرچەندە حوجرە بەشێکە لە دامودزەگا و دامەزراوەی مزگەوت، بەڵام لە هەموو بەشەکانی دیکەی مزگەوت چالاکترە و بەکارترە، بەتایبەتیش وەکو دامەزراوەیەکی پەروەردەیی لەناو مزگەوت پێگە و پایەی دیار و بەرچاوی هەبووە، چونکە لەڕێگەی حوجرەوە درێژە بە چالاکییەکانی مزگەوتەکان دراوە و لەوێوە مەلا پێگەیەندراوە و ئامادەکراوە بۆئەوەی بچنە مزگەوتەکان وەکو بەڕێوەبەری ئەو دەزگا و دامەزراوە ئایینییە دەستبەکاربن. بۆیە ئەگەر مزگەوت لەڕووی ئایینییەوە بناغە و بنچینەی کۆمەڵگە بێت، ئەوا حوجرە بە بناغە و بنچینەی مزگەوت دادەنرێت. لە حوجرەکاندا یاسا و ڕێسای تایبەت بەخوێندن و ئاستەکانی خوێندن هەبووە و جۆرێک لە کولتووری تایبەت بەخۆی هێناوەتە ئاراوە.

حوجره سەرەڕای ئەرکە ئایینییەکەی، ئەرکی بڵاوکردنەوەی خوێندەواریی و ڕۆشنبیریشی لەئەستۆ بووە. سەرەڕای ئەمانەش ئەو مزگەوتانەی کە حوجرەیان هەبووە، پێگە و پایەیان زیاتر بووە و ناوبانگیان دەرکردووە. لە ڕابردوودا تاکە مەڵبەندی ڕۆشنبیریی و پەروەردە مزگەوتەکان بوون، حوجرەش ڕۆحی ئەو مەڵبەندە ڕۆشنبیریی و پەروەردەییانەی پێکهێناوە. لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە حوجرە بەپێی پێشکەوتنەکانی ڕۆژگار بەرەوپێشەوە بچێت و فراوانتر ببێت و لە چوارچێوەی مزگەوت بێتەدەر، بۆ نموونە لە تەنیشت مزگەوتەکاندا باڵەخانەی تایبەتی هەبوایە و ئاستەکانی خوێندنی زیاتر بکردایە و ڕۆڵی دامودەزگایەکی پەروەردەیی زیاتری بگێڕابا، بەهەرحاڵ ئەو بابەتە زۆری دەوێت و ئێمە لێرەدا تەنیا جەخت لەسەر لایەنی حوجرەکان دەکەینەوە کە چۆن لەناو ڕۆمانەکانی کوردیدا لای لێکراوەتەوە و باسی کراوە.

لەم چوارچێوەیەدا لە ڕۆمانی (پێشمەرگە)ی (ڕەحیمی قازی)دا لە هەندێک دیمەندا ئاماژە بە ڕۆڵ و چالاکییەکانی حوجرە کراوە و بەشێک لە سروشت و خەسڵەت و سیماکانی لە ڕەوتی ڕووداوەکەدا باسکراوە. لەوکاتەی کە ڕەوتی ڕووداوەکان دەگاتە (بەردەڕەش) و کارکتەرێکی وەکو (میرزا قۆیتاس) دەردەکەوێت، ڕۆماننووس ئەو کارەکتەری بەخوێنەران دەناسێنێت و باس لە وێستگەکانی ژیانی دەکات و ئاماژە بەوە دەکات کە لە منداڵیدا لە حوجرەی فەقێیان خوێندوویەتی ((میرزا قۆیتاس لەکاتی منداڵیدا لە حوجرەی فەقێیان وەک سوختە هێندێکی لەلای مەلا خوێند بوو و گەیشتبووە (مریشکە ڕەشە)، مەلا ئەو ڕۆژەی گەیشتبووە سورەتی (عەبەسە وەتەوەللا، ئەن جائەهول ئەعما وەما یودریکە لە عەللەهوو یەززەککا)، بەمیرزا قۆیتاسی گوتبوو(قۆیتاس، عەبەسە، یانی خوێندن بەسە، وەتەوەللا یانی بوویە مەلا، وەما یودریکە، یانی بوویە گوێرەکە، جا ئێستا بۆ مەلا مریشکە ڕەش گەڕەکە...) زڕدایکی مریشکەڕەشەی بە قۆیتاس نەدابوو، بۆ مام مەلای بەرێ و ئەویش دەستی لە خوێندن هەڵگرتبوو)) (پێشمەرگە، ل٩٣).

ڕۆماننووس بەشێک لە ڕەوشی ناو حوجرەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە و ئاماژە بەوە دەکات کە فەقێ چەند قۆناغێکی خوێندن دەبڕیت و هەر قۆناغێکیش ناوێکی هەبووە کە لێرەدا قۆناغی سەرەتا بووە و بە سوختە ناسراوە. هەروەها ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو جۆرە خوێندنەی حوجرە پێویستی بەوە کردووە فەقێ لە کۆتایی هەر بەشێکدا دیاری بۆ مەلا ببات، دیارە مەلاش خۆی داوای کردووە و داواکارییەکەشی بەئایەتێک لە قورئانی پیرۆز تێکەهەڵکیش کردووە. بەپێی ئەو زانیارییانە بێت کە ڕۆماننووس ئاماژەی بۆ کردووە هەر فەقێیەک ئەو دیارییە نەبات، دیارە لە خوێندن بێ بەش بووە، هەروەکو (میرزا قۆیتاس) کە زڕدایکی ئەو دیارییەی نەداوەتێ، لە خوێندن دابڕاوە. ئەم ڕەوشە ئەوەش دەگەیەنێت کە تاکە ڕێگای خوێندەواری بوون لەو سەردەمەدا حوجرەی

مزگەوتەکان بووە و ئەویش لەبەر گەلێک هۆکار بۆ زۆرینەی خەڵکەکە نەگونجاوە یاخود توانای ئەوەیان نەبووە بخوێنن.

ڕۆماننووس لە بەشێکی دیکەدا زیاتر ڕۆدەچێتە ناو ژیانی حوجرەوە و بەتایبەتیش باسی ڕێورەسمی ڕۆژانی هەینی دەکات، کە ڕۆژێکی پیرۆزە لەلای خەڵکی ((لەلای ئێمە مەلایەک هەبوو کە نێویان نابوو مەلا خت فس، ئەوەش لەبەرئەوە بوو کە ئەو مەلایە بەو دوو قسەیە یانی بە خت فس زۆر توورە دەبوو. فەقێکانی ڕۆژی جومعە دەچوون ڕاتبەیان دەکرد ڕۆن و برنج و مریشکیان وەکۆ دەکرد و بە ئیبشتیاوە پڵاو مریشکیان لێ دەنا و کاتێک وێڕای مەلا وە کۆدەبوونەوە جووعمە پڵاو و گۆشتەکەی بخۆن گورپە بۆریان لێ وەژوو دەکەوت، فەقێکان لە ترسی مەلاکان نەیاندەوێرا بڵێن ختە ـ فسە و مەجبور بوون بەنێوی دیکە گورپەکە دەنگ بدەن، یەکێک دەیگوت وەحە! ئەوی تر هەچە، سێمی کس ـ کس! بەڵام گورپەبۆر گوێی لەو قسانە ڕانەدەگرت وە کیهە تکە گۆشتی چەوری دیبایە دەیڕفاند چەند ڕۆژێک ئەو کارە دووپاتە بووە و ئیتر یەکێک لە فەقێکان حەجمینی لێ بڕا، ڕۆژێک کە نانیان دەخوارد وەگورپەبۆر وەژوور کەوت گوتی: (وەڵڵا مەلا بشمکوژێ ختیش و فسیش) (پێشمەرگە ل ١١٨). لەم دیمەنەدا ڕێورەسمی ڕۆژی هەینی لە حوجرە خراوەتەڕوو، کاتێک فەقێکان لە ماڵەکانەوە برنج و ڕۆن و مریشکیان کۆدەکردەوە و ئەو کارەشیان ناونابوو (راتبە) کە خۆی واتای مووچە دەگەیەنێت و لەو ڕۆژەدا بەیەکەوە لەگەڵ مەلادا پڵاو و مریشکیان خواردووە، ئەمەش دەربڕی ئەوەیە کە پەیوەندییەکی گونجاوی کۆمەڵایەتی لە نێوان مەلا و فەقێیەکاندا هەبووە و مەلاش بەشداری چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی فەقێکانی کردووە. ڕۆماننووس ئەو دیمەنەی وەکو تەنز و بەسەرهاتێکی کۆمیدی کۆمەڵایەتی خستۆتەڕوو کە دیارە بەشێک لە ژیانی حوجرە ئەو جۆرە ڕەفتار و هەڵسوکەوت و بەسەرهاتانەی لەخۆگرتووە.

لە ڕۆمانی (ئاشتی کوردستان)ی (محەمەد ساڵح سەعید)دا تەنیا لە یەک دیمەندا ڕۆشنایی خراوەتە سەر ڕۆڵی ئایینی فەقێکان ئەویش لەچوارچێوەی کەلتووری پرسەدایە، کە لە ڕێگای مەنەلۆگێکی تایبەتی (ڕۆستەمەسوور) کە لە پرسەی (ئامە)ی خێزانیدایە ((ڕۆستەمە سوور لەوکاتەدا سەیرێکی مەلای کرد، بزەیەک گرتی، مەلا دەنک دەنک تەزبیحەکەی بەیەکدا دەدا، دەمی دەجووڵاند و سووکە سووکە سەری دەلەقاند. فەقێ ناوەناوە قورئانی دەخوێند و فاتیحەیەکی دادەدا، ئیتر هەموو دەمیان دەجووڵاند)) (ئاشتی کوردستان ل١١٦-١١٧). هەڵبەتە باسکردنی ڕۆڵی فەقێ لێرەدا وەکو چالاکییەکی کۆمەڵایەتییە و ئەوە ڕووندەکاتەوە کە لەو سەرەدەمانەدا بەهۆی بوونی فەقێوە قورئانی پیرۆز لە پرسەکاندا خوێندراوەتەوە، بێگومان ئەو جۆرە کارەش بەهۆی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگەوە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و ئێستا کەسانی تایبەتمەند لە بەرامبەر بڕێک پارە

ئەو کارە دەکەن و وەکو پیشەیەکی لێهاتووەوە.

لە ڕۆمانی (هەرەس)ی (محەمەد موکری)دا لە تاکە شوێنێک باس لە حوجرە و خوێندن لەلای مەلا کراوە، کاتێک (حەمە)ی کارەکتەر خۆزگە بەوە دەخوازێت لەلای (مەلا ڕشید)ی گوندەکەیان بیخوێندایە و فێری خوێندن و نووسین ببوایە، بۆئەوەی لە شتەکانی دەروبەری بگات و شیکردنەوە و لێکدانەوەی دروستی بۆ کردبان ((چەندیان پێ وتم لەلای مەلا ڕەشید بخوێنە با سەوددار بی و فێر بی!! کەچی بەقسەی کەسم نەکرد، هەر خەریکی قیتە قیت بووم، دەنا ئێستا منیش هەندێکم دەزانی و هەندێ تێدەگەیشتم....)) (هەرەس ل٤٥)، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە لە گوندەکەی (حەمە) لەو سەردەمەدا کە کۆماری کوردستان حوکمی گێڕاوە و شۆڕش بەرپاکراوە، هێشتا خوێندن لە حوجرەی مزگەوتەکان و لای مەلا هەبووە، سیستەمی خوێندن، خوێندنی حوجرەکان بووە و هێشتا قوتابخانە لە گوندەکە نەکراوەتەوە.

**لە ڕۆمانی (پێشمەرگە)ی (ڕەحیمی قازی)دا لە هەندێك دیمەندا ئاماژە بە ڕۆڵ و چالاكییەكانی حوجرە كراوە و بەشێك لە سروشت و خەسڵەت و سیماكانی لە ڕەوتی ڕووداوەكەدا باسكراوە.**

لە ڕۆمانی (کوێخا سێوێ)ی (عەزیزی مەلای ڕەش)دا لەچوارچێوەی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی، کە پەیوندی خۆشەویستییە لە نێوان (کوێخا سێوێ) و (عەلی عەزە پێ خواس) کە هاوڕێی منداڵی بووە و هەمیشە بەیەکەوە یارییان کردووە، دواتریش (عەلی) دەبێتە فەقێ و دەچێتە بەر خوێندنی فەقێیەتی. لەم ڕووەوەش ڕۆماننووس لەلایەکەوە ژیان و گوزەرانی فەقێیەتی دەخاتەڕوو، لەلایەکی دیکەشەوە بەشێک لە ڕەوتی ڕووداوەکان بەو دەسپێردرێت و گۆشەیەکی دیاریکراوی لە ژیانی کارەکتەرەکانیش ڕوون دەکاتەوە. ئەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە بەهۆی تەکنیکی فلاش باکەوە وەکو یادەوەرییەک دەگێڕێتەوە. لە سەرەتاشدا ئاماژە بەوە دەکات کە فەقێیەکان لە شوێنی خۆیان کۆچیان کردووە و بەدوای خوێندندا گەڕاون و ڕوویان لە گوندەکان کردووە ((فەقێ عەلی بۆ خوێندن چووە گوندەکانی دەوروپشت. لەو ڕۆژەوە بەتەواوی لەیەکتر دابڕان، مەگەر لەناو سێ چوار مانگان فەقێ عەلی جارێک بەسەردان بهاتبایەوە و یەکتریان بدیتبایە)) (کوێخا سێوێ ل ٢٠١).

له دیمەنێکی دیکەدا ڕۆماننووس ئاماژە بە دیمەنێکی دیکەی تایبەت بە ژیانی فەقێ دەکات، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بژێویی و باری ئابوورییانەوە هەیە، دیارە لەمەشدا کە فەقێکان لە گوندەکانی دەوروپشت و شوێنە دوورەکان بەمەبەستی خوێندن دەهاتنە گوندێکی دیاریکراو، بۆ خواردن و چێشتیش لەماڵەکان دەگەڕان و خۆراک و خواردمەنیان کۆدەکردەوە و ئەم کارەشیان ناونابوو (ڕاتبە)، کە بریتی بوو لەوەی فەقێکان بەناو کوچە و کۆڵانی ناو گوندەکە دەکەوتن و هاواریان دەکرد (ڕاتبە ڕەحمەتان لێ بێت) و ئیدی خەڵکی خواردنی پێ دەدان. ڕۆماننووس ئەو دیمەنەی لەگەڵ پەیوەندی خۆشەویستی تۆمار و تێکهەڵکێش کردووە ((هەموو ڕۆژێ سبەینان و ئێواران فەقێ بۆ ڕاتبە دەهاتنە بەر دەرگای حەوشە دەیان گوت: (ڕاتبە .. ڕەحمەت و لێ... بێت) سێبوری پێ دەهات و تەزووی خۆشی دەخستە دڵییەوە، بەیانی یان نانێک و ئێواران لەگەنێک شیویان دەدا فەقێیان. لەو ڕۆژەوە بۆئەوەی فەقێیەکان سووربن لەسەر ڕاتبەکەیان، کە ڕۆژ وا بوو نەدەهاتن نانەکەی کردە دوو، قاپە شێوەکەشی لە جاران گەورەتر کرد)) (کوێخا سێوێ ل٢١٠). هەر لەم چوارچێوەیەشدا ئاماژە بە پلەکانی خوێندنی فەقێ دەکرێت و چەند پلەیەکی وەکو (سوختە) و (موستەعید) دەستنیشان دەکرێت و بەهۆیەوە ئاستی خوێندنی فەقێ دیاری دەکرێت. ئەوەتا دوای ئەوەی (فەقێ عەلی) دوای شەش مانگ لە خوێندن دەگەڕێتەوە گوندەکەیان، (سێوەسۆر) زوو خۆی دەگەیەنێت و پرسیاری لەبارەی خوێندنەکەیان لێ دەکات (( ئەرێ .. ئێستا سوختەیت، یان موستەعیدیت..؟. فەقێ عەلی زەردەخەنەیەک خزا سەر لێوەکانی و بۆ دووەم جار چاوی لێ بەرزکردەوە. سێوەسۆر کە ئەمەی بینی وەک گوڵ گەشایەوە.

فەقێ عەلی: مرازت لەم پرسیارە چییە..!؟

سێوەسۆر بەشان هەڵتەکاندن: ـ هیچ، بەڵام پێمخۆشە لە خوێندنان هاوراز ڕۆیشتبیت.

فەقێ عەلی: خوا پایەبەرزت کات، نیمچە موستەعیدم.

سێوەسۆر ڕێگەی قسەی بۆ کراوە :ـ لەم نیمچەیە ناگەم..!؟

فەقێ عەلی دیسان بزەیەک دەم و چاوی داگیرکرد و گوتی:ـ لای کۆڵکە مەلایەکان موستەعیدم لای مەلا بەرزەکانیش سوختەمە)) (کوێخا سێوێ ل ٢١١)، لێرەشدا سەرەڕای ئەوەی پلەکانی خوێندنی فەقێیایەتی خراوەتەڕوو، جیاوازیش لە نێوان مەلای زیرەک و بەتوانا و خاوەن زانیاری فراوان لەگەڵ ئەو مەلایە کراوە کە هیچی لەباردا نەبووە و لەناو کۆمەڵگە بە (کۆڵکە مەلا) ناسراون.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆماننووس لە دیمەنێکی دیکە ئاماژە بەو فەقێیانە دەدات کە هێشتا کەم ئەزموونن و شارەزاییان بەتەواوەتی لە ژیانی ئایینی و کۆمەڵایەتی وەرنەگرتووە. ئەمەش لەو کاتەدایە کە (کوێخا سێوێ) بەهۆی تەکنیکی فلاش باکەوە دەگەڕێتەوە دواوەوە

و یادەوەرییەکانی باوکی دەگێڕێتەوە، لەوێشدا ئەوە باس دەکات کە خوشکی باوکی زۆرجوان و بەرچاو بووە و گەلێک داخوازی بۆ هاتووە، یەکێک لەوانە (حاجی حوسێن چاوپیس) بۆ کوڕەکەی داوای کردووە، بەڵام باوکی بەهۆی کەسایەتی خراپییانەوە، نەیداوە. بۆیە ئەوان بەمەبەستی ڕازیکردنیان پەنایان بۆ نووشتە بردووە. کاتێک باوکی دەرگای ماڵەوەیان دەکاتەوە نوشتەکە بەردبێتەوە، بۆیە بۆ لای مەلا دەبات و ئەویش ڕاستییەکانی پێ نالێت. بەڵام کاتێک فەقێیەکانی دەبینێت، بێ هیچ بەربەستێک ڕاستی نووشتەکەی بۆ باس دەکات ((ڕۆژێک فەقێیەک لە جومعانە دەگەڕا، شەو بووە میوانمان. باوکم پێی گوت:ـ کاکە فەقێ بزانە ئەم نووشتەیە بۆچی باشە..؟

فەقێیەکە: لەبەر نەشارەزایی ڕاست و ڕاست گووتی: ئەوە نووشتەی خۆشویستن و حەزلێکردنە، بۆ پیاوێک کراوە بەناوی: هەینی حاجی حوسێن ئۆرمزیار. تاکو دڵی ئافرەتێک ڕاکێش بکات بەناوی: خەیار عەولا کاڕەش.

باوکم خۆی نەشێواند، بۆئەوەی فەقێیەکە هەست نەکات گووتی: بەخوا نووشتەیەکی باشە.!)) (کوێخا سێوێ ل١٨٢). لێرەشدا سەرەڕای ئەوەی کە نیمچە ڕەخنەیەکی لە فەقێ لەڕووی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە گیراوە، ئەوەش خراوەتەڕوو کە پەنا بۆ ڕێگەیەکی ئەفسانەیی وەکو نووشتەکردن براوە و بەمەش ئایین بۆ بەرژەوەندییە دنیاییەکان بەکاربراوە. لەهەمانکاتیشدا ئاماژە بە ڕێ و شوێنێکی تایبەت بە ژیان و گوزەرانی فەقێیایەتی کراوە کە ئەویش (جومعانە)یە، کە تێیدا فەقێیەکان یان لە ماڵەکان میوان دەبوون یانیش خۆراک و خواردنیان لە ماڵەکان کۆدەکردەوە و خۆیان ئامادەیان دەکرد.

لە ڕۆمانی (توانەوە)ی (غەفور ساڵح عەبدوڵڵا)دا ئاماژە بە خوێندنی حوجرە کراوە، کاتێک (قارەمان)ی کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە لە گوندەوە دەهێنرێتە شار و پەیوەندی بە قوتابخانەوە دەکات، یەکڕاست لە پۆلی دووەمی دادەنێن، چونکە پێشتر لە حوجرە قورئانی لەلای مەلای دێیەکەیان خوێندووە، ئەمەش لە گفتوگۆیەکی نێوان (نازدار)ی کچە ئامۆزای (قارەمان) و (هەتاو)ی دراوسێکەیان دەردەکەوێت ((هەر ئەو ساڵە قارەمان لە قوتابخانەی شۆرجەی سەرەتایی کوڕان وەرگیرا، جارێکی دی، هەر لە ڕێگای قوتابخانە لە نازدارت پرسی: ـ چۆن ئەو تازە لە لادێوە هاتووە وەکو ئێمە بووبە پۆلی دووەم: بەهەندێ ڕق و زۆرانی ساویلکانەوە وەڵامی دایەوە: دایکم ئەڵێ قورئانی خەتم کردووە، لەلای مەلا خوێندوویەتی)) (توانەوە ل٢٣٠). لێرەشدا ئەوە دەردەکەوێت کە لەلایەن حکومەتەوە دان بە خوێندنی حوجرەدا نراوە و لە خوێندنی فەرمیدا بۆ قوتابیان هەژمارکراوە.



نووسینی: عەبدولباقی یوسف، ڕۆماننووس و ئەدیبی کوردی سوریا

وەرگێڕانی: ڕێدار ئەحمەد

# کاریگەری ڕۆمان لەسەر

## پێکهێنانی هۆشیاریی و پێکهاتەی فکریی خوێنەری کورد

مرۆڤی کورد بە سروشتی خۆی ئارەزووی لە ڕۆشنبیریی و ڕۆشنگەریی هەیە، ئارەزووی لە ئەدەب هەیە، چونکە قەرەبووی وڵاتەکەی تێدا دەبینێت کە لێی داگیرکراوە. ئەم ئەدەبەش لە نارەحەتی سەراسیمەبوونی لە دەوڵەتەکەیدا باشترین هاودەمە بۆی، نارەحەتی ئەوەی کە داگیرکەران تەنها بەداگیرکردنی دەوڵەتەکەی وازیان لێی نەهێناوە، بەڵکو هەندێکجار سەرکوتیان کردووە و ڕێگرییان لێکردووە لەوەی بەزمانی خۆی قسە بکات، یان جلوبەرگی خۆی بپۆشێت، بەمشێوەیە وایلێهاتووە تەنانەت خەونی گەڕاندنەوەی دەوڵەتەکەشی وەک ناپاکییەکی مەزن تەماشای بکرێت کە شایستەی توندترین سزاکان بێت.

ئەمە ئەو ڕاستییە تراژیدییە کە مرۆڤی کورد لەنێو نەهامەتییەکانیدا لەگەڵ کەسانێکدا دەژی کە بانگەشەی ئەوە دەکەن خۆشیان دەوێت، لەکاتێکدا منداڵ و ژنەکانی بە خراپترین جۆری چەکی کوشندەی کیمیایی دەسووتێنن و بانگەشەی ئەوە دەکەن خۆشیان دەوێت، لەدەمێکدا بە هەزاران کەسیی لە گۆڕی بەکۆمەڵدا بە زیندوویی دەیاننێژن. هەموو ئەم پێشێلکارییە مرۆییە ترسناکانە لەلایەن نامسوڵمانەوە لەگەڵیان ناکرێت، بەڵکو لەلایەن مسوڵمانانەوە دەکرێت، ڕەنگە هۆکاری ئەوەی مسوڵمانان بەسەریاندا هێناوە ئەوە بێت کە کورد مسوڵمان بوون، بۆیە کەس نییە بەرگرییان لێبکات، چونکە ئەوان بەئیرادەی خۆیان ئایینێکیان هەڵبژاردووە کە دەیانچەوسێنێتەوە.

بۆیە پێموایە ئەوان بوێری ئەنجامدانی ئەو هەموو تاوانانەیان نەبووایە ئەگەر کورد بۆ نموونە گاور یان جولەکە بوونایە. بێگومان لێرەدا ئەم ڕاستییە پڕ ئازارە بۆتە هۆکاری ئەوەی هەندێک لە کوردەکان لە ئیسلام هەڵگەڕێنەوە و ڕووبکەنە مەسیحییەت یان بێدینی، یان بێباوەڕی، لە وەڵامی ئەم پێشێلکارییانەی لە سایەی ئایەتەکانی قورئاندا بەرامبەریان دەکرێت، یان ناوی ئیسلامیان بۆ تاوانەکانیان بەرامبەر بە کورد بەکارهێناوە. ئەمەش بەزۆری گەنجەکان لەخۆوە دەگرێت و ڕاستییەکەش ئەوەیە کە ئەم ئیلحادە کاردانەوەیە، نەک ئیلحادێکی سروشتی.

لە ڕۆمانێکمدا بەناوی( الملحد)، یەکێک لە کەسەکانی ناو ڕۆمانەکە دەڵێت:» ئەگەر کورد جولەکە بوایە، سەدان ساڵ لەمەوبەر دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی لەسەر خاکی خۆی دەبوو، کەس نەیدەوێرا بەرد بگرێتە دیواری دەوڵەتەکەیان، ئەوان پێشتر دەوڵەت بوون، تەنانەت پێش هاتنی ئیسلام ئیمپراتۆریەتیش بوون، بەڵام کە ئیسلام هات، باوەڕیان پێهێنا و باوەشیان بۆ کردەوە، بەتێپەڕبوونی کات وەک ئەوەی دوژمنی هەندێک لە مسوڵمانان بن، مسوڵمانەکان لەژێر دروشمی ئیسلامییدا دەستیان کرد بە ستەمکردن لێیان، تا لە ئیسلام دەریان بکەن، لەکاتێکدا کە ئەمان سووربوون لەسەر مانەوەیان بەمسوڵمانێتی و مەنهەجی سوننە و جەماعە و پێشکەشکردنی باشترین کەسەکانیان بۆ خزمەتی ئیسلام، ئەوەش هیچ سوودێکی نەبوو بۆیان، تەنانەت وایلێهات هەندێکیش کوردیان لە نەتەوەی کوردی دادەماڵی، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کورد نین، چونکە تەنانەت ئەو بیرۆکەیەیان قبوڵ نییە کە کورد خزمەتی ئیسلام بکات.

هیچ وەسیلەیەکی کوشتنیان نەهێشتەوە بەکاریان نەهێنابێت بۆ کوشتنیان، بەفیشەک کوشتنیان، لەژێر ئەشکەنجە و برسیکردندا کوشتنیان، لەسەرمادا ڕەقیان کردنەوە و کوشتنیان، بەهەڵواسین کوشتنیان، خنکاندنیان، بە سەربڕین کوشتنیان، بەپانکردنەوە کوشتنیان، بە چەقۆ لێدان کوشتنیان، بەسەرپانکردنەوە کوشتنیان، بە تاک کوشتنیان، بە هەڵمەتی کۆمەڵکوژی کوشتنیان، لە زیندانەکاندا کوشتنیان، بە زیندەبەچاڵکردنیان بە زیندوویی

کوشتنیان، بە گازی ژەهراوی کوشتنیان، بە چەکی کیمیاوی کوشتنیان، منداڵەکانیان بە بەرچاوی دایک و باوکیانەوە کوشت، دایک و باوکیان بە بەرچاوی منداڵەکانیانەوە کوشت. بەڵێ کچەکەم ئەگەر کوردەکان جولەکە بوونایە ئەوا جولەکە ئەم هەموو بەڵایەیان بەسەر نەدەهێنان، ئەگەر مەسیحی بوونایە، مەسیحیەکان کۆمەڵکوژیان بەسەر نەدەهێنان، ئەگەر هیندۆسیی بوونایە، ئەگەر بوودایی بوونایە، ئەگەر هەر بیروباوەڕێکی تریان هەبووایە جگە لە ئیسلام، ئەو هەموو کارەساتەیان بەسەر نەدەهات کە بەسەریان هاتووە، بەڵام کاتێک هەندێک لە مسوڵمانان بە دوژمنی خۆیانیان دانان، لەسەر باوەڕی خۆیان بەجێیان هێشتن، هەموو ئەمانە کچم  بۆ ئەوە بوو تا لە ئیسلام دەریان بکەن.

لەمەشدا بەرانبەر هەندێک لە گەنجەکانمان سەرکەوتووبوون و لە ئیسلامیان هەڵگەڕاندنەوە، کاتێک هەموو ئەمانە لەسەریان کەڵەکەبوون  و هەموویان هەڵگری دروشمی ئیسلامیی بوون و  لە هەندێک قۆناغیی مێژووییدا ڕوویداوە مسوڵمانەکان ڕێگرییان لێ دەکردن تەنانەت بە زمانی خۆیان وشەیەک بڵێن، یان ناوێکی کوردی لە منداڵەکانیان بنێن، تەنانەت پۆشاکی خۆیان لەبەر بکەن،  ئەوەیان لێ  قەدەغەکردن بەزمانی خۆیان یەک پیتیش بنووسن، هەندێک لە گەنجەکانمان لە وەڵامی هەموو ئەمانەدا وازیان لە ئیسلام هێناو هەڵگەڕانەوە، هەیانە مولحیدبوونی خۆی ڕاگەیاندووە، لەکاردانەوەی ئەمەدا بەرانبەر ئەو باوەڕدارە سیاسییانەی کە ئەو جۆرە سیاسەتە پەیڕەو دەکەن و ستەم لە کورد دەکەن و پێیانوایە کورد تەنها لەبەرئەوەی مسوڵمان بوون پێویستە لە قەومیەتی خۆیان دابماڵدرێن و ببنە شوێنکەوتەی ئەمان، وایلێهات گرووپی سیاسی  لەلایەن مولحیدانی کوردەوە دروست بوو.

کەواتە: کورد هیچی تری بۆ نەماوە جگە لەو کەلەپوورە کەلتوورییەی کە لەهەمانکاتدا بۆتە دیوەکەی تری دەوڵەتە ون و دڵخوازەکەی. بێگومان ڕۆمان داوای گێڕانەوەی مافەکانی ئەم گەلە دەکات و لەلایەک شوناسی کوردی لای کورد بەهێز دەکات، هەروەها ئەم مافەی بەبەرچاوی ئەوانی ترەوە زەوتکراوە ڕوون دەکاتەوە، چونکە زۆرینەی کورد بە کوردی نانووسن، بەڵکو بە زمانەکانی دیکەی وەک: عەرەبی و فارسی و تورکی دەنووسن. جگە لە هەرێمی کوردستان کە تاکە هەرێمی کوردە کە ئەوانە بە زۆری دەزانن بۆ کورد و، دەیانەوێ لێیان بسەننەوە و، سەرقاڵی پیلانگێڕین لە دژی  و، دەیانەوێت برسی بکەن، پەیوەندییەکانی لەگەڵ بپچڕێنن، هێرشی ببەنە سەر. دیسانیش هەموو ئەمانە تەنیا لە مسوڵمانانەوە دێت نەک لە کەسی تر، بۆ؟! چونکە ئەوان دڵنیان  کە کورد مسوڵمانە و چەند منداڵ و ژن و پیاویان بکوژێت، چەند ستەمیان لێ بکرێت کەس بەرگریان لێ ناکات.

بەڵێ ڕۆمان هەموو ئەو ڕاستییە تاڵە تۆمار دەکات کە کورد  بەدەستی مسوڵمانان چەشتی، تاکە تۆمەتیان ئەوەیە کە ئەوان مسوڵمان بوون، یەکەم شت کە مسوڵمانان بەسەریان هێنان تاڵانکردنی دەوڵەتەکەیان بوو، تەنانەت هەوڵی تواندنەوەی زمان و دزینی

کەلەپوور و شارستانییەتەکەیان و دەستدرێژیکردنەسەر باشترین ئەدیب و نووسەر و هونەرمەند و سەرکردەکانیاندا. بەڵێ ئەمە ئەو شتەیە کە ڕۆمانی کوردی تۆماری دەکات، ئیدی چ لەلایەن ڕۆماننووسێکی کوردەوە بە کوردی نووسرابێت، یان بە زمانێکی دیکە نووسیبێتی. یەکەم ڕۆمانم بەناوی (بروین) لە ساڵی ١٩٩٧ لە دیمەشق بەشێوەیەکی سەرپێچی لە یاسای بڵاوکردنەوە بڵاومکردەوە، باسم لە کرۆکی ئەم بابەتە کردووە. من سانسۆرم ڕەتکردەوە و گوێم بەوە نەدا یاسا ڕێگە بە چاپکردنی ڕۆمانەکەم نادات، هەموو ئەوانەم گوێ پێنەدا و ڕۆمانەکەم چاپ کرد، ئەوە بوو ڕۆمانەکە دەستی بەسەردا گیراو منیش لەلەلایەن ئاسایشی سیاسییەوە لە دیمەشق دەستگیرکرام.

ڕەنگە ئەم ڕۆمانە لە یەکەمین ڕۆمانە سورییەکان بێت کە داوای مافی کوردی کردووە، ئەمەش لە ڕێگەی ئەو پاڵەوانەی ڕۆژێک لە خەو بێدار بوویەوە و جەستەیەکی دیکەی لەلاشەی خۆیدا بینی، بۆیە کەیسەکەی بوو بە گەڕان بەدوای جەستە ونبووەکەیدا ، چونکە ئێستا بە جەستەیەکی نامۆوە دەژی، خەڵکیش بەم جەستە نوێیەوە دەیانناسیی کە ئەو ئێستا بەوشێوەیەیە، کاتێ باسی لە گەڕان بە دوای لاشە ونبووەکەیدا دەکرد بەشێت تۆمەتباریان دەکرد. ڕۆمانەکە هەروەها باسی مەسەلەی بڵاوبوونەوەی پەیوەندییە سێکسییە لادەرەکانیشی لەخۆگرتبوو. دواتر ڕۆمانی ڕۆهات (روهات)م لە دیمەشق و بەیروت لە ساڵی ٢٠٠٦ بڵاوبوویەوە، لەم ڕۆمانەمدا هاتووە: (مەناف وتی:» ئەوەی دڵخۆشم دەکات دکتۆر، ئەوەیە کە کورد سەرەڕای ئەو هەموو پارچەپارچەبوونە، بەو هەموو هێزەوە دژایەتی دەکرێن کەچی هێشتا زمانی خۆی پاراستووە«.

چونکە زمان ئەو بەشەی نیشتمانیانە کە ماویانە و کەس ناتوانێت لێیان زەوت بکات، بۆیە منداڵی کورد شوێنی لەدایکبوونی هەرکوێ بێت یەکەم شت خۆی فێری ئەلفوبێی کوردی دەکات، هەروەها ژنی کورد ئەگەر لەگەڵ خێزانێکی غەیرە کورد هاوسەرگیری کرد، پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە منداڵەکانی فێری زمانی باوباپیرانی بکات و تەنیا کاتێک هەست بە نزیکبوون لە منداڵەکانی دەکات کە بەم زمانە قسەیان لەگەڵ دەکات، خۆشحاڵە کاتێ دەیانباتەوە بۆ لای ماڵباتەکەی خۆی بە کوردی قسە دەکەن، زمانی کوردی زمانێکی ئاریایی دێرینە و دابەش بووە بەسەر چوار شێوەزاری سەرەکیدا کە لە سێ ناوچەی کوردستان بڵاوبوونەتەوە، شێوەزاری کرمانجی باکوور کە کوردانی تورکیا و سووریا و دهۆک لە عێراق قسەی پێ دەکەن، شێوەزاری کرمانجی باشوور کە زۆرینەی کوردانی عێراق و ئێران قسەی پێ دەکەن، لەهجەیەکی ڕۆژئاوایی هەیە کە لەنێو چەند هۆزێکی پەرتەوازەی کورد بڵاوە.

شێوەزاری باشوور بەسەر سێ بنزاردا دابەش بووە، ئەوانیش: بابانی، سۆرانی، هەورامی و گۆرانییە، سێیەمیان لە دیالێکتەکانی لوڕ و بەختیاریی و لەک پێکدێت، زمانی

کوردی هەزاران وشەی هاوشێوەی ئەو وشانە لە زمانەکانی ئاریان تێدایە، لەوانە خێزانی زمانی سلاڤی و ئەورووپی و خێزانی زمانە ئێرانییەکان، کە جگەلە زمانی کوردی، لە زمانەکانی فارسی، ئەفغان، بەلۆچی و ئەستینی پێکهاتووە.

زمانی کوردی زۆر کۆنە و ئەوەم بۆ ڕەخسا هاوشێوەیی ئەو لەگەڵ کۆنترین زمانی نووسراو کە مرۆڤ ناسییێتی ببینم.

–مەبەستت سۆمەرییە؟

– بەڵێ مەناف، بەم زمانە بە (شجرة) دەگوترێ: دار، بە کوردیش بەهەمان شێوە پێی دەوترێ: دار، بە قولایی دەوترێ: کور، بە کوردیش دەوترێ: کور، بە جۆ وتراوە : شا جۆ، بە کوردی دەگوترێ: جۆ.

کاتێک کە ئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆز دەبینن، بۆتان دەردەکەوێت کە فۆلکلۆری کوردی یەکێکە لە دەوڵەمەندترین فۆلکلۆرەکانی گەلانی جیهان، کە تا ئەمڕۆ لە پاراستنی کەلەپوور و ڕەسەنایەتیی خۆیان بەردەوامە. مرۆڤی کورد لە هەر کوێیەک بێت مرۆڤێکی ئاشتیخوازە، چەندین داستانی میللی لە کەلەپووری کورددا هەیە: زەمبیل فرۆش، کە ئامۆژگاری سەرەکی زۆری بۆ مرۆڤی کورد لەخۆگرتووە.

پیاوەکە بە ژنەکەی دەڵێت: خەونێکی جوانم بینی، کۆشکی زێڕم هاتە پێشچاو و تۆم لەو کۆشکانەدا لە پشتی پەردەکانەوە بەدی کرد وەک پەری ڕاوەستابووی، کاتێ ویستم بێمە ناو کۆشکەکان تا لەگەڵ تۆ بم، لەوکاتەدا پەرییەک دەرکەوت و پێی گوتم: بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی هاتووی، مەچۆرە کۆشکەکان و برۆ وەک گەشتیارێک بگەڕێ، هەژار و دیندار بە، دەستبەرداری نوێژ و ڕۆژوو مەبە، بە پاڵتۆیەکی کۆنەوە هەژارانە بژی، گوێ بگرە و یارمەتی برا هەژارەکانت بدە، نەکەی ببیتە میری ژێر کۆت و بەند، چونکە دەزانی مردن بە حەتمی دێت و دەربازبوون لێی نییە، باشە ئیتر چ پێویستت بە پارەی جیهانە؟ واز لە کۆشک و تەلار و باخەکان بهێنە، کاری چاک و باش ئەنجام بدە تا بچیتە بەهەشت .ئەمە بانگهێشتی پیاوی کورد دەکات بە سادەییەوە بە دونیادا بگەڕێت و، بە خۆشی بژی، خۆشەویستی بچێنێت و تا دەتوانێت یارمەتی خەڵک بدات.

لەپەندی کوردیدا هاتووە: زێڕ، سەرەڕای بەرزی نرخەکەی، پێویستی بە برین هەیە، ئەمەش ئاڕاستەکردنییەتی بەوەی کە دەوڵەمەند هەرچەندی هەبێت، پێویستیان بە هەژارانە.

لە خۆشەویستییەوە دێتە دی، سەبر و ئارامگریی لە چیاکانەوە وەرگرتووە، بەبڕوای من خۆڕاگرترین مرۆڤە لەسەر ئازار، پێموایە ئەمە گرنگترین فاکتەرێکە کە توانیوویەتی تا ئێستا بەبێ نیشتمان بوونی خۆی بپارێزێت و بمێنێتەوە، بەڵکو هۆکاری خۆڕاگریشییەتی لەسەر ئەوەی تەنانەت ڕێگەی قسەکردنی زمانی خۆی و هەڵپەڕینی بەشێوەی میللی خۆی و گۆرانی وتنی لە هەندێک شوێن کە لێییەتی پێنادرێت. تەنیا گەلە کە ژمارەی دانیشتوانی

زیاتر لە ٣٠ ملیۆنە و  سێیەم گەورەترین گەلی ناوچەکەیە لەڕووی دانیشتوانەوە و، یەکێک لە کۆنترین گەلانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و خواروو کە لە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا نیشتەجێبوون، ڕووبەری خاکی کوردستان زیاترە لە دوو لەسەر سێی وڵاتانی جیهانە، هەتا ئێستاش کورد لە هەموو ناوچەکان پەرتەوازەیە  بەبێ ئەوەی ناسنامەیەکیان هەبێت، بێ ئەوەی زمانێکی هەبێت و جیهان دانی پێدا نابێت.

دوای چەند ساتێک بێدەنگی لەکاتێکدا هەردووکیان سەیریان دەکرد گوتی: دەمەوێ ئەوەتان بۆ ڕوونبکەمەوە کە وشەی جیهاد لای مرقی کورد پەیوەستە بەجیهادی خۆشەویستییەوە، ئەو دەکرێت لەپێناوی ئەو کەسەدا گیانی ببەخشێت کە خۆشی دەوێت لەکاتێکدا کە قبوڵی نییە لەپێناوی هەر ئامانجێکدا زیان بە کەس بگەیەنێت. ئەو زۆر شت لەبیر دەکات، زۆریش لێبوردەیە لەپێناوی ئەوەی بە کراوەیی و خۆشەویستی و پەیوەستبوون بەوانی ترەوە لە قسەکردن و پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابووریی و مرۆییەکان بمێنێتەوە. من پێموایە ئەو خۆشەویستییە بەشێوەیەکی کاریگەر بەشدارە لە بنیاتنانی کولتوور و شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا. تەنانەت کاتێک نووسەرێک جگە لە زمانە کوردییەکەی خۆی بەزمانێکی تر دەنووسێت، بەکوردی بیردەکاتەوە و دەنووسێت، بۆ نموونە بە عەرەبی دەنووسێت، لەبەرئەوە ئەم ڕۆمانانە جێی سەرنجڕاکێشانن. ئەدەبی عەرەبی ئەزموونی لەو جۆرەی تێدایە کاتێک هەندێک نووسەری عەرەب بە زمانەکانی دیکە نووسیوویانە، وەک ئەزموونەکانی ئەمین مەعلووف لە ڕۆمانی «صخرة طانيوس»دا کە بە زمانی فەڕەنسی نووسیویەتی، هەروەها کاتب یاسین لە ڕۆمانی نەجمە و هەندێک لە شیعرەکانی مالیک حەداد.

ئەم کارانە خاوەن ناسنامەی کوردین بە زمانی جیاواز نووسراون، چونکە نووسینیان بەو زمانانە ناسنامەی نەتەوەیی کوردییتیان لێ دانابڕێت، هەروەها نووسینەکانی ئەوانەی باسم کردن هەمان ناسنامەی عەرەبی ڕەسەنیان هەیە هەرچەندە بە زمانی ناعەرەبی نووسراون. هەروەک شیعرەکانی مالیک حەداد وایکرد ڕۆشنبیرانی فەڕەنسا بەجۆش و خرۆشەوە لە بەرانبەر داگیرکاری فەڕەنسا لە جەزائیر ڕابوەستن، لێرەدا نۆبەتی ئەو نووسەرانەی کوردە کە سەرکەوتووبوون لە قایلکردنی ڕۆشنبیران و ڕووناکبیرانی عەرەب بۆئەوەی پشتگیری لە کێشەکەیان بکەن.

ئەدەبی کوردی ئەو ئەدەبەیە کە ناسنامەی گەلی کوردی هەڵگرتووە، نووسەری کوردیش ئەو نووسەرەیە کە ویژدانی گەلەکەیەتی و نوێنەرایەتی ناسنامەکەی دەکات، و گەل و نیشتیمانی بە جیهان دەناسێنێت، بۆیە یەکێک لە دەستکەوتە هەرە گرنگەکانی ڕۆمانی کوردی، ئیدی بە هەر زمانێک نووسرابێت ئەوەیە کە توانیویەتی هەستی نەتەوەیی کورد بۆ  نەوەکانی داهاتووی کورد بپارێزێ و بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستان پەرە پێبدات.



عومەر میراودەلی

# قسەیەك لەبارەی ڕۆمانی كوردی و ئەزموونی ڕۆماننووسینی خۆمەوە

مێژووی چیرۆک و ڕۆمانی کوردی بەراورد بە چیرۆک و ڕۆمانی گەلانی ناوچەکە زۆر لە دواوە نیە، بەڵام لە بەرامبەر خۆرئاوا، ئەوا گەلی کوردیش وەک گەلانی ناوچەکە، مێژوویەکی نوێی هەیە و گەلانی خۆرهەڵات بەگشتی زۆر دوای خۆرئاوا دەستیان بەنووسینی ڕۆمان کرد، ئەمەش پەیوەندی بەوەوە هەیە، کە ڕۆمان ژانرێکە لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی سەریهەڵدا و گەشەیکرد، بەواتایەکی دیکە ڕۆمان ژانرێکە بەرهەمی شارە.

کاتێک باسی شۆڕشی پیشەسازی دەکەین، دەبێ باسی چاپخانە بکەین، چونکە ڕۆمان وەک شیعر نییە، کە بەبێ چاپخانە بڵاوبێتەوە، تەنانەت هەندێجار شیعر بەشێوەیەکی زارەکی بڵاودەبێتەوە، بەڵام ئەمە بۆ ڕۆمان نەشیاوە، چونکە ڕۆمان زیاتر بەهۆی چاپەوە، هەلی بڵاوبوونەوەی زیاترە، لەوانەیە ئەمە ئەو پرسیارەش بوروژێنێ، کە بۆچی پێش سەردەمی چاپ سەدان کتێب لەبارەی زانستە ئیسلامییەکان بڵاوبوونەتەوە؟ کە بۆ ئەوانیش بەشێوەیەکی دەستنووس کارێکی ئاسان نەبووە و لەگەڵ ئەوەشدا چەندان بەرگ کتێب لە بوارە جیاجیاکانی زانستە ئیسلامییەکاندا بڵاوبوونەتەوە، ئەمە پرسیارێکی دروستە، بەڵام پاڵنەری نووسینی ئەو بابەتانە زیاتر بووە و وەک ئەرکێکی ئایینی پێویستییەکی کۆمەڵگە ئیسلامییەکان مامەڵەی لەگەڵدا کراوە، بۆیە ناکرێ نکوڵی لەوە بکرێ، کە ڕۆمان ژانرێکی ئەدەبییە، کە ژینگەی سەرهەڵدانی خۆرئاوایە. دەشێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێ، کە خۆرهەڵات هەروەک بیرمەندی ئێرانی (داریوشی شایگان) لە پەڕتووکەکانیدا باسی دەکات، لە خۆرئاوا جیایە و شارستانێتی لێکجیان، بۆیە تەنانەت هەروەک من لە پەڕتووکی خوێندنەوە و ڕاڤەدا ئاماژەم بۆ کردووە، کە لەبەرئەوەی فکری فەلسەفی لە خۆرهەڵات ئامادەیی وەک یۆنان و وڵاتانی دیکە نەبووە، بۆیە شاعیرانی خۆرهەڵات ئەگەر بۆچوونێکی فەلسەفییان دەربڕیبێ بە شیعر دەریان بڕیوە، وەک خەیام و مەولانا، بۆیە خۆرهەڵات زیاتر وەک مەڵبەند و ژینگەیەکی شیعری سەیرکراوە و ڕۆمانیش کردەیەکە، هەرچەندە ئەدەبییە، بەڵام کردەیەکی عەقڵانیشە و خۆرئاواش زیاتر لەو کردە عەقڵانییەدا لەپێشتر بووە و ئەمەش هۆکاربووە بۆئەوەی ئەو ژانرە لەوێ سەرهەڵبدا.

من لە سەرەتاوە وەک زۆر نووسەری دیکەی کورد بە شیعر دەستم پێکرد، دوایی چیرۆکم نووسی، لە هەشتاکان بە ئەندازەی ئێستا کتێب و چاپکراو نەبوو، هەرچەندە خوێنەر و ئارەزووی خوێندنەوە هەبوو، بۆیە ڕۆماننووس کەمبوون، ئێمە خوێنەری ڕۆمان بووین، چ تەمەنی من و چ نەبوونی بوێری بۆ نووسینی ڕۆمان بواری ئەوەیان نەدەدا، نووسەری کورتەچیرۆک پرکێشی نووسینی ڕۆمان بکا، ئەمەش پەیوەندی بە نەبوونی ئەزموونی پێشتری ڕۆمان بوو لە ئەدەبیاتی کوردیدا و جگە لەمە لە وڵاتە ستەمکار و دیکتاتۆرەکاندا ئەوەندەی ڕێگە بە بڵاوکردنەوە و چاپکردنی شیعر دەدرا ئەوەندە ڕێگە بە ڕۆمان نەدەدرا، کە عێراقیش یەکێک بوو لەو دەوڵەتە دیکتاتۆرانە، چونکە ڕۆمان وێڕای ئەوەی، کە ژانرێکی ئەدەبییە، کاریگەری لەسەر گۆڕینی فکریش هەیە، بۆیە لەو وڵاتانەدا، چەندان ڕۆمانی، وەک مەزرای ئاژەڵان و جەنابی سەرۆک قەدەغەبوون، بەڵام دوای نەوەدەکان ڕۆمان و بابەتی دیکەی ئەدەبیی و فکری گەشەیان بەخۆیانەوە بینی و وەرگێڕان چ لە بواری ئەدەب و چ لە بوارەکانی دیکەدا گەشەی کرد و چەندان

ڕۆماننووس دوای ڕاپەڕین دەرکەوتن، من لەو سۆنگەیەوە، کە لە حیزبێکی ئیسلامی کارم دەکرد، فکر بابەتێکی گرنگ بوو، بۆیە لە دوای دووهەزارەوە، کە وازم لە کاری حیزبی هێنا دەستم بەخوێندنەوە لە بواری فردا کرد و کارم لەسەر فکری ئارگۆن و سرووش و شبستەریی و جابری کرد، بەڵام بابەتی ئەدەب بۆ من گرنگ بوو، چونکە پێشتر چیرۆکم نووسیبوو، بۆیە لە ساڵی ٢٠١٦ ڕۆمانی (درەنگی ئێواران)م چاپکرد، هەرچەندە نایشارمەوە، کە دەنگدانەوەیەکی وای نەبوو، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار: یەکێکیان خوێنەر بەگشتی کەمە و ڕەخنەگرانی ئەدەبیش کەمن، بۆیە ڕانان و لێکۆڵینەوە لە بەرهەمە ئەدەبییەکان کەمە، جگەلە ڕۆماننوسێکی وەک بەختیار عەلی، کە بەردەوام قسە لەسەر ڕۆمان و نووسینەکانی دەکرێ و شایانی قسەلەسەر کردنیشە، لە ٢٠١٩ ڕۆمانی (بۆن و دیدەنی باران)م چاپکرد، کە چ بۆ خۆم و چ بۆ هاوڕێ نووسەر و خوێنەرەکانم درەنگی ئێوارانیان بەلاوە پەسەندتر بوو، بەڵام من لە هەردوو ڕۆمانەکەدا، کە زیاتر سیاسەت بەسەر هەردووکیاندا زاڵە وەک هەر دەقێکی ئەدەبی، کە خوێندنەوەی جیاجیا هەڵدەگرێ، ئەویش دەشێ خوێندنەوەی جیاجیای چ لەڕووی فکر و چ لەڕووی شێوازی نووسین و ئاستی ئەدەبی بۆ بکرێ. من لە هەردوو ڕۆمانەکەدا، کە دەشێ هەریەکێکیان بەجیا قسەی لەسەر بکرێ، چونکە بابەتەکەیان جیایە، بابەتێکم وروژاندووە، کە بەشێکە لە پرسێک، پەیوەندی بەفکری منەوە هەیە، ئەویش پرسی ڕۆشنبیر و گۆڕانکارییە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا، کە کۆمەڵگەی ئێمەش بەشێکە لە کۆمەڵگەی خۆرهەڵات.

دیارە ڕۆمان پێش ئەوەی باسی هەربابەتێک بکا، ژانرێکی ئەدەبییە بۆیە لایەنی ئەدەبی و فەنتازیا و ئیستاتیکا گرنگن، دەشێ دوو ڕۆماننووس هەردووکیان باسی یەک بابەت بکەن، بەڵام ئەوەی لە یەکدییان جیادەکاتەوە لایەنە ئەدەبییەکەیە بۆیە ڕۆمانێکی وەک (چاوەکانی) بزورگی عەلەوی ڕۆمانێکی سیاسییە، بەڵام سیاسی بەو مانایە نا وەک گوتارێکی سیاسی باسی سەردەمی شا بکا، بەڵکو ڕۆمانەکە ئەدەبیات و خەیاڵ داگیری کردووە، چونکە کاتێک ڕۆماننووس بۆئەوەی کار لە هەست و خەیاڵی خوێنەر بکات دەبێ لە ڕۆمانی لەو چەشنەدا خۆی لەوە ببوێرێ، کە ڕاستەوخۆ باسی ستەمی سیاسی سەردەمی شا بکا، بۆیە لە ڕێگەی چاوەکانی ئافرەتێکەوە، خەیاڵی خوێنەر بۆ ئەو بابەتە دەبا، کە ڕۆماننووس ویستوویەتی باسیبکا، من لە ڕۆمانی (بۆن و دیدەنی باران) دا، کاتێک باسی سەرەتاکانی ڕاپەڕین دەکەم ئەگەر باسی ئەوەم بە زمانێکی سیاسی کردبا، کە دەسەڵاتداران گەندەڵییان کردووە و دڵسۆز نەبوون بۆ وڵات و خەڵک ئەوا دەبوو بە وتارێکی سیاسی، بۆیە من باسی ئەوەم کردووە، کە لە سەرەتای ڕاپەڕیندا بۆنێکی خۆش بڵاودەبێتەوە، بەڵام وردە وردە ئەو بۆنە نامێنێ، خەڵکی شار بەخوێندەوار و نەحوێندەوارەوە باسی ئەو بۆنە دەکەن، تاکو یەکێک دەڵێ لەوەتەی شۆڤڵەکانیان

بەرێکردوون بۆنەکە نەماوە، ئەمە فەنتازیا و خەیاڵە، بەڵام لەو ڕێگەیەوە ویستوومە مەبەستەکە بگەیەنم، دەشێ ڕۆمانووس بەبێ ئەو فەنتازیا و خەیاڵی سیحرییە، کە ڕۆماننووسانی ئەمریکای لاتین تێیدا باڵادەستن باسی ڕووداوەکان بکا، بەڵام دەبێ لە چێژی ئەدەبی و زمانی ئەدەبی بێبەش نەبێ.

هەرچەندە زمانی ڕۆمان جیایە لە شیعر، بەڵام هەردوکیان لە زمانی ئاخاوتن جیان و لە بنەڕەتدا ئەرکی ئەدەب ئەوەیە زمانی ئاخاوتن تێپەڕێنێ، بۆیە جیاوازی ڕۆمانێک لە ڕۆمانێکی دیکە مەرج نییە بەهۆی گرنگی ئەو بابەتەوە بێ، کە ڕۆماننووس هەڵیدەبژێرێ، بەڵکو گرنگییەکەی زیاتر لەوەدایە، کە ڕۆماننووس تا چەند توانیویەتی بەسەر زماندا زاڵبێ و زمانی ڕۆمانەکەی زمانێکی ئەدەبی بێ، زۆرجار دوو ڕۆماننووس یەک بابەت هەڵدەبژێرن، بەڵام ئەوەی ئەو دوو ڕۆماننووسە لەیەکدی جیادەکاتەوە، زمانە ئەدەبییەکەیە.

بەداخەوە دوای ڕاپەڕین لەچاو ئەو ڕۆمانانەی، کە نووسراون، ڕەخنە لای لێنەکردوونەوە، کە دەیان ڕۆمان شایانی هەڵوێستە لەسەرکردن بوون، بەڵام چەند ساڵێکیان بەسەردا تێپەڕیوە، ڕەخنەگرێک، خوێنەرێک باسی نەکردووە، ئەم حاڵەتە بەراورد بە پێش ڕاپەڕین جیاوازە، هەرچەندە پێش ڕاپەڕین ژمارەی ڕۆماننووسەکان کەم بوون، بەڵام ڕۆمانێکی وەک (شاری حسێن عارف) کە ئێستا دەیان ڕۆمانی ئاوا هەیە- لێرەدا مەبەست لەوە نییە لە گرنگی ئەو ڕۆمانە کەم بکەینەوە، کە بۆخۆم دوای چەندان ساڵ لە بیرەوەریمدا ماوەتەوە- ئەوکاتە چەندان وتاری لەسەر نووسرا، بەڵام دوای ڕاپەڕین، دەیان ڕۆمان بڵاوبوونەوە، هەروەک ئاماژەم بۆ کرد باسیان نەکرا، جگە لە ڕۆمانەکانی بەختیار عەلی، کە ئەوانیش وەک پێویست نەبوون، لەوبارەوە من جارێک قسەم لەگەڵ ئازاد عەبدولواحیدی ڕەخنەگر کرد، گووتی ئێستا ڕۆماننووس زۆربوون ڕەخنەگر نازانێ لەسەر کامەیان بنووسێ.

دوای سەرهەڵدانی ڕێکخراو و حیزبی ئیسلامی، جگە لەو گوتارە ئیسلامییەی، کە کاریان بۆ دەکرد، ئەدەبیش بووبە بەشێک لەو گوتارە ئێسلامییە، بەواتایەکی دیکە، ئەگەر پێشتر ئەدەبێک نەبووبێ بەناوی ئەدەبی ئیسلامی ئەوا لەپاڵ گوتاری ئایینی، سیاسی ئیسلامیدا، ئەدەب و هونەریش ڕەهەندی ئایینییان وەرگرت، من لە سەرەتای نەوەدەکان لە بڵاوکراوە ئیسلامییەکاندا بانگەشەی ئەدەبی ئیسلامیم دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی وازم لە کاری سیاسیی و حیزبی هێنا و دەستمکرد بە خوێندنەوە و نووسین و بە فکری کەسانی وەک ئەرەگۆن و سرووش و شبستەریی و جابریی و ئەوانی دیکە ئاشنابووم و چەند کتێبێکی ئەدەبی و فکریم نووسین و لەو چەند ساڵانەدا دوو ڕۆمانم چاپکرد، لەو ڕایەی پێشووم پەشیمان بوومەوە ئەگەر خودای گەورە بۆم وەبری کارە چاکەکانم بکا

سوپاس بۆ خوا، بەڵام وەک بۆچوون، من لە چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیشدا ڕامگەیاندووە، کە بڕوام بە ئەدەبی ئیسلامی و مارکسی و مەسیحی و نەتەوایەتی نییە، ناڵێم ئەو ئەدەبە نین، نوسەرێکی وەک کازانتزاکی کاتێک خوێنەر ڕۆمانەکانی دەخوێنێتەوە هەست بەدەنگ و ڕەنگی مەسیحیەت دەکا و وەک زۆر لە خوێنەران دەڵێن، کە ڕۆمانەکانی دەخوێننەوە لە خودا نزیک دەبنەوە، ڕای من لەوبارەوە ئەوەیە، کە ئەدەب موڵکی مرۆڤایەتییە و بێلایەنە من کاتێک کازانتزاکی دەخوێنمەوە لەبەر ئاستی بەرزی ئەو ڕۆماننووسەیە نەک فکرەکەی، کاتێک خۆرئاواییەکیش تەماشای زنجیرە تەمسیلی یوزارسیف دەکا، کە زنجیرەیەکی سەرکەوتوو بوو و ئێرانییەکان لەو بوارەدا شارەزان لەبەر ناوەڕۆکەکەی سەیری ناکەن، بەڵکو ئەوان لایەنی هونەرییان بەلاوە گرنگە، کە هەر بینەرێکی هۆشیار ئەو لایەنەی بەلاوە گرنگە.

دەشێ هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی ڕۆمان وێڕای ئەوەی، کە باسی ئەوەمانکرد، کە ژانرێکە و پەیوەندی بە سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازیی و گەشەی شارەوە هەیە، بەڵام دەکرێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێ، کە مرۆڤ کاتێک وێڕای زمانی ڕۆژانە، بۆ گوزارشتکرن لەخۆی پەنای بۆ زمانی شیعر بردبێ، کە من ئەم بابەتەم لە پەڕتووکی (زمانی دەق)دا باسکردووە، دەشێ کاتێک مرۆڤ هەستیکردبێ، کە شیعریش وەک پێویست ناتوانێ ئەوەی مرۆڤ دەیەوێ بەهۆیەوە دەری ببڕێ، پەنای بۆ ڕۆمان بردبێ، ئەمە بەو مانایە نییە، کە ڕۆمان وەک ژانرێکی ئەدەبی جێگەی شیعری گرتبێتەوە، چونکە دوای سەرهەڵدانی ڕۆمان و بڵاوبوونەوەی بەجیهاندا شیعر شوێنگەی خۆی پاراست و ڕۆمان جێگرەوەی شیعر نەبوو، بۆیە دوای سەرهەڵدانی ڕۆمان شیعر گرنگی و بایەخی خۆی لەدەست نەدا، ئێستاشی لەگەڵدابێ لەپاڵ ڕۆماندا شیعر پێگە و گرنگی خۆی هەیە، کاتێک باسی ئەوە دەکرێ، کە زمانی ڕۆمان پەخشانە و زمانی شیعر زیاتر مۆسقایە و کاریگەری ڕاستەوخۆی زیاتر هەیە لە ڕۆمان، ئەوە بەومانایە نییە، کە ڕۆمان ژانرێکی عەقڵی و شیعر ژانرێکە مامەڵە لەگەڵ سۆزدا دەکا، ئەوە پێناسەیەکی سواوی شیعرە، چونکە شیعریش وێڕای هەست و سۆز کردەیەکی عەقڵییە، بۆیە زۆر لە فەیلەسوفەکان یەکێکی وەک نیتشە شیعری نووسیوە، شیعرەکانی خەیام و زۆر شاعیری دیکە، ئەوەندەی عەقڵ و فکر و جیهانبینی لە شیعری ئەو شاعیرەدا زاڵە ئەوەندە سۆزێکی ڕووتی دوور لە عەقڵانییەت زاڵ نییە، بۆیە ئاساییە بگوترێ وێڕای ئەوەی، کە هەر ژانرە سنور و تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەڵام لەیەکدییەوە نزیکن.



# ڕۆمانی کوردی

## بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)

ئامادەکردن: بوار نوورەدین

ئەم بیبلیۆگرافیا تایبەتییە، کەڵکی لە پڕۆژەی بیبلیۆگرافیا کورد و کوردستان وەرگرتووە، کە ٥٦٨٠ کتێبی تێدا ناسێنراوە و لە ٥٢٠٦ لاپەڕە پێکهاتووە و بەسەر ١٢ بەرگ و بەشدا دابەشکراون، تایبەت کراوە بەو کتێبانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠- ٢٠١٠دا، لەبارەی «کورد و کوردستان»ەوە نووسراون، کتێبی نووسراوی بە هیچ زمانێکی تر لەخۆنەگرتووە. ئەم بیبلیۆگرافیایە تایبەتییەی ڕۆمانی کوردی، دوو تەوەرەی سەرەکییە، یەکەمیان ٢٨ کتێبە کە لە نێوان ساڵانی ٢٠٠١- ٢٠١٠دا، بەشێوەیەکی سەربەخۆ نووسراون، تەوەرەی دووەمیش ٦٢ کتێبی ساڵانی ١٩٥٢- ٢٠١٠یە، کە لە پێڕستدا، لێکۆڵینەوە، یان بابەتیان لەبارەی ڕۆمانی کوردی نووسیوە. لە هەردوو تەوەرەکەدا، کتێبەکان بە دوو ئاڕاستە خراونەتەڕوو، باری «ناسنامە»ی کتێبەکان: ناوی نووسەر، وەرگێڕ –ئەگەر هەبوو- دەزگای چاپ، چاپخانە، نۆبەتی چاپ، شوێنی چاپ، ساڵ، ژمارەی لاپەڕە و پێوانە. دووەم ئاڕاستە، جگە لە ناونیشانی کتێبەکە، ناوەرۆکی کتێبەکان نووسراونەتەوە، بۆئەوەی (لێکۆڵەر، خوێنەر، بەکاربەر) بزانێ کتێبەکە باسی چی دەکات.

لەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەروەک تەواوی پڕۆژەکە، کتێبەکان بە پێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بە پێی «تیپ»ەکانی زمانی کوردی ڕیزکراون، ناونیشانی کتێبەکانیش، وەک خۆیان نووسراونەتەوە.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەتر و «پانی»ی پێش «درێژی»ی نووسراوە)

چاپ.: نۆبەتی چاپ

چ.: چاپخانە

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ز.: زانکۆ

س.: ساڵ

ش.: شوێن

کۆڕ.: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد

ل.: لاپەڕە

و.: وەزارەت

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە

ISBN: International Standard Book Number ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب

## تەوەرەی یەکەم: کتێبی سەربەخۆ ٢٠٠١- ٢٠١٠

**١- ڕۆمان بەرەو کوێمان دەبات؟ هەوڵدانێکە بۆ خستنەڕوی هەناسە قوڵەکانی مرۆڤ بە خوێندنەوەی چەند ڕۆمانێکی نەمر**

نووسین: سامان فەوزی

چاپ.: یەکەم، چ.: ئاسا، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٤، س.: ٢٠٠١، ل.:١٢٩، پ.:١٤×٢٠

ناوەڕۆک: پێشەکی/ هونەری ڕۆمان و چەند سەرەقەڵەمێک/ ئێستێک لە میوانداریێتیی گیانی زۆربا/ تێکشکانی مەوداکان لە خۆشەویستیی سەردەمی کۆلێرادا/ توندوتیژییەکانی نێو هاواری بێدەنگ دەیانەوێ چی بڵێن؟/ نەمری دەبەنگی دیستۆفسکی لە خۆشەویستیی ژیان دایە/ نەهیلزم لە ڕۆمانی نامۆدا/ شەبەنگی خەمەکانی ئێوارەی پەروانە/ ڕامانێک لە سیدهارتا و سەرەتایەک بۆ چەمکی ئیرادە/ ناوەڕۆک.

**٢- خوێندنەوەی کتێب- ڕۆمان و چیرۆک/ کوردی- بیانی**

نووسین: جەبار جەمال غەریب

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٢، س: ٢٠٠٢، ل:١٨٠، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: پێڕست/ ڕۆمان: گوڵی شۆڕان/ ئێوارەی پەروانە/ ئاوێنە سەرابییەکان/ خۆری تار/ شەمشەمەکوێرەکانی گومەز/ چیرۆک: ئەسپیدیلۆن/ ڕاو لە نێچیری موکریدا/ شاعیر لە بۆنی چیرۆکدا/ هەژان لە سێبەری زماندا/ چوارنان/ خەمەکانی پاییز/ وێنەی خوشکت/ کەمتیار/ چەند وردە یادێکی مەییو/ سڵاو: سوڵتانی دیل.

**٣- وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانسیی کوردیدا**

نووسین: عەبدولقادر محەمەد ئەمین

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤٢٢، س: ٢٠٠٢، ل:١٩٧، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکی/ بەشی یەکەم: وێنەی شیعری/ وێنەی شیعری و پێناسە/ وێنەی شیعری و هێما/ وێنەی شیعری و ئەفسانە/ وێنە و زمانی شیعری/ بەشی دووەم: ڕۆمانسییەتی کوردی و هۆکارەکانی/ ساڵانی ١٩٣٠ و قۆناغی ڕۆمانسی/ خەسڵەتەکانی ڕۆمانسی کوردی/ نیشتمان پەروەری/ سروشت/ ئافرەت/ ڕەگەزی ئەندێشە/ بنیاتی وێنەی تاک/ بنیاتی وێنەی تاک بە هۆی ئاڵوگۆڕی هەستەوەرەکانەوە/ بنیاتی وێنەی تاک بە هۆی ئاڵوگۆڕی درکپێکراو/ بنیاتی وێنەی تاک لە ڕێگەی لێکچوون و وەسفی ڕاستەوخۆوە/ بنیاتی وێنەی گشتی/ بنیاتی بازنەیی/ بنیاتی برگەیی/ بنیاتی ئەفسانەیی/ بەشی سێیەم: بنیاتی دەق و وێنە/ وێنە و دەقی من و ئەستێرەکان/ وێنە و بنیاتی ماتبوونی بازنەیی لە دەقی پاییزدا/ وێنە و دەقی نێرگسی دیلان/ وێنە و دەقی لەدایکبوونی ئینسانێک/ وێنە و دەقی شیعری ئەی ڕەقیبی دڵدار/ ئەنجام/ پەراوێزەکان/ سەرچاوەکان/ ناوەرۆک.

**٤- بونیاد- زمانگەری لە خوێندنەوەی ڕۆماندا- ژانی گەل وەک نموونە**

نووسین: محەمەد نووری ئەحمەد

بڵاوکراوەی ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاک

چاپ: یەکەم، چ: خاک، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٧٠، س: ٢٠٠٤، ل:٣٣٦، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: دەروازە/ بەشی یەکەم: لێکنەچوونە زەمەنییەکان/ بەشی دووەم: تەکنیکی زەمەنی گێڕانەوەکان (جووڵەکان)/ بەشی سێیەم: سیستمی دیاریکردن و دیاری نەکردن (کات-شوێن)/ بەشی چوارەم: پرۆسەی وەسفکردن (وەستاندنی وەسفی)/ بەشی پێنجەم: کردارەکان/ پاشکۆ/ سەرچاوەکان.

**٥- بینای کات لە سێ نموونەی ڕۆمانی کوردیدا ژانی گەل، شار، ڕاز-لێکۆڵینەوەیەکی تیۆری، پراکتیکی، ڕەخنەیی**
نووسین: نەجم خالید نەجمەدین ئەڵوەنی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٠، س: ٢٠٠٤، ل:٣٧٤، پ:١٦×٢٢
ناوەرۆک: پێڕستی ناوەرۆک/ بەشی یەکەم: جۆرەکانی کاتی ڕۆمان لەڕووی تیۆری و پراکتیکییەوە/ بەشی دووەم: بینای کاتی ڕۆمان لە ئاستی سیستەمدا/ بەشی سێیەم: جۆرەکانی جووڵانەوەی تێکستی ڕۆمان/ ئەنجام/ پێڕستی سەرچاوەکان.

**٦- ساڵی پەروانە- هەڵوەشاندنەوەی ئێوارەی پەروانە لە دووتوێی ساڵی ئاشووب دا**
نووسین: تەها ئەحمەد ڕەسووڵ
چاپ: یەکەم، چ: گەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥٠، س: ٢٠٠٥، ل:١٠٦، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: سەرەتایەکی بێ ناونیشان (لێرەدا ئاماژەی بەوە کردووە کە سەرنجی و تێبینی لەسەر ڕۆمانی ناوبراو هەیە و سەرنجەکان بێ ناونیشانن و ١٠٩ دانەن).

**٧- جە د ڕۆمانا کوردی یا دەڤەرا بەهدینان دا- گەریان ل بابێ بەرزە و دۆزەخا سپی وەم نمونە**
نووسین: ڕەمەزان حەجی قادر
بڵاوکراوەی یەکێتیی نووسەرانی کورد–لقی دهۆک
چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ٧٦، س: ٢٠٠٦، ل:٢٦٦، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: پێشەکی/ دەروازە: ڕۆمانی کوردی/ بەشێ ئێکێ: جە ب ڕەنگەکی گشتی/ جە/ ڤالایی/ جە د ڕۆمانێ دا/ جهێ هونەری و جهێ ژیاریێ/ کارتێکرنا جهی ل سەر کەسی/ کارتێکرنا کەسی ل سەر جهی/ جە ل لایێ کوردان/ جە د فۆلکلۆرێ کوردیدا/ جە ل لایێ هۆزانڤانێن کورد/ ناڤ و نیشان بۆ کارێ هونەری/ گەریان ل بابێ بەرزە/ دۆزەخا سپی/ بەشی دووێ: دەربارەی سالوخدانێ/ سالوخدان شێوازەکە بۆ بەرجەستەکرنا جهی د ڕۆمانێدا/ پێناسا سالوخدانێ/ ئەرکێ (وەزیفێ) سالوخدانێ/ جورێن سالوخدانێ/ ڤەگێران و سالوخدان/ سالوخدانا جهی/ سالوخدانا کەسی/ سالوخدانا تشتی/ سالوخدان د ڕۆمانا (گەریان ل بابێ بەرزەدا)/ سالوخدان د ڕۆمانا (دۆزەخا سپی)دا/ بەشێ سێێ: جە و پەیوەندیا کەسایەتی/ ئاڤاکرنا جهی و کەسایەتیا ڕۆمانێ/ ناڤ بۆ کەسایەتیێ د ڕۆمانێدا/ پێکهات و سەرچاوێ کەسان/ پێشکەشکرن و هەلسەنگاندنا کەسان/ جۆرێن کەسان/ گرینگییا کەسان/ ئاستێ پەیوەندیان د نەقەبا جهی و کەساندا/ جهێ ئاشنا/ جهێ نە ئاشنا/ جهێ بێ لایەن/ ئەنجام/ لیستا ژێدەران/ کورتییەکا لێکۆلینێ ب زمانی عەرەبی و ئینگلیزی/ ناوەرۆک.

**٨- خولیای مەیموونە سپییەکان لە چیرۆک و رۆمانی کوردیدا**

نووسین: ڕەئووف حەسەن

بڵاوکراوەی بزاڤی ڕۆشنبیریی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: بزاڤی ڕۆشنبیری، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٥٨، س: ٢٠٠٦، ل:١١٦، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: پانۆرامایێکی خێرا/ ئەنجام/ سەرچاوەکان.

**٩- دەربارەی رۆمان**

نووسین: مەهدی ساڵح

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپ: ؟، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ١٨، س: ٢٠٠٦، ل:٩١، پ:١١×١٧

ناوەرۆک: پێشەکی/ دەروازەیەک بۆ نێو جیهانی ڕۆمان/ زمانی نووسینی ڕۆمانەکان/ ڕۆمانی کوردی و ڕاپەڕین/ کەلەپوور و ڕۆمان/ ژانی ڕۆمان/ ڕۆمان و ڕووداوەکانی مێژوو/ ڕۆمان و سینەمای هاوچەرخ/ ئەو ڕۆمانەی کۆتایی نایەت/ نووسەر لە چەند دێڕێکدا.

**١٠- رۆمانێک لە گفتوگۆدا- گفتوگۆ و بیروڕای نووسەران دەربارەی شاری مۆسیقارە سپییەکان**

ئامادەکردن: ئەنوەر حسێن

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری-بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٧٥، س: ٢٠٠٦، ل:١٨٤، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: پێشەکی: ئەکرەمی میهرداد/ فایلێک بۆ شاری مۆسیقارە سپییەکان/ چاوپێکەوتن لەگەڵ: بەختیار عەلی/ شێرکۆ بێکەس/ شێرزاد حەسەن/ ڕەئووف بێگەرد/ ئازاد بەرزنجی/ غەفوور ساڵح عەبدوڵڵا/ ئەکرەمی میهرداد/ پەیوەند عومەر/ هەمزە شەشۆیی/ لەتیف فاتیح فەرەج/ کۆڕێک دەربارەی شاری مۆسیقارە سپییەکان/ مەریوان هەڵەبجەیی/ ئەم هەولە بۆچی؟: ئامانج شارباژێڕی/ چاپکراوەکانی نووسەر.

**١١- ڕێگا باریکەکان- رۆمانە یاداشت**

نووسین: ئاوات قارەمانی

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣١٥، س: ٢٠٠٦، ل:٧٢٨، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: یادداشتی قارەمانی: عەبدوڵڵا کەریم مەحموود (لێرەدا نووسراوە: لەم یادداشتە پڕ سەروەرییەی کاک «ئاوات قارەمانی»دا، لە ساڵی ١٩٦٣وە تا ١٩٩٩ هەزاران دیمەنی ٣٦ ساڵی تەمەنی پڕ لە ڕەنج و قوربانی و هەناسەی بەردەوامی

پێشمەرگایەتیی شۆڕشی ئەیلوول و شۆڕشی نوێ دەبینین... هەروەها نووسراوە: باسی ڕۆڵی بێوێنەی شەهید ئارامی لە ناو شار و تۆڕی دەسەڵاتی ئەمن و ئیستخبارات و «تەواری» و سوپای عێراق و جاسووسەکاندا کردووە، لە ژووره بچکۆلەکەی گەڕەکی «سەرشەقام»دا، جارێکی تر زنجیرە ڕێکخستنەکانی بەغدا و خانەقین و شارەکانی کوردستان، لە «کۆمیتەی هەڵمەت»دا، بەشێوەیەکی نوێ و نهێنیپارێز، ڕێکخستۆتەوە...)/ بە ژمارە ناونیشانی بۆ داناوە کە ٩٤ ژمارەیە/ تێبینییەک لەسەر کتێبەکەی کاک مەحموود سەنگاوی دەربارەی گەرمیان و مەفرەزەی سەرەتایی/ تێبینی نووسەر لە چەند دێڕێکدا/ لە لاپەڕە ٦٦٧- ٧٢٨ وێنەی تایبەت بە بیرەوەرییەکانە کە لەسەر ئارت چاپکراون و هەندێکیان ڕەنگاوڕەنگن- لە ژێر وێنەکانیشدا زانیاری تەواو نووسراوە.

**١٢- گفتوگۆ لەسەر خوانی خوێنین- کۆڕۆمانێک لە ئەنفال**

نووسین: حەمە کاکەڕەش

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٩٦، س: ٢٠٠٧، ل:١٩٦، پ:١٤×٢٠

پێڕست/ دەستپێک/ بەختیار عەلی/ هەندرێن/ ئەحمەدی مەلا/ هیوا قادر/ ئیسماعیل حەمەئەمین/ شێرزاد حەسەن/ گۆران بابا عەلی.

**١٣- بەرەو.. ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان**

نووسین: عەبدوڵڵا سەڕاج

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٢، س: ٢٠٠٧، ل:٢٠٩، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: تەوەری ڕۆمان/ ئەم تەوەرە بۆ؟/ ڕۆمان-پێناسە-بنەما-تێبینی/ ڕۆمانی نوێ و زمانی ئەفراندن و پانتاییەکانی/ بەرەو ئاستانەی ڕۆمانی نوێ/ لە پاش ڕۆمان و هەڵوێستێک/ ڕۆمان لە نێوان سینەما و خوێندنەوەدا/ وا دەڕوانمە فانتازیا/ وشە لە ڕۆماندا/ بەرەو ڕەسەنایەتی/ بەشی دووەم: گۆشەنیگا/ گۆشەنیگاکان/ پێڕستی بابەتەکان.

**١٤- ڕۆمانی کوردی- خوێندنەوە و پرسیار- بەشی یەکەم**

نووسین: سابیر ڕەشید

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ١٠، س: ٢٠٠٧، ل:٣٢٦، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: هەندێ بابەتی وەک: چەند سەرنجێک دەربارەی ڕۆمانی کوردی/ ڕۆمانی

له کامیارانەوە لەگەڵیان دەچێت بۆ ماڵی مامۆستا لە کرماشان، وەک خۆیان دەڵێن، مەبەستیان بوو شتێک لە زمانی خودی مامۆستاوە دەربارەی ئەو بڕیاری ڕێکەوتنەی نێوان هەردوولا کە لێرە کراوە ببیسین، ناوەڕۆکی چییە؟ چۆنێتی جێبەجێکردنی؟ ئێستە پێویستە لەوبارەوە چی بکرێت؟ ئەوان شتێکی ئەوتۆیان لەمبارەوە نەزانیوە، وەک پێویستی کاری ئیخوانی ئاوارە لە ئێراندا سەیریانکردووە، لەبەرئەوەی لەژێر گوشاری ڕژێمی بەعسدا سەرگەرمی کاری خۆیان بوون، بێدەنگییان لێکردووە و زۆر بەدوایدا نەچوون، لێرە پێویست بە گێڕانەوەی هیچکام لە قسەکانی ئەو دیدارە ناکات، ئەوەندە بەسە بڵێم کەوتبوون بەسەر کۆمەڵێ قسەی توند و ڕەقی مامۆستا صەلاحدا و بەنیگەرانیەکی زۆرەوە گەڕابوونەوە.

### سەردانەوەیەک و زامی شورا

له سەرەتای مانگی (١٠)ی ئەم ساڵەدا تەنها بەمەبەستی سەردان و لە نزیکەوە بینینی دۆخی ئێستای کوردستان و بەسەرکردنەوەی ژمارەیەک لە برایان و دۆستان، سەردانی سلێمانی و هەڵەبجەی تازە و ناحیەی زەڕایەنم کرد، یەکێک لە سەردانەکان دیداری کاک ئەیوب و کاک ئیکرام بوو لە ماڵی کاک ئەیوب لە گەڕەکی شەهیدانی ئازادی، لەمیانەی گفتوگۆی کاری ئایندە و چونێتی خۆڕێکخستنەوە و پێکهاتنی نوێ لەگەڵ کاری برایانی ئیخواندا لەسەر ئاستی کوردستان و لەگەڵ ئەو قیادەی مامۆستا صەلاح و هاوکارانی، لە قسەکاندا ئەوان گووتیان پێکەوە کارکردن و تێکەڵکردنی ڕێکخستن بێ ڕێکەوتنی نوسراو و مەرجی نوێ نابێت، منیش بە بەرائەتێکەوە گووتم: جا ئەگەر ئەزانن ڕێکخستن و ئەندامی ئێمە زۆرترە، با سەرەتا یەکبگرین و دواتر هەڵبژاردن دەکرێت بۆ دیاریکردنی سەرۆک و شورا و ئۆرگانەکانی تری جەماعەت، گەروابێت بەدڵنیایی هێڵی ئێمە براوە دەبین، هەردووکیان سەیرێکیان کردم و کاک ئیکرام گووتی: هەڵبژاردنی چی؟ ئێرەش بەدەردی شوراکەی ئەودیو دەبەن، مەگەر زۆرمان لەو هەڵکڕان تا ئێستا ئەو تەجروبە دوبارە بکەینەوە؟ من بێدەگیم لێکرد و ئەوانیش چارەیەکی تریان نەخستەڕوو.

کێشەی دەرنەچوونی مامۆستا صدیق بۆ شورای ئیخوانی دەرەوە لە ئێران، بوویە خاڵێکی خولگەیی لە هەر باس و گفتوگۆیەکی یەکخستن و یەکڕیزی لەگەڵ مامۆستا صەلاح و هاوکارانی، بوویە کراسەکەی عوسمان، بەڵام کراسێک خوێنی پێوەنییە، بەڵکو ئالاوە لە گرێیەکی دەروونی ڕێکخستنی کۆمەڵێک گەنجی دڵگەرم و لەخۆبوردو کە بانگەشەی ئینتما بۆ ئیخوان دەکەن؟ پێیانوایە براکانیان غەدریان لێکردوون.

### کێشەی دەق و واقیعی نوێ

ئەو کورتەیەی لەسەرەوە ئاماژەم پێکرد، دەربارەی دەستپێشخەرییەکانی کار و جوڵەی مامۆستا صەلاح و هاوکارانی لە قیادەی ڕێکخستن-بەوئەندازەیەی لەمنەوە دیاربوو- لە ناوەڕۆکدا هەوڵی دروستکردنی ئەمری واقیعێکی نوێ بوو، کە بۆدواتر کاریگەریی لەسەر چۆنێتی مامەڵە لەگەڵ لایەنی هێڵی مامۆستا صدیق و ئەگەری گەڕانەوە بۆ بابەتی دەقەکانی ڕێکەوتنەکەی نێوانیان دادەنێت، چونکە وەک دەڵێن هەمیشە لایەنی بەهێز تەفسیری دەقەکان دەکات.

بارودۆخی کوردستان تاڕادەیەکی باش ئاسایی بوویەوە، ژمارەیەکی زۆر لە ڕێکخراوی خزمەتگوزاری مرۆیی نێودەوڵەتی لە بوارە جیاجیاکاندا لە هەرێم دەستبەکار و جێگیربوون، زۆربەی هەرەزۆری ئاوارەکانی تورکیا و ئێران پەیتا پەیتا دەگەڕانەوە بۆ کوردستان، حکومەتی عێراق لە ڕێکەوتی ١٩٩١/١٠/٢٢دا بەفەرمی کشاندنەوەی دامودەزگا ئیدارییەکانی لە ناوچەکانی کوردستانی سەروو هێڵی ٣٦ ڕاگەیاند بەرەی کوردستانی بەکردەیی بوویە دەسەڵاتی دیفاکتۆی بەدیلی حکومەتی عێراق.

بەگەڕانەوە بۆ پەیوندی نێوان ئەم ڕووداوە گەورەیەی کە دۆخی ناوچەکە و کوردستانی داڕشتوەتەوە و لە سایەیدا واقیعێکی نوێی هەمەلایەنی سیاسیی و کۆمەلایەتیی و ئابووری تەواو گۆڕاوی سەپاندووە، لەگەڵ بڕگەی یەکەمی بڕیاری ڕێکەوتنی نێوان هێڵی ڕێکخستنی مامۆستا صدیق و ڕێکخستنی ئیخوانە عێراقییەکانی دەرەوە لە ئێران بە لێپرسراوێتی مامۆستا صەلاح، کە لەڕووی قەبارەییەوە چواندبووم بە پەیوەندی نێوان »گوێز و گومەزی».

لێرە و لەوێ باس لە گەڕانەوەی مامۆستا صدیق و مامۆستا صەلاح هاتە ئاراوە، بیستنی وەها قسەیەک دەبێت بتباتەوە بۆ چارەنووسی بڕیاری ڕێکەوتنی ١٩٨٨/١١/٩ی نێوان ڕێکخستنی ئیخوانی دەرەوە لە ئێران و هێڵی مامۆستا صدیق، بڕگەی یەکەمی بڕیارەکە بەسراوە بەگەڕانەوە بۆ عێراق و دەقەکەی دەڵێت:((یەکەم: پابەندیی هەموو برایانی کاری ئیخوان لە ناوخۆی عێراقدا بەرامبەر سەرکردایەتی گشتی کاری ڕێکخستنی ئیخوان دەبێت لە عێراقدا)).

ئەگەر لەسەر ئەم دەقەی بڕیارەکە ڕاوەستین، ئەوا نەک هەر ئەوانەی ئاگاداری بڕیارەکەن دەزانن و لایان ئاشکرایە کە ئەو دۆخەی ئێستا هاتووەتە پێش تەواو جیاوازە لەوەی لە دەقی بڕگەی یەکی ئەو بڕیارەدا نووسراوە، بەڵکو ئەوانەشی لە دەرەوەی ئەم جەریانەبوون بەخوێندنەوەی دەقی بڕگەکە لەو ڕاستییە تێدەگەن.

کەواتە ئەگەر ئەم بڕیارە بایەخی ئەوەی هەیە کە وەک گرێبەستێکی کاری هاوبەش

ئیلتزامی بۆ هەردوولا دروستکردووە سەیربکرێت، ڕێگەی دروستی چارەسەر بۆ پاراستن و بەردەوامکردنی یەکڕیزیی و یەکڕەوتی و یەک مەنهەجی و یەک ئینتمایی بۆ فراوانکردنی کۆمەڵەی ئیخوان، ئەوەیە هەردوولای بە کەسی یەکەم یان بەلیژنەیەکی باڵای هەردوولا لە کۆبوونەوەیەکی هاوبەشدا بگەنە ڕێکەوتنێکی نوێ بۆ تێپەڕاندنی قۆناغی بڕیاری ڕێکەوتن و دامەزراندنی دەستپێکێکی نوێ، ئەگەر بەگریمانەی ئەوەی هەردوولا نەگەیشتنە چارەسەرێکی گونجاو کە خواست و تموحەکانی هەردوولا جێگە بکاتەوە، ئەوا دەگەنە سیغەیەکی تری هاوکاریی، هیچی لەمانە نەکرا، چونکە ئەو بڕیاری ڕێکەوتنە لەلای هەردوولاوە تەنها و تەنها بۆ تێپەڕاندنی قۆناغەکە بوو، بۆیە بەزۆری بە وتی وتی و لە ڕێگەی هەواوە پەیامەکانیان ئاڕاستەی یەکتر دەکرد.

### ئەمیری نوێ و قەیرانی نوێ

لەم سەروبەندەدا ئەو قسەیە هاتە ناوەوە کە مامۆستا صدیق وتوویەتی: من تاسەر سنور پابەند دەبم، مامۆستا صەلاح لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی: لەم ماوەیەدا بیستمان کە مامۆستا صدیق وتوویەتی کە چوینەوە ئیلتزامەکەمان نامێنێ و ڕێکەوتنمان لەگەڵ ئەم برایانە و ئەم جەمعە تا تەوێڵەیە. ل١٢٢. (تەوێڵە شارەدێیەکی سەرسنوری عێراق ـ ئێرانە).

وەک لەسەرەوە ئاماژەم بە (دروستکردنی ئەمری واقیعدا) مامۆستا صەلاح لە وەڵامی ئەم قسانەی مامۆستا صدیقدا بەو زمانە قسەدەکات و دەڵێت: ئەمە هەڵەیە لەودیو پەیکەرێکی کار هەیە و هەمووان ئەبێ ئیعترافی پێ بکەین، مەبەست ئەو ئەنجومەنە بوو کە لە ١٩٩١/٣/٢٠دا پێکهێنرا. هەمان ل١٢٢. بەهەمانشێوە دەنگۆی ئەوە کەوتە ناوەوە، کە گوایە سەرکردایەتی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لە دەرەوە مامۆستا صەلاحیان ڕاسپاردووە کە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و بەرپرسیارێتی کاری ئیخوان لە کوردستان بگرێتە دەست، خۆشی لە یاداشتەکانیدا لە باسی گەڕانەوەی بۆ کوردستان، ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێت: «هەر لەم هاوینەدا سەردانێکی ئیماراتم کرد و بۆ کۆتاجار دیداری برایانم کرد و ڕێنمایی پێویستم وەرگرت سەبارەت بەگەڕانەوە، کە بەکورتی بریتی بوو لە خۆڕێکخستن و کۆکردنەوەی کار و کاروان لە کوردستانی عێراقدا».

من ئەوە نازانم کە ئایا مامۆستا صەلاح یان ئەو لیژنە و کەسانەی ڕەوانەی لای مامۆستا صدیقیان کردووە لەسەرئەوەی گوایە باسی گەڕانەوەی بۆ کوردستان کردووە، وتوویەتی: ئێمە ئەسڵین و ئێوەش فەرع، هەروەک چۆن ئێوە لە ئێران ئەسڵ بوون و ئێمەش فەرع، ئەو بڕیارەی سەرکردایەتی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقیان پێڕاگەیاندووە،

کە مامۆستا صەلاحیان وەک بەرپرسی کاری ئیخوان لە کوردستاندا دەستنیشانکردووە یان نا؟ چونکە لە حاڵەتی پێڕاگەیاندنی ڕاشکاوانەی دڵنیاکەرەوەدا، ئەگەر مامۆستا صدیق مەبەستیەتی لە چوارچێوەی کۆمەڵەی ئیخواندا کار و چالاکی بکات، ئەوا دەستگرتن بە ڕێکەوتن و دەقەکانییەوە مانایەکی نابێت، چونکە دووبارە خۆی و هێڵەکەی دەکەوێتەوە بەر کێشەی شەرعیەتی ئینتما بۆ ئیخوان، کە سەردەمانێکی زۆر لە مێژووی کاری مامۆستا و ئەم هێڵەیدا هەموومانی پێوەی گیرۆدەبووین.

بەڵام ئەوە دەزانم مامۆستا صدیق ئەم بابەتەی بیستبوو، هەوڵی ڕێ لێگرتن و گۆڕینی بڕیارەکەی لە ڕێگەی دۆزینەوە و دەستگەیاندنە کەسایەتی کاریگەر و خاوەن نفوز لەناو ئیخواندا عێراقی بن یان لەناو مەکتەبی ئیرشادی ئیخواندا دەدا.

نموونەیەک لەو هەوڵانە، ئێوارەیەکی درەنگ وەخت لە کامیارانەوە دەگەڕامەوە بۆ سنە، لە چوارڕیانی سەرەکی شارەکەدا، بە یەکتر گەیشتین، زۆرخوڵکی کردم بمێنمەوە، بەڵام لەبەر تەنیایی ماڵوەمان نەمتوانی، گووتی: بەم نزیکانە خەبەرێکی گرنگ و خۆش دەبیستیت، بەرلەوەی پێم بڵێت خەبەرەکە چیە سوێنیدام کە تاکاتی خۆی لای کەس نەیدرکێنم، منیش حەپەسام، گووتم: مامۆستا بەڵێن بێت کەس لێم نابیستێ، سەیرێکی کردم و گووتی: ئاخر خەبەرەکە زۆرگرنگە، سوێنم بۆ بخۆ، گووتم بەخوای گەورە بەکەسی ناڵێم، دەستیکرد بەگیرفانیدا نووسراوێکی دەرهێنا ئێستە نازانم چی بوو، بەڵام (بسم الله الرحمن الرحیم)ی لەسەر نووسرابوو، پەنجەی خستمە سەر (بسم الله)ییەکە و گووتی: بێژە بەم قورئانە لای کەس قسەناکەم، منیش سوێنەکەم بۆ خوارد، گووتی نوێنەرم ناردووە بۆ لای شەخسیەتێکی ئیخوانی گرنگ بۆ مەسەلەی ئەوەی کە هێڵی ئێمە بەرپرسی شەرعی کاری ئیخوان بێت لە کوردستان؟؟ گووتم: مامۆستا گیان ئەمە خەبەرێکی خۆشە هەرکات ئەمە ڕوویدا ئێمە وەک جاران کە هەمیشە لە خزمەتاندا بووین، هەر لەخزمەتتدا دەبین، بەرەو گەراجی سنە ڕۆیشتم، ئەم سوێندانەی مامۆستا لەسەر پێدانی ئەم هەواڵە لەبەر گلەیی و ڕەخنەکانی من بوو لە کاری هێڵی خۆمان لە ئێران کە پێشتر باسمکردن، ڕەنگە وایزانیبێت ئەگەر سوێنم نەدات، هەر بەیانی زوو قۆڵی لێهەڵدەکەم بەرەو کرماشان تا ئەم خەبەرە بگەیەنمە مامۆستا صەلاح بەحوکمی پەیوەندی تەنزیمی، ئەم ئەگەرە هەڵەیە، چونکە لەگەڵ پابەندبوون بە بڕیاری ڕێکەوتن و پەیوەندی ڕێکخستن، بەڵام لەلایەک ڕێز و پێگەی مامۆستا لەلای من وەک خۆی بوو، لەلایەکی ترەوە لەو هەموو ماوەیەدا هەر لە سەرەتاوە تا ئەوکاتە و دواتریش لە داستانی خەتی یەک و خەتی دوودا و دروستبوونی بزوتنەوەی ڕاپەڕین، کە دنیای تیا ژێراوژوربوو لە غەیبەت و تانە و بوختان و سوکایەتی بەیەکتر کردن تاڕادەی ڕاکە ڕاکی

تێکدانی دەرس و دەوری مزگەوتەکانی، خودا لوتفی لەگەڵ کردبووم ئارەزووی دەمژەندە ئەو بێنە و بەرەی ناوزڕاندن و وتی وتییەم نەبوو.

بەندە و مامۆستا محەمەد ڕەئوف دەنگوباسی ئیمارەتی مامۆستا صەلاح بۆ کاری ئیخوانی کوردستان و هەوڵەکانی مامۆستا صدیق بۆ بەدەستهێنانی ئەو پۆستە یان هەر جۆرە وەڵامێکی نوێمان بیستبوو، بەڵام زۆر دڵنیا نەبووین لە ڕاستی هەواڵەکە، پاشنیوەڕۆیەک کە نزیک بوو لە سەروبەندی گەڕانەوەی مامۆستا صەلاح بۆ کوردستان سەردانی کرماشانمان کرد، دوای عەسر گەیشتین، مامۆستا محەمەد فەرەج و مامۆستا هادی لەوێ بوون، پاش نوێژکردن ئەوان ڕۆیشتن، ئێمەش پاش هەندێ گفتوگۆ بەڕوون و ڕاشکاوی چووینە ناو بابەتی سەردانەکەمان و بە مامۆستامان گووت: ئێمە بۆ مەسەلەیەکی گرنگ هاتووین دەمانەوێت لێی دڵنیابین و لەسەر زەمینەیەکی مەحکەم حەرەکەت بکەین، ئایا جەنابت لەلایەن قیادەی ڕێکخستنی برایانەوە فەرمانت پێکراوە بەرپرسی کاری کوردستان بێت، ئەگەر وایە ئەوە الحمد لله کێشەیەکمان نییە و بەردەوام دەبین، ئەگەر وانییە ئەوا ئێمە بیر لە مانەوە لەگەڵ ئەم جەمعە یان گەڕانەوە بۆ ناو برایان و هاوکارانی پێشووی خۆمان دەکەینەوە، دواتر بڕیار دەدەین، مامۆستا بەدرێژی باسی بڕیاری دەستنیشانکردنی وەک بەرپرسی کاری ئیخوان لە کوردستاندا لەلایەن قیادەی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لە دەرەوە و زەرورەتی ئەو بڕیارە لەم قۆناغە گۆڕاوەدا بۆ کردین، دواتر پێکەوە باسی ئەرک و پێویستییەکانی قۆناغی داهاتوو لەودیو کرا، لەنێو قسەکاندا، بەندە ئاماژەم بە نەبوونی سەرچاوەی ڕۆشنبیری ئیسلامیی لە ئێستای کوردستاندا کرد و پێشنیازی دروستکردنی ناوەندێکی چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و گۆڤارم کرد، مامۆستا گووتی: زۆر ڕاستە دەکرێ کە گەڕاینەوە دەسبتەکار بیت، ئەوەبوو لەگەڵ گەڕانەوەمدا(٥٠٠٠) کتێبی مونتەلەق و عەوائق و ڕەقائقی محەمەد ئەحمەد ڕاشد و (کیف ندعو للاسلام) و (ماذا یعنی انتمائی للاسلام)ی فتحی یکنم لەگەڵماڵەکەمدا هێنایەوە، هاوکات بڕێکی زۆر قایش پانکە و ڕاستەیەکی قوتابخانەم هێنایەوە کە پێیان دەگووت-شاپیلۆن- بەسەرمایە و قازانجی خانوویەکی موناسبم لە گەڕەکی شێخانی سلێمانی پێکڕی، دیارە ئاماژەکردنم بەکتێبخانە و کڕینی ماڵ بێ مەبەست نییە.



# عەبدولڕەحمان سورەییا مەردۆخی
# (1841–1904)

## ژیان و بەرهەمی لە بەڵگەنامەکانی عوسمانیدا



د.هێمن عومەر خۆشناو

لەنێو مێژووی زانست و زانیاریی کوردستاندا بنەماڵەی مەردۆخییەکان پلە و پایەیەکی گرنگی زانستی و کارگێڕییان هەیە، هەر لەوکاتەوەی لە سنەوە بەرەو سلێمانی و پاشان بەرەو بەغدا و لەوێشەوە بەرەو ئەستەنبوڵ دەچن، ڕۆڵ و کاریگەرییان لەنێو مێژووی زانستیی و کارگێڕیی دەوڵەتی عوسمانیدا ڕوون و بەرچاوە. یەکێک لەو زانا و ڕۆژنامەنووس و کەسایەتییانەی ئەو بنەماڵەیە؛ عەبدولڕەحمان سورەییا ئەفەندییە.

عەبدولڕەحمان سورەییا ئەفەندی کوڕی ئەبوحامید محەمەدە و لە بنەماڵەی مەردۆخییەکانە، وەک لە تۆماری عوسمانییەکاندا هاتووە، لە ساڵی ١٢٥٧ی ڕۆمی بەرامبەر ١٨٤١ی میلادی لە بەغدا لەدایکبووە و هەر لەوێش دەستی بە خوێندن کردووە و زمانەکانی عەرەبی، فارسی، تورکی، فەڕەنسی، کوردیی سۆرانی و گۆرانی دەزانێ. لە ٢/ ١١/ ١٨٦٧ لە ڕوشدییەی بەیلەربەیی و لە ٨/ ٥/ ١٨٧٠دا لە مەکتەبی دارولموعەلیمین مامۆستای زمانی فارسی بووە. لە ساڵی ١٨٧٦ لە مەخرەجی ئەقلام دا وەک مامۆستای زمانی عەرەبی و لە ساڵی ١٨٨٤ دا لە مەکتەبی حقوق دا مامۆستای ئەدەبیاتی عوسمانی و تەعلیمی خیتابەت بووە. لە ساڵی ١٨٧٢ لە ڕۆژنامەی (حوادث) و لە ساڵی ١٨٧٦ لە ڕۆژنامەی (حقیقت) سەرۆکی نووسەران (باش موحەریر) بووە. وەک فەرمانبەر لە شارەکانی ئادەنە و قۆنیە کاری کردووە.

عەبدولڕەحمان لە زۆر ڕۆژنامەی ئەوسای عوسمانی و دەرەوەی عوسمانیدا نووسینی هەیە و بەهۆی نووسینەکانییەوە زۆرجار سەردانی کۆڕ و کۆبوونەوە و کۆنفرانسەکانی ئەورووپای کردووە.

لە ٩/ ٨/ ١٨٩٢ لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە هەڵدەبژێردرێت کە بەشداری کۆنگرەی لیزبۆن بکات لە پورتوگال، کۆنگرەکە تایبەت بووە بە ڕوانینی ڕۆژهەڵاتناسەکان سەبارەت بە زمان و ئەدەبیاتی ڕۆژهەڵات. پێش چوونیان داوا لە مۆزەخانەی دەوڵەتی عوسمانی دەکەن، کە وێنەی کۆنی پەیوەست بە ئاشوورییەکانی میسر و فەلەستین و پێرستی کتێبەکانی کتێبخانەی عوسمانییان بدرێتێ بۆئەوەی پێشکەشی کۆنگرەکەی بکەن(١). مۆزەخانەش ١٣٢ وێنە و ١٠ دانە پێرستی کتێبە تورکی، فارسی و عەرەبییەکانی کتێبخانەی عوسمانییان دەداتێ. دوای گەڕانەوەی، ڕاپۆرتێکی دوازدە لاپەڕەیی بۆ سوڵتانی عوسمانی نووسیوە و تێیدا زۆر بەوردیی هەموو چالاکی و سەردانەکانی باس کردووە، تەنانەت باسی نەخۆشی کۆلێرا دەکات کە وایکردبوو کۆنگرەکە بەڕێوە نەچێ و بۆ ساڵی داهاتوو دوابخرێ(٢). لە ڕێگەدا دەچێتە مەدریدی ئیسپانیا و سەردانی مۆزەخانەی شارەکە

دەكات. هەروەها لەو ناوچەیە سەردانی كتێبخانە، ئەكادیمیای سەربازی، دورگەی كاستل، شوێنەوارەكانی فەتحی ئەندەلوس، بازاڕە دێرینەكان و ئەو كڵێسایانە دەكات كە سەردەمانێك مزگەوت بوون. دیارە ئەو گەشتەش هاوڕێ لەگەڵ كەمال بەگی كاتبی هومایۆن بووە(٣).

ناوبراو لە وەزیفەی دەوڵەت بەردەوام بووە و لە ١٠/٢٦/ ١٩٠٢ دا خانەنشین بووە(٤). فەرمانبەری دەوڵەت، ڕۆژنامەنووس، مامۆستا، وەرگێڕ و نووسەر بووە و لە ئەستەنبوڵ كۆچی دوایی كردووە و مەزارەكەی لە نزیک مزگەوتی سوڵتان ئەیووبە(٥). لە دوای مردنی فاتیمەزەهراخانمی خێزانی مووچەی خانەنشینییەكەی وەرگرتووە. كە لەو بەڵگەنامەیەدا ئاماژە بەوە دەدا ناوبراو لە ١٧ی تەمموزی ساڵی ١٣٢٠ی ڕۆمی وەفاتی كردووە، كە دەكاتە ١٩٠٤/٧/٣٠ی زایینی(٦). وادیارە بەر لە مردنی هەر مژوولی دەرسگوتنەوە بووە. ئەوەتا لە بەڵگەنامەیەكدا هاتووە كە ناوبراو هەفتانە دوو سەعات دەرسی ئەدەبیاتی عەرەبی و دوو سەعات ئەدەبیاتی فارسی لە مەكتەبی مولكییەی دارولفنوونی شاهانە دەڵێتەوە، بەڵام تووشی نەخۆشی بووە و ئیتر نەیتوانیوە دەرسەكان بڵێتەوە. ئەم بەڵگەنامەیە مێژووی ١٣٢١/١١/٢٩ ی لەسەر نووسراوە(٧) ، كە دەكاتە ١٩٠٤/٢/١٦، واتە چەند مانگێک پێش كۆچی دوایی هەر خەریكی دەرسگوتنەوە بووە.

### خێزان و منداڵەكانی:

لە بەڵگەنامەكانی عوسمانیدا زانیاریی ئەوتۆ لەبارەی خێزانەكەی پەیدا نەبوو، ئەوەندە هەیە لە بەڵگەنامەیەكدا كە مێژووی ١٨/ ٤/ ١٣٢٤ی كۆچی بەرامبەر ١١/ ٦/ ١٩٠٦ی میلادی لەسەرە، تێیدا باس لە بەشكردنی مووچەكەی دەكات دوای وەفاتكردنی، بۆ كچەكەی و كوڕەكەی و هاوسەرەكەی. بێ ئەوەی هیچ زانیارییەک لەبارەی كچەكەی و هاوسەرەكەی هەبێ(٨)، بەڵام لە تۆماری عوسمانییەكاندا كورتە ژیانی كوڕەكەی هاتووە، كە ناوی حامید بووە و ساڵی ١٨٦٩ لە ئەستەنبوڵ لەدایكبووە و قوتابخانەی سەرەتایی و سەرەتاكانی زانستە ئایینییەكان و مەكتەبی شاهانە و ئامادەیی هەر لەوێ خوێندووە. زمانەكانی توركی، فەرەنسی بە نووسین و خوێندنەوە زانیوە، هەروەها شارەزایی لە زمانی ڕۆم و ئەرمەنییانیش هەبووە. لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا لە بەشی نووسینی بیانی وەزارەتی پۆستە و تەلەگراف دادەمەزرێ(٩). هیچ لەبارەی ساڵی مردن و كۆتاییەكانی ژیانی نەزانراوە.

**بەرهەمەکانی:**

**١-ترجمة مقدمة أقوم المسالك، مطبعة الجوائب، اسطنبول، ١٢٩٦/ ١٨٧٩.**

ئەم کتێبە لە بنچینەدا بە عەرەبییە بە ناوی (أقوم المسالك في معرفة أحوال الممالك) کە نووسەرەکەی (خير الدين التونسي)یە و بە عەرەبی لە ساڵی ١٢٨٤ لە تونس بڵاوبۆتەوە و عەبدولڕەحمان سورەییا لە عەرەبییەوە وەریگێڕاوەتە سەر تورکی و سەرەتا لە ڕۆژنامەکانی عەسکەرییە و حەقیقەت بەش بەشی لێ بڵاوکردۆتەوە. کتێبەکە باسی شەرعیبوونی سیاسەت و حیکمەتی حکومەت دەکات.

**٢-اخوت عسكرية**

پێشتر بابەتەکانی نێو ئەم کتێبە لە ڕۆژنامەی عەسکەرییە بڵاوکراونەتەوە. ناوەڕۆکەکەی باس لە پێویستی و گرنگی خزمەتی سەربازی دەکات و ڕێنماییەکانی لەبارەی بەیەکەوە ژیانی سەربازەکان تێدایە و لەوبارەوە پشتی بە چەند سەرچاوەیەکی فەرەنسی بەستووە. کتێبەکە ٨٠ لاپەڕەیە و ساڵی ١٨٨١ لە ئەستەنبوڵ لە چاپخانەی جریدەی عسکریە چاپکراوە.

**٣-تعليقات بلاغت عثمانية:**

ئەم کتێبە ڕەخنەیەکە لەسەر کتێبی (بلاغت عثمانيە)ی ئەحمەد جەودەت پاشا، ئەم وەڵامدانەوە و گەنگەشەیە لە ڕۆژنامەکانی حوادث، وقت و ترجمان حقيقت بڵاوکرایەوە کە تێیدا چەند کەسی تریش بەشداری ئەو وەڵام و وەڵامکارییە بوون، وەک بابەتی: رد تحليل ى محمود اسعد افندى، تميز تعليقات ى حاجى ابراهيم افندى، نزيره تعليقات، حل تعليقات....هتد. کتێبەکە زۆر بەوردیی لەبارەی بەلاغەتی هەندێ ڕستە و دەربڕینی زمانی عوسمانی ڕادەوەستێ و شییان دەکاتەوە. کتێبەکە ٥٩ لاپەڕەیە و ساڵی ١٨٨٢ چاپکراوە.

**٤-تحليل حال**

ئەم کتێبەش هەر بەشێکە لە ڕەخنەی ئەو گفتوگۆ و گەنگەشەیەی کە لە ڕۆژنامەکان دروست بوو. بەتایبەتی لە بواری زمانناسی، بابەتەکانی زمانی تورکی و ڕەوانبێژی و لۆجیک و عەقیدە بەشی هەرە زۆری کتێبەکە پێکدێنن. گەنگەشەکەش زیاتر لە شێوەی پرسیار و وەڵامە. لەسەر بەرگەکەش نووسراوە دانراوی نووسەری ڕۆژنامەی (جريدەی عسكری) عەبدولڕەحمان سورەییا ئەفەندی یە، ئەم بەرهەمە ٨٥ لاپەڕەیە و ساڵی ١٨٨٢ لە چاپخانەی مهران لە ئەستەنبوڵ چاپکراوە.

**٥-ميزان البلاغة**

ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بریتییە لەو دەرسانەی کە لە مەکتەبی حقوق دا بە قوتابییەکانی دابوو، لەبارەی ئەدەبیاتی کلاسیک و بەلاغەتی عەرەبییە کە هەر لە سەرەتاوە بە زانستی واتاناسیی (معانی) دەستیپێکردووە. لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانی کە مێژووی

١٣٠٣/٤/٢٩ی کۆچی بەرامبەر ٤/ ٢/ ١٨٨٦ی میلادی لەسەر نووسراوە، داواکراوە کە مامۆستای بەلاغەتی مەکتەبی حقوق کە عەبدولڕەحمان سورەییایە و لەبەرئەوەی کتێبی (میزان البلاغة)ی نووسیوە و کتێبەکەی گرنگە، بۆیە شایەنی ئەوەیە کە لە سەدارەتەوە لوتفی بەرانبەر بنوێنرێ(١٠).

کتێبەکە ٤٠٥ لاپەڕەیە و سالّی ١٨٨٥ی میلادی چاپکراوە.

**٦-سفینەء بلاغت:**

ئەم کتێبە زیادکراوی چەند بابەتێکی دیکەی کتێبی (میزان البلاغە)یە، وەک ئەوەی ڕوونکردنەوە و خستنەڕووی چەند بابەتێک بێ بە زیادەوە. لە کتێبەکەدا دیباجەیەک هەیە و دواتر ڕاستەوخۆ دێتە سەر باسەکە و ئەو تایبەتمەندییانەی کە بۆ زمانی تورکی پێویستن لەبارەی بەلاغەوە ڕوونیان دەکاتەوە. هەروەها چەند پرسێکی هونەری لە چوارچێوەی ریسالەیەکی ئەدەبیدا و شێوازی نووسینەکە لە شێوەی لەتیفەی زمانیی و وێناکردن دەخاتەڕوو. لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕوانگەی دەستوورێکی ئەدەبیی بەلاغییەوە بۆچوونەکان دەخاتەڕووو و پاشان دەربڕینی ڕاست و هەڵەش بە تابلۆیەک نیشان دەدات. مژارەکانی باسی نەسەبی پێغەمبەر، چەند بابەتێکی مەنتیق، کەلام، ڕەوانبێژی و فەلسەفەی باس کردووە و دواتر بۆ هەریەکێک لەوانە نمونەی هێناوەتەوە. کتێبەکە ٢٠٠ لاپەڕەیە و سالّی ١٨٨٧ی میلادی چاپکراوە.

**٧-راحة الارواح:**

کتێبێکە لەبارەی ئەدەبیاتی ئێرانییە و ٧٩ لاپەڕەیە و سالّی ١٨٧٩/ ١٢٦٩ چاپکراوە.









## سەرچاوە و پەراوێزەکان


1 İ..HUS. 1 - 73

2 Y..EE.. 8 - 2

3 İ..HUS. 1 - 73

4 ŞD. 645 - 50

٥ لەبارەی کورتە ژیان و بەرهەمەکانی، وێڕای بەڵگەنامەکانی ئەرشیڤخانەی عوسمانی، سوودیش لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:
ŞAHİN BARANOĞLU, Abdurrahman Süreyya Mizanü›l-Belaga (2 cilt), Doktora tezi, Ege Üniversitesi / Sosyal Bilimler Enstitüsü, 1999.

6 ŞD. 647 - 46

7 MF.MKT. 763 - 67

8 MF.MKT. 934 - 59

9 DH.SAİDd... 65 - 315

10 MF.MKT. 89 - 99



د. کامەران محەمەد

# بەڵاکانی پەیڤین

## لە دەقە پیرۆزەکاندا (قورئان وەک نموونە)

زانین و بەئاگابوون لەو بەڵایانەی کە تووشی پەیڤین دەبن و هەوڵدان بۆ بنبڕکردنی ڤایرۆسەکانی، نهێنییەکی بنەڕەتیی سەرکەوتنی هەموو پەیڤینێکە. بەبێ ئەوەش هەموو ئەو هەوڵانەی لە پەیڤیندا دەدرێت بۆ گەیشتنە ئاکامێکی باڵا خامۆش دەبن. بۆیە ئایینی ئیسلام گرنگییەکی تەواوی بە دەستنیشانکردنی ئەو بەڵایانە داوە و ئەنجامە خراپەکانی خستووەتەڕوو.

لە قورئانی پیرۆزدا لە هەر شوێنێکیدا باسی پەیڤین کرابێت و نەگەیشتبێتە ئەنجام و کۆتاییە دروست و چاوەڕوانکراوەکان، ئەوا ڕاستەوخۆ و ڕاشکاوانە خودا باسی لە هۆکار و بەڵاکانی ئەو ئەنجامە ترسناکە کردووە کە پەیڤینەکە تووشی هاتووە. واتە بۆئەوەی مرۆڤەکان لە ئەنجامی پەیڤینێکی سروشتیی و تەندروستەوە بتوانن بە هزر و بۆچوون و پڕۆژە جیاوازەکانیان لە خزمەت شارستانێتی مرۆڤایەتیدا بن، ئەوا دەبێت زۆر بەوردی و هۆشیارانە لەو هۆکارانە ڕابمێنن، کە دەبنە بەڵایەک و لە واقیعیشدا بەڵایەکی گەورە تووشی پەیڤینەکە دەکەن و مرۆڤایەتیی ڕووبەڕووی زیانێکی گەورە دەکەنەوە. قورئانی پیرۆز بە دەستەواژەیەکی کورت گرنگترین ئەو بەڵایانەی خستووەتەڕوو کە ئەویش: (إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنْفُسُ﴾ النجم: ٢٣﴾ واتە: (ئەوانە تەنها شوێنی گومان و ئەوانەی کە دەروونیان ئارەزووی دەکات، دەکەون، بەواتایەکی تر، لە تێڕوانینی قورئاندا دوو خاڵ هەن، مرۆڤ لە بیروباوەڕ و بۆچوونەکانیاندا تووشی هەڵە دەکەن، ئەوانیش:

یەکەم: شوێنکەوتنی گومان

دووەم: شوێنکەوتەی ئارەزووی دەروون.

**یەکەم شوێنکەوتنی گومان:**

لە ئیسلامدا مەبەست لە شوێنکەوتنی گومان بریتییە لە باوەڕهێنان یاخود پەرستنی خوداوەندێک، کە لەسەر بنەڕەتێکی زانستیی و سەلماندن دانەمەزرابێت، بەڵکو لەسەر بنەمای (حدس)و (تخمین) دروستبووبێت. بۆیە وشەی گومان (الظن) لە ئیسلامدا کە بەرامبەری زانست دەبێتەوە، (وَمَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا (النجم:٢٨) واتە: (ئەوانە لەوبارەیەوە هیچ جۆرە زانست و زانیارییەکیان نییە، بەڵکو هەر شوێنی گومانی بێسەر و بن دەکەون، لەکاتێکدا گومان بە هیچ شێوەک شوێنی حەق و ڕاستیی ناگرێتەوە).

بۆئەوەیە سەرتاپای هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە زانستی نین و ناتوانرێت لە بیروباوەڕ و کاردا پشتی پێبەسترێت، چونکە ڕاستییەک ئاشکرا ناکات لە ڕاستییەکانی سروشت (فطرة)و ویژدان، یاخود ڕاستیی ئەو بەڵگانەی کە بەرەو ویژدان کۆتاییان دێت. ئەوە ئەو هێڵەیە، ئیسلام پێش هەزار و چوارسەد و ئەوەندە ساڵ کێشاویەتی، تا مرۆڤەکان بۆ بەدەستهێنانی قایلبوون (قناعة) یان بەدیهێنانی پەیوەندارێتی (إنتماء) لەسەری بڕۆن. بۆیە نەشیاوە پشت بەوە ببەسترێت، کە ناتوانرێت پشتی پێببەسترێت، بەوەی کە جەخت لەسەر بەڵگە و سەلماندن ناکات و لەسەر بنکەیەکی یەقینەوە دەرناچێت، بەڵکو دەبێت ئەو ئایدیۆلۆجیایەی مرۆڤ ڕووبەڕوی دەبێتەوە، وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بداتەوە، کە ڕووبەڕووی دەکرێتەوە، بەوشێوەیەی کە دڵ و ژیریی قایل بکات و دەروون ئارام و جێگیر بکات.

بەڵام ئەگەر ئەوەی بەدەست نەهێنا و شیمانە دژەکان بە کراوەیی لای مانەوە، ئەوا هەڵوێستی سروشتی ئەو ئەوەیە کە بە ئاگا بێت، بۆئەوەی بەدوای هەموو ئاسۆ جۆراوجۆرەکاندا بگەڕێت تا ئەوەی لە هێڵی یەقیندا سەقامگیر دەبێت، بەدەستی بهێنێت. لەم سەربەنەوە تێدەگەین ئیسلام چەند سورە لەسەر ئەوەی مرۆڤـ ڕێزی (ڕاستیی) لە ژیاندا بگرێت، ئەویش بە ڕێزگرتنی بەرپرسیارێتی هزر لای و جەختکردنەوە لەسەر ئامراز و شێوازەکانی گەیشتن بە ئەنجامە پۆزەتیڤەکان لە بیروباوەڕدا. هەروەها خودا لە زۆر شوێندا هانی پەیامبەر (د.خ)و مسوڵمانان دەدات، کە لەسەر بنەڕەتێکی زانستیی و بەڵگەهێنانەوە و سەلماندن لەگەڵ مرۆڤەکانی دەوروبەریاندا بکەونە پەیڤینەوە. بۆیە پاش ئەوەی پەیامبەر بەڵگەی زیندووی زۆریان بۆ دێنێتەوە لەسەر بوون و سیفاتی خوا، دوارۆژ، پەیامبەران، قورئان، فریشتەکان و...تاد، ئەوان گومانیان وایە خودا هاوەڵی هەیە! بەڵام ناگەڕێن بە دوای سەلماندنی ئەو وەڵامەدا یاخود لەسەر بنەڕەتێکی ژیریی و بەشێوەیەکی کرداریی تاقی ناکەنەوە، هەروەها گومانیان وابوو کە باب و باپیرانیان ئەو بتانەیان نەپەرستووە ئەگەر شایستەی پەرستش نەبووبێتن!

هەروەها ئەوان باوەڕیان وابوو، خودا نیگا نانێرێت بۆ مرۆڤێک لە خۆیان، بەڵام ئامادەنەبوون لەوە بکۆڵنەوە کە خودا بۆچی کاری واناکات، بە هەمان شێوەش گومانیان وابوو کە قورئان دانراوی محەمەدە، بەڵام نەیاندەکۆڵییەوە لەوەی کە محەمەد مرۆڤێکە وەک ئەوان، بەڵام ئەوان دەستەوەستانن لەو کارەدا لەکاتێکدا ئەوانیش مرۆڤن و بەوشێوەیە لە ئۆقیانووسی گوماندا ڕۆچوبوون. هەربۆیە خودای گەورە لە زۆر شوێنی قورئاندا باسی ئەو ڕاستییە دەکات و دەفەرموێت: (وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنّاً إِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئاً إِنَّ اللَّهَ عَلِيمُ بِمَا يَفْعَلُونَ) (یونس: ٣٦) واتە: (زۆربەیان شوێنی هیچ شتێک ناکەون، تەنها گومان نەبێت، بەڕاستی گومانیش هیچ سودێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت، لەبارەی حەق و ڕاستییەوە، بەدڵنیاییەوە خوا زانایە بە هەموو ئەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن).

وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُمْ بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿الجاثية: ٢٤﴾ واتە: (خوانەناسان دەیانگوت ژیان تەنها ئەم ژیانی دونیاییەیە و دەمرین و دەژین بە نۆرە، هەر ڕۆژگار و زەمانە کاریگەرن تیاماندا و دەمانمرێنن و هیچی تر. جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانست و زانیارییەک ئەوە بڵێن، بەڵکو تەنها پشت بە گومان و دوودڵی دەبەستن).

(وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِۚ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿الانعام:١١٦﴾واتە: (خۆ ئەگەر فەرمانبەردار و ملکەچی زۆربەی خەڵکیی سەر زەوی بیت، ئەوا لە ڕێبازی خوا وێڵت دەکەن، چونکە شوێنی هیچ شتێک ناکەون جگە لە گومان

نەبێت و تەنها گۆترەکاری دەکەن).

بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ۖ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ ﴿ یونس: ٣٩﴾ واتە: (بەڵکو سەرەڕای ئەو هەموو بەڵگانە، ئەوان بڕوایان بە قورئان نەکردووە کە هیچ شتێکیان دەربارەی نەزانیوە، هێشتا سەرئەنجامی ئەو بەڵێنانەی کە بەڵێنی پێداون بۆیان نەهاتووە. هەر بەوشێوەیە ئەوانەی پێش ئەمان بەرنامەی خۆیان بە درۆ زانی و بڕوایان پێی نەبوو دەتەماشا بکە و سەرنج بدە سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بووە).

(إِذْ تَلَقَّوْنَهُ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُمْ مَا لَيْسَ لَكُمْ بِهِ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُ هَيِّنًا وَهُوَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ ﴿ النور: ١٥﴾ واتە: (ئەوە بۆ دەماودەم قسە لە زمانی یەکتر وەردەگرن (بێ لێکدانەوە)، کاتێک بە زارتان شتێک دەڵێن کە هیچ ئاگاییتان لێی نییە، ئێوە وادەزانن ئەوە شتێکی سادە و ئاسانە؟ لەکاتێکدا ئەوە لای خودا زۆر گەورە و ناقوڵایە).

وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ۚ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَٰئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْئُولًا ﴿الاسراء: ٣٦﴾واتە: (ئەی مرۆڤ لە شتێک مەدوێ و شوێنی شتێک مەکەوە کە زانست و زانیاریتان دەربارەی نییە، چونکە بەڕاستی دەزگاکانی بینین و بیستن و تێگەیشتن هەمووی بەرپرسیارە لە بەرامبەرییەوە). بەوشێوەیە خولانەوە لە بازنەی تەسکی گوماندا و ڕۆنەچوون لە توێژینەوەدا بۆ دەستنیشانکردن و گەیشتن بە کرۆک و حەقیقەتی دۆز و بابەتەکانی پەیقین، ڤایرۆسێکی کوشندەی پەیڤینە و پەیڤین ئیفلیج دەکات.

هەر هەمان سیفەتە (شوێنکەوتنی گومان) کە ژیان لە دۆخێکی وەستاودا دەهێڵێتەوە و گیانی ئافراندن لە ناخی تاک و هەناوی کۆمەڵگەکاندا دەکوژێت. هەر ئەوەش نهێنی ئەو بوژانەوە مەزنە بوو، کە شارستانێتی ئیسلام لە سەرەتادا بەخۆیەوە بینی، هەروەک کەسانێکی وەک گۆستاڤــ لۆبۆن، جەیمس وستفال تۆسۆن و فرانکلین چارڵس بام و ڤان تۆستراد و...تاد ئاماژەی پێدەکەن و پێیانوایە کە شارستانیەتی ئیسلامی پشکی بەرچاوی هەبوو لە ئاڕاستەکردنی ئەبستمۆلۆجیا و زانستدا. بەپێی گوزارشتی (سان سیمۆن)یش بەرەو ئاڕاستەی (ڕوناکی) نوێ. چونکە تا ئەو کاتە زانست لە میتافیزیکدا نغرۆ ببوو، بەڵام بەهۆی سەرچاوە ئیسلامییەکانەوە کە جەختیان لەسەر تێبینیکردن (ملاحظة)و دامەزراندن و هۆڵی توێژینەوەی مێژووی سروشتیی دەکرد و زیاتر واقیعیبوون و ئازادبوونی زانستی دەخستەڕوو، نەک تەنها لە ڕۆچوونی تاک ڕەهەندی میتافیزیکدا. بێگومان ئەو دیمەنە و چەندەها دیمەنی تری لەم شێوەیە لە مێژووی شارستانی ئیسلامیدا بەرجەستەبوونی سروشتی ئەو دەقانە بوو لە تێگەیشتنی مرۆڤەکان و جێبەجێکردنی لە واقیعی ژیاندا. واتە بە ئەندازەی دوورکەوتنەوەی مرۆڤـ لە گومان.

**دووەم: شوێنکەوتنی ئارەزوو:**

ڕاغیبی ئەسفەهانی لەسەر چەمکی ئارەزوو (الهوى) لە قورئاندا دەڵێت:" ئارەزوو و مەیلی دەروونە بۆ شەهوەت، لەبەر ئەوەش ناونراوە بە (الهوى)، چونکە مرۆڤـ لە دنیادا بەرەو هەموو کارەساتێک دەبات و لە دوارۆژیشدا بەرەو ئاگر بەڕێی دەکات و دەڵێت: ئارەزوو کەوتنەخوارەوەیە لە بەرزاییەوە بۆ نزمایی. هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە هەموو مرۆڤێک ئارەزووی جیا لە مرۆڤێکی تری هەیە و ئارەزووی هەریەکەشیان بێکۆتایە. دەتوانین پێناسەی ئارەزوو بکەین بەوەی لە کۆمەڵە غەریزە و شەهوەتێک پێکهاتووە لە دەروونی مرۆڤدا و زۆر بە توندی داوا و هەڵپەی تێرکردنی دەکات و لەکاتی تێرکردنیشدا مرۆڤ چێژی لێوەردەگرێت. لێرەدا ئەو پرسیارە دروست دەبێت، کە ئایا ئارەزوو چ پەیوەندییەکی بەسەر سڕکردنی پەیڤینەوە هەیە؟

> **خولانەوە لە بازنەی تەسکی گوماندا و ڕۆنەچوون لە توێژینەوەدا بۆ دەستنیشانکردن و گەیشتن بە کرۆك و حەقیقەتی دۆز و بابەتەکانی پەیڤین، ڤایرۆسێکی کوشندەی پەیڤینە و پەیڤین ئیفلیج دەکات.**

وەک پێشتر پێناسەمان کرد، ئارەزوو لە کۆمەڵە غەریزەیەک پێکهاتووە، ئەو غەریزانەش بەشێکی گەورە و فراوان لە کەسێتی مرۆڤـ پێکدەهێنن و هۆکارێکی بنەڕەتین لە بزواندنی مرۆڤ و ویستەکانیدا، هەروەها کلیلێکە لە گرنگترین کلیلەکانی بزووتنەوە کرداریی و هەڵچوونییەکانی مرۆڤـ. لەبەرئەوە لە دەقە ئیسلامییەکاندا گرنگییەکی گەورە بە چەمک و تایبەتمەندیی و ڕۆڵی ئارەزوو لە ژیانی مرۆڤدا دراوە.

فراوانخوازیی و تێرنەبوون و ڕانەوەستان لە سنورێکی دیاریکراودا، یەکێکە لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی مرۆڤ لە ژیاندا، وەک پەیامبەر (د.خ) دەفەرموێت: (ئەگەر ئادەمیزاد دۆڵێک سامانی هەبێت، ئەوا دەیەوێت بیکات بە دوو، ئەگەر دوو دۆڵیشی هەبێت دەیەوێت بیکات بە سیان، بۆیە هیچ شتێک سکی ئادەمیزاد پڕناکات تەنها خۆڵ نەبێت).

مەبەست لەو دۆخە ڕەهایانەی لە فەرمودەکەدا هاتووە، بێگومان ڕەهاییەکی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو مەبەست تێگەیشتنی زیاد ویستیی مرۆڤە کە سنورێکی شیاو و دیاریکراوی نییە. هەروەها ئارەزوو بە یەکێک لە بەهێزترین پاڵنەر و بزوێنەری مرۆڤە لە ژیاندا

دادەنریت. وەک لە خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالب دەپرسن: ئایا چ دەسەڵاتێک بەهێزتر و زاڵترە؟ لە وەڵامدا دەڵێت: ئارەزوو. هاوکات تایبەتمەندییەکی دیکەی ئارەزوو بریتییە لە داواکردنی زیاتر و چاوچنۆکی لە کاتی بەدەمەوەچوونیدا. واتە بەپێچەوانەی غەریزەکانی دیکەوە، کە کاتێک تێر دەکرێن، ئیدی هێور دەبنەوە و خامۆش دەبن، بەڵام ئارەزوو هەرکات مرۆڤ زیاتر بە دەمیەوە بچێت ئەوا ئەویش چاوچنۆکتر دەبێت و داوای زیاتر دەکات و دەسەڵاتی مرۆڤ کەمتر دەکاتەوە.

بەڵام ئایا ئارەزوو چ پەیوەندییەکی بە پەیڤینەوە هەیە؟ بە واتایەکی دیکە ئارەزوو چ کاریگەرییەک لەسەر سڕکردن و ئیفلیجکردنی پەیڤین جێدەهێڵێت؟ بۆئەوەی بتوانین بە ڕوونی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، ئەوا پێویستە لە ڕۆڵە تێکدەر و نێگەتیڤەکانی مرۆڤ تێبگەین و بەوردی لە ژیانی مرۆڤ ڕابمێنین.

> **ئارەزووش یەکێکە لەو سەرچاوانەی ئەگەر یاخی بوو، ئەوا تێکڕای چاوگەکانی تری دەروونی مرۆڤ پەك دەخات، جا ڕۆڵی ژیریی، دڵ، ویژدان، سروشت (فطرة)و ویست ڕەتدەکاتەوە و لە ناوەڕۆکەکانیان بەتاڵیان دەکاتەوە.**

بێگومان ئەو هێزە ڕەهایە کە خاوەن خواستێکی ڕەهایە و دارای توانایەکی فراوانی تێکدان و خراپەکارییە لە ناوەوەی دەرووندا، هەرگیز هیچ هێزێک ناتوانێت شان لە شانی بدات، تەنانەت شەیتان و یاخیبووەکانیش. ترسناکترین شتیش ئەوەیە کە ئەو هێزە تواناداری خراپەکارییە لەناو دەرونی مرۆڤ خۆیدایە، واتە هێزێکی دەرەکیی نییە، کە بەرامبەر مرۆڤ ڕابوەستێت، بەڵکو هێزێکە مرۆڤ دەبزوێنێت و لە هەموو چرکەساتەکانی ژیانی مرۆڤدا ئامادەیی بەردەوامی هەیە، هەربۆیە پەیامبەری خودا محەمەد (د.خ) ئارەزووی بە یەکێک لە ترسناکترین ئەو شتانە داناوە لەسەر نەتەوەکەی کە لێی دەترسێت. وەک دەفەرموێت: (بەڕاستی ترسناکترین شتێک کە لێی دەترسم لە نەتەوەکەم ئەوا ئارەزوو و هیوا درێژییە، جا ئارەزوو لە ڕاستیی لایاندەدات و هیوادرێژیش دواڕۆژیان لە یاد دەباتەوە). هاوکات لە دەروونی مرۆڤدا کۆمەڵێک چاوگ هەن کە مرۆڤ بە هۆشیاریی و بزووتنەوە بارگاوی دەکەن، ئەو چاوگانەشن کە ژیانی مادیی و مەعنەویی مرۆڤ داگیر دەکەن و بەهەمان شێوەش لایەنی باڵا و ئاژەڵیی و غەریزەیی لە ژیانی مرۆڤ ڕاگیر دەکەن.

ئارەزووش یەکێکە لەو سەرچاوانەی ئەگەر یاخیبوو، ئەوا تێکرای چاوگەکانی تری دەروونی مرۆڤ پەک دەخات، جا ڕۆڵی ژیریی، دڵ، ویژدان، سروشت (فطرة)و ویست ڕەتدەکاتەوە و لە ناوەڕۆکەکانیان بەتاڵیان دەکاتەوە، ئەو تێکدانەش کە ئەو سەرچاوانە دەگریتەوە، تێکدانێکی گشتگیرە لای کەسێتی مرۆڤ و لە پاش ئەو پرۆسەی تێکدانە فراوانە بەسەر ئەو سەرچاوانەدا لە دەروونداجگە لە ئارەزوو ئەوا چاوگێکی تر نامێنێتەوە و ئەوەش لە کەسێتی مرۆڤدا بە لایەنی ئاژەڵی دادەنرێت. بەوشێوەیە ئارەزوو بە هۆکارێکی تێکدان و خراپەکاریی و بەهەدەرچوون دادەنرێت. خودا دەفەرموێت: وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ﴿ الكهف: ٢٨﴾ واتە: (بەگوێی ئەو جۆرە کەسە مەکە کە دڵیمان غافڵ کردووە لە یادی خۆمان (بەهۆی دنیاپەرستییەوە) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوتووە و هەرچی کاروباری هەیە بێ سەروبنە و لە دەستوور دەرچووە).

وشەی (الفرط) لە پەڕگیرییەوە هاتووە و بە واتای هەدەردان و خراپەکارییە. کاتێک کە دەقە ئیسلامییەکان دەخوێنینەوە، دەبینین ڕۆڵی تێکدەری ئارەزوو بە دوو قۆناغدا تێدەپەڕێت:

قۆناغی یەکەم: ئارەزوو لەم قۆناغەدا وەک ئاماژەمان پێکرد، بە کارێکی فراوان هەڵدەستێت لە خراپکردن و لەکارخستنی وزە و توانا و لێهاتووییەکان و ئەو سەرچاوانەی کە خوا لە دەروونی مرۆڤدا بەدیهێناوە لە هۆشیاری (وعی)و بزووتنەوە لەکاری دەخات.

وەک پەروەردگار دەفەرموێت: (فَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَـٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَنْ يَهْدِيهِ مِنْ بَعْدِ اللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿الجاثية:٢٣﴾ واتە: (هەواڵم بدەرێ ئایا ئەو کەسەی کە ویست و ئارەزووی خۆی کردووەتە خوای خۆی؟! بەهۆی ئەوەوە خوداش گومڕای کردووە کە زانیویەتی شایەنی ئەوەیە لە ئەنجامی بەدهەڵوێستی خۆیدا و مۆری ناوە بە دەزگای بیستن و دڵ و دەروونیدا و پەردەشی هێناوە بەسەر دەزگای چاو و بینینیدا، جا ئیتر کێ هەیە جگە لە خودا کە هیدایەت و ڕێنمونی بکات، ئایا بیر ناکەنەوە و ئامۆژگاری وەرناگرن). واتە ڕۆچوون لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا، لە چێژ و شەهوەتە هەستییەکاندا بەبێ ملکەچکردن بۆ دیسپلینە ڕاستییەکان کە ڕۆچوویی بەرچەوەندی مرۆڤایەتی و نیگای پەیامەکان دیاری دەکات.

بەوشێوەیە بەو چرکەساتەوە کە مرۆڤ شوێنی ئارەزووی دەکەوێت و تێیدا ڕۆدەچێت، دڵ بە تەواوی دادەخرێت و هەموو ئەو دەروازانەی کە گزنگی ڕاستیی لێ دێنەدەرەوە و لە خۆی دادەخات و گوێیەکانی دەئاخنرێت و چاوەکانی دادەخرێت. پێشەوا عەلی دەڵێت: (ئەوەی شوێنی ئارەزوو بکەوێت، کەڕ و کوێر و سەرشۆڕی دەکات).

کارێکی تێکدەری دیکەی ئارەزوو بریتییە لە سڕکردنی ژیریی و لەکارخستنی، ئەگەر مرۆڤەکە وەڵامدانەوەیەکی تەواوی بۆ ئارەزووەکانی هەبوو، بەوشێوەیەش دەتوانین

بڵێن ئارەزوو هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی پڕۆسەی بە نەزانکردن و نەفامکردنی مرۆڤ، واتە مرۆڤ لە ئۆقیانوسی نەزانی و سەرکەشی و بێئاگاییدا دەخنکێت، هەروەک پێشەوا عەلی دەفەرموێت: (دەردە ژێریی ئارەزووە).

ئیدی لێرەوە ئەو مەرگەساتە تێدەگەین کە زمانی لەیەک تێگەیشتنی نێوان مرۆڤەکان لە بندا دەبڕدرێت. بۆیە مەرگ باڵ بەسەر ژیانی مرۆڤایەتیدا دەکێشێت.

قۆناغی دووەم: لە قۆناغی یەکەمدا ئارەزوو، ویست، ژیریی، ویژدان، دڵ و سروشتی مرۆڤ تێکدەشکێنێت. کە قورئانی پیرۆز بە بێئاگایی دڵ (اغفال القلب) گوزارشتی لێکردووە.

لە قۆناغی دووەمدا، پاش ئەوەی کە ئارەزوو مەڵبەندە بنەڕەتییەکانی کەسێتی مرۆڤ خاپور دەکات و دەسەڵاتی زاڵی خۆی بە تەواویی و گشتگیر دەسەپێنێت و باڵ بەسەر مرۆڤدا دەکێشێت و ئەو کاتە مرۆڤ دەبێتە شوێنکەوتەی ئارەزووەکانی، قورئانی پیرۆزیش ئەو قۆناغە تێکدەرەی ئارەزووی بە شوێنکەوتنی ئارەزوو (اتباع الهوى) ناوبردووە. ئەم ئایەتە پیرۆزەش ئاماژە بەو دوو قۆناغە دەکات: وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا ﴿الكهف: ٢٨﴾

بێگومان دەسەڵاتی ئارەزوو بەسەر مرۆڤدا زۆر بەهێزترە لە دەسەڵاتی ئەو سوپایەی کە کۆمەڵە دیلێکی گرتووە، چونکە دەسەڵاتی لایەنی سەرکەوتوو بەسەر دیلەکاندا دەسەڵاتێکی سنوردارە و ئەو دەیگرێت و بەرگریکردنی لێ قەدەغە دەکات و ڕەفتارێکی دیاریکراوی بەسەردا دەسەپێنێت و ملکەچی دەکات بە چاودێریکردن و ئەو قسەیەی کە پێی خۆشە لێی قەدەغە دەکات، بەڵام دیلەکە ئازادیی و سەربەخۆیی خۆی لە سێ شتدا بۆ دەمێنێتەوە و هەرگیز دوژمنەکەی ناتوانێت لێی زەوت بکات کە ئەوانیش:

- لە هەستیدا: بیستنو بینین، واتە ئەو دەبیستێت و دەیبینێت، بە وێنەیەکی سەربەخۆ لە هەستی کەسانی تر هەست دەکات، جا هەرچەندە لایەنی سەرکەوتوو بیەوێت هەستێکی دیاریکراوی بەسەردا بسەپێنێت، ئەوا هەرگیز ناتوانێت، بۆ نموونە ئەوەی بەسەردا بسەپێنێت کە جوان بە ناشرین و ناشرین بە جوان ببینێت.
- لە ژیریدا: ئەو دەتوانێت بیر بکاتەوە و بە ژیریی لە کاروبارەکان ڕابمێنێت، بەو شێوەیەی کە دەیەوێت و بە حوکمی ژیرییەکەی، نەک بە بیر و ژیریی ئەوانەی کە دیلیان کردووە، هەروەها ئەو کەسانەی کە گرتوویانە ناتوانن ئەو شێوە بیرکردنەوەیەی کە خۆیان دەیانەوێت دەربارەی شت و کاروبارەکان، بەسەریدا بسەپێنن.
- لە دڵیدا: ئەو دەتوانێت وەک چۆن دڵی بەلایدا دەچێت خۆشی بوێت یان ڕقی لێبێت، نەک بە حەزی ئەوانەی کە دیلیان کردووە. بێگومان ڕقی لەو کەسە دەبێت کە دیلی دەکات و دوژمنەکەی ئەوی خۆشدەوێت. واتە هیچ جۆرە دەسەڵاتێکیان بەسەر دڵییدا نییە.

بەڵام دیلی ئارەزوو تەواو پێچەوانەی ئەو دیلەیە، چونکە ئارەزوو تەواو دەچێتە

هەست، ژیریی و دڵییەوە و لەناویاندا کاردەکات و دەسەڵاتی بەسەر هەموویاندا دەسەپێنێت. بۆیە ئەو شتەکان دەبینێت وەک چۆن ئارەزوو دەیخوازێت، ناشرین بە جوان و جوان بە ناشرین و باش بە خراپ و خراپ بە باش دەبینێت. بیر لە کاروبارەکان و شتەکان دەکاتەوە و بەو ڕێگەیەی کە ئارەزووی بەسەریدا دەسەپێنێت. جا ئارەزوو و ژیریی و تێگەیشتن و پەیبردن بە ڕاستییەکان دەگۆڕێت.

لەکۆتاییشدا ئارەزوو دەچێتە دڵییەوە و لەناویدا هەڵسوکەوت دەکات، جا مرۆڤ ڕق و خۆشەویستی بەپێی ئارەزوو دەبێت، واتە لەسەر بنەڕەتی باش و خراپی و مرۆڤایەتیبوون نابێت، بۆیە ئارەزوو دەچێتە دوا سەنگەری بەرگریی مرۆڤەوە کە بەرگری دەکات، ئەویش ویژدانی مرۆڤە، بۆیە ویژدانیش زەوت دەکات، بەوپێیە بەبێ هیچ بەرگریی و پارێزگارییەک لە بەرامبەر دوژمنایەتی ئارەزوو دەمێنێتەوە.

بەوشێوەیە کاتێک مرۆڤ بووە کۆیلەی ئارەزووەکانی، ئەوا هەموو پێوەرە زانستیی و ژیرییەکان وەلا دەنێت و ئامادەی سەلماندنی هیچ ڕاستییەکی ژیریی یان زانستی نابێت ئەگەر لەگەڵ ئارەزووەکانیدا یەکنەگرێتەوە. هەربۆیە لە ئیسلامدا ئارەزوو بە بەڵایەکی گەورەی پەیڤین دادەنرێت. وەک دەبینین لە زۆر شوێنی قورئاندا کاتێک پەروەردگار لە سەر زاری پەیامبەرەکەیەوە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکەوێتە پەیڤینەوە و پەیامبەرەکەی ڕووبەڕووی ئەو جۆرە کەسانە دەبێتەوە کە پێوەر و بەڵگەکانیان خستووەتە پەراوێزەوە و (ئارەزوو)ەکانیان بابەتی یەکلاکردنەوەی دۆز و دیاریکردنی ڕاستی و چەوتی بابەتەکانە. لەبەرئەوە لە زۆر شوێندا خودا ئاماژەی بەو بەڵا کوشندەیە کردووە کە تووشی پەیڤین دەبێت و سەرئەنجام دەبێتە شێرپەنجە بۆ پرۆسەکە. لەوبارەیەوە دەفەرموێت: قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِنْ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَكَ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَاءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ اتَّبَعَ هَوَاهُ بِغَيْرِ هُدًى مِنَ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٠﴾ القصص. واتە: (ئەی پەیامبەر (د.خ) پێیان بڵێ دەباشە ئێوە پەرتوکێکی تر بهێنن لەلایەن خواوە کە باشتر و چاکتر بێت لەو دووانە (واتە قورئانو تەورات). ئەوا منیش شوێنی دەکەوم، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن. خۆ ئەگەر بە دەم بانگەوازی تۆوە نەهاتن، واتە نەیانتوانی کتێبێکی تر بهێنن، ئەوە چاک بزانە ئەوانە هەر شوێنی ئارەزووی خۆیان دەکەون).

واتە لێرەدا لە پێگەی بێ بەڵگەییەوە قسە دەکەن و ناڕەزایی دەردەبڕن، بۆیە شێوازی نموونەیی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان بریتییە لە ئاڵینگاری لەگەڵیاندا تا بە سەرسامییەوە لەو پێگەدا کە دۆخێکی لاوازیان تێدا دەنوێنێت، هەڵوێستەکەیان ئیفلیج بکات. (قُلْ فَأْتُوا بِكِتَابٍ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ هُوَ أَهْدَى مِنْهُمَا أَتَّبِعْهُ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٤٩)) واتە ئەو کەسەی باوەڕ بەو دوو کتێبە ناهێنێت، دەبێت لەسەر تێڕوانین بۆ زانینی ڕەگەزەکانی ڕێنموونی لە هزر

و میتۆدەوە دەربچێت. لە میانەی پێوەرەکانی ڕەوایی و ناڕەوایەتیی، بەوپێیەی ئەگەر ڕەتکردنەوەکان بۆ هەریەکەیان لەسەر بنەڕەتی ئەوەیە کە ڕاستی و ڕەوایەتی نانوێنن، ئەوا بێگومان دەبێت ڕاستیی لە غەیری ئەواندا بوونی هەبێت، چونکە خودا گۆڕەپانەکە بەبێ ڕاستی بەجێناهێڵێت.

بۆیە لێرەدا پرسیارێک خۆی دەسەپێنێت: ئەو کتێبەی تر کە لەلایەن خواوە هاتووە و ڕاستیی بە خەڵات بۆ بەندەکانی هێناوە، کامەیە تا شوێنی بکەوین، ئەگەر لاتان چەسپیوە کە باشترین و نموونەترینیانە؟ (ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن) لە بانگەشەکەتاندا و لە ژیربێژییە وروژێنەرەکەتاندا، (ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە) لەبەرئەوەیە بەڵگەیان لەسەر ئەوە پێ نیە کە ڕەتی دەکەنەوە. هەروەها ژیربێژی وەڵامدانەوەی ئەوەیان پێ نیە کە ڕووبەڕوویان دەکرێتەوە، (ئەوە بزانە کە ئەوان شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتوون). لەبەرئەوەی ئەو کەسەی شوێنی ژیریی دەکەوێت، دەبێت لە لۆجیک و خولگەکەیدا بسوڕێتەوە، بە پێوەرە وردەکانی هەڵسەنگاندنەکانی ئەنجامبدات، بەڵام ئەو کەسەی شوێنی ئارەزوو دەکەوێت، ئەوە ئەو کەسەیە لە هەڵچوونە خودییە شەهوەتییەکانیان دەبزوێت و هەر ئەوەشە سەریان لێدەشێوێنێت و ناهێڵێت بەرەو ڕاستیی و حەقیقەت هەنگاو بنێن.


## سەرچاوەکان

١. قورئانی پیرۆز

٢. بورهان محەمەد ئەمین: تەفسیری ئاسان بۆ تێگەشتنی قورئان، چ٣، ٢٠٠٢.

٣. راغب الاصفهانی: معجم مفردات الفاظ القران، دار الکاتب العربی.

٤. السید محمد حسین فضل الله، فی افاق الحوار الاسلامی المسیحی، دار الملاک، ط٢.

٥. السید محمد حسین فضل الله: الحوار في القران قواعده اسالیبه– معطیاته، ط٧، ١٩٨٨.

٦. محمد الریشهری: الحوار بین الحضارات فی الکتاب والسنه، دار الحدیث.


میرێلا گالێتی
و. ڕەوەند سەباح ئەحمەد

# چەند شارێکی کوردی لە دیدی گەڕیدە ئەورووپییەکاندا[1]

---

١. ئەم توێژینەوە لە کۆنفڕانسی نێودەوڵەتی (Kurds and the City. Cities in Kurdistan، the Kurds in the City، Sèvres) لە ١٩ و ٢١ی ئەیلولی پێشکەش کرا.

له شرۆڤەی هەندێک لەو ڕاپۆرتە کۆنانەی ئەوڕووپییەکان، خوێنەر دەگاتە ئەو ڕاستییەی زانیاری لەسەر شارە کوردییەکان چەندە دەگمەنە[١]. جوانی دیمەنی ناوچە شاخاوییەکان، ئاشنابوون بە ژیانی خێڵە ڕەوەندییەکان، چەتەیی و گڕوتینی ئافرەتی کورد، سەرنجی گەشتیار و گەڕیدەکان بۆخۆی ڕادەکێشێ.

مێژووی گەشتکردن گەنجینەییێکی دەوڵەمەندە، زۆرجار سەرچاوەکان دەستکەوتنیان گرانە و ئەستەمە، بۆیە پێشینەی کارەکان دراوەتە بەر ئەو بەشانەی سەرنجڕاکێش و بەرچاون، لێکۆڵینەوەی شارستانی ناوچەی کوردییەکان پێویستی بە نەخشە و شێواز و ئاڕاستەیەکی نوێ هەیە. ئەم توێژینەوە پەیوەستە بە مێژووی گەشتکردنی ئەورووپییەکان. لەگەڵ ئەو بیبلۆگرافیا بە نرخە، کورتەیەک لە ئاڕاستەی گەشتەکان لە کوردستان دەخاتە ڕوو. ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیری ئەو مێژووە بەهادارە نییە، نوسین و سەرچاوە ڕۆژاواییەکان لێرەدا تەنیا وەکو سەرچاوە بەکارهاتوون، لەکاتێکدا ڕەچاوکردنی لایەنی ژیانی شاری پێویستی بە خوێندنەوەیێکی وردتر هەیە بە بەکارهێنانی سەرچاوەی ڕۆژهەڵاتی، بەڵام ئەم تێڕوانینە دەکەوێتە دەرەوەی سنوری ئەم کارە.

حەتمەن پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی سیستەماتیکی ئەرشیفخانە جۆراوجۆرەکانی وڵاتان هەیە، لە پێوەندی دیپلۆماسی حکومەتی ئیمپراتۆری عوسمانی و فارس و ئەرشیفخانەی تەریقەتە ئاینییەکان و مژدەبەرەکانی کوردستان (مژدەبەر کاسۆلیکەکان بە زۆری لە موسڵ کارییان کردووە لەگەڵ دیاربەکر و وان و شوێنەکانی تر).

ئەم لێکۆڵینەوە تیشک دەخاتە سەر نوسین و سەرچاوەکانی سەدەی ١٣و ١٩ و جیاوازی نێوان سەدەکانی ڕابردوو و دواتر دەخاتە ڕوو، تا ئەو کاتانەی بە جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی دێت. سەدەی ١٩ خاسییەتی تایبەتی هەمەچەشنی و هاندانی گەشتیاران سەبارەت بە گەشت و بڵاوکراوەکان دەخاتە ڕوو.

لەبەرئەوە پێویستی بە دیراسەیەکی وردی تایپۆلۆجی گەشتیاران و وەڵامدانەوەی هەندێک پرسیار هەیە. پێویستە بزانین، گەڕیدەکان کێن؟ ئاڕاستەی کوێ کراون؟

---

١. سەیری (Vanly 1973; Rohat 1991; Galletti 1995).

ڕۆژهەڵاتناسی سویدی جاکوب جۆناس بیورنشتاڵ لە یادەشتەکیدا دەڵێت دوانزدە باڵوێزخانەی وڵاتە ئەوڕووپییەکان ساڵی ١٧٧٨لە قوستەنتینییە هەبوون، لەوانە ئینگلتەڕا و فەڕەسنا و ڤێنیسیا و هۆڵەندا و ئەڵمانیا باڵوێزیان هەبوو. مەندوبی ئەڵمانی و سویدی و ناپۆلی و ڕووسی بە بەردەوام بالوێزەکەیان دەگۆڕی. دانیمارک و بروسیا کاربەڕێکەری باڵوێزخانەیان هەبوو. پۆڵەندا کەسی نەبوو لە فەرمانگەی گشتی کار بکات. سەیری (Björnstähl 1782–87، vol. V، p. 212) بکە. باڵوێزەکان یڤێنیسیا هەر سێ ساڵ جارێک دەگۆڕدران (vol. VI، p. 82).

چالاکییەکانیان چین؟ ئایا هیچ جۆرە پێوەندییەکی هاوبەش هەیە؟ چ شتێکی هاوبەش بە درێژایی ئەو چەند سەد ساڵە هەبووە؟ کامانەن ئەو شارانەی زۆرترین سەردانیان کراوە؟ چۆن باسکراون؟

سەرچاوە ئەوروپییەکان (بەگشتی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتالی و ئەڵمانی) لەلایەن گەڕیدە و دیپلۆماس و موژدەدەر و بازرگانەکانەوە نوسراون. زۆربەیان تێبینی و یاداشتی کەمیان لەسەر کورد و کوردستان نوسیوە، چونکە ئاشنایەتیان لەسەر ئەو ناوچانە سنورداربووە. جیاوازییەکی بەرچاو لەنێو ئەو ڕاپۆرتە سادانەی گەڕیدە کۆنەکاندا هەیە، کە شارە کوردییەکانیان وەک هەر چەند شارێکی تر کە پێیدا تێپەڕیون بینیوە، تەنیا لە ڕوانگەی فۆلکلۆرییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەو شارانەدا کردووە، مێژووی ئەدەبیاتی کوردیش، لە کۆتایی سەدەی ١٨ و ١٩ نوسراوەتەوە، کە بایەخێکی زانستی و کەلتووری ورد نیشان دەدات.

ڕاپۆرتی بەرپرسە دیپلۆماس و سیاسەتمەدارەکان زانیاری گرنگ لەسەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەردەخات، بەڵام لەبەرئەوەی بایەخدارن بە نهێنی ماونەتەوە، هەروەها لە ناوخۆدا لە باڵیۆزخانە ئەوروپاییەکاندا پەرت و بڵاون. چەندین دەستنووسی ڕاپۆرتی دیپلۆماسە ڤینیسییەکان لە زۆرێک لە کتێبخانەکانی ئیتاڵیا و ئەورووپادا پارێزراون، ئەگەرچی هیچیان بڵاونەکراونەتەوە بەر لە سەدەی نۆزدە.

دەکرێ دیپلۆماسەکان سیخوڕیشبن، بۆیە ئەوان هۆکارەکانی زاڵبوونی سەربازی عوسمانییەکان شرۆڤە دەکەن، وەسفی هەرێمەکە دەکەن هەر لە قەڵاکانەوە بگرە تا دەگاتە خاڵە ستراتیژییەکان. ئەگەرچی تورکەکان بە داگیرکاری خاک و کەلتووری مەسیحییەکان دادەنێن و ڕۆژئاواییەکانیش داوای گەڕانەوەی وەراسەت و خاوەندارێتی دەکەن. لەبەر ئەو هۆکارە، عادەتەن باسەکان دوو بەش لە خۆدەگرن: ئەو ناو و یادگارییانەی پەیوەندییان بە کەلتوورەوە هەیە، ئەو شوێنانەی کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان. هەربۆیە باس و خواسی ناوچەکە یەکناگرێتەوە لەگەڵ بارودۆخی ئەو گەشتیارەی هەوڵدەدا لە شرۆڤەکانیدا هاوسەنگی لە نێوان قەڵا و وتەی نوسەرە یۆنانی و لاتینییەکان سەبارەت بە ناو و شوێنەوارە کۆنەکان و شوێنی پیرۆزی مەسیحییەکان بپارێزی کە ڕێگای حەجکردن نیشان دەدات[١].

---

١. سەیری (Yerasimos 1991، P. 18، 20) بکە.

## تایپۆلۆجی گەڕیدەکان

بنیامین تودلای (Benjamin of tudela) گەڕیدەی مەزن لە نیوەی دووەمی سەدەی بیست سەردانی پەناگەی جولەکەکانی کوردستان دەکات. بنیامین(Benjamin) بە یەکەم گەڕیدە دادەنرێت کە باسی ژیانی ئەو خەڵکە چیایی و شاخاوییانە بکات، لە ڕاپۆرتەکەیدا «بە تێکۆشەر و جەنگاوەری سەربەخۆ وەسفیان دەکات، دەڵێت سەر بە هیچ پاشایەک یان کاهینێکی نا جوو نین، تەنیا بە تاکە کاهینێکی جولەکەوە نەبێت.»[١]

چونکە موسڵ ناوەندێکی گرنگی بازرگانی و شوێنی تێپەڕینی نێوان بەغدا و حەلەب بوو، ئەو شارە و ناوچەکەی دەوروبەری لای گەشتیار و گەڕیدەکان ناسراو بوو. لە سەدەی ١٣ مارکۆ پۆلۆ(Marco Polo ) دەڵێت:» لە نزیک ئەو شارە، کە مەبەست لێی شاری (موسڵ)ە، شاری موش و ماردین هەن، کە بە ڕێژەیەکی باش لۆکە بەرهەم دەهێنن، پیشەسازی بەرهەمهێنانی (موسڵی) پاتاڵی ئاوریشمی و لۆکەی موسڵییەی لێیە.»[٢]

لەبەرئەوەی ڕێژەیەکی بەرچاو کۆمەڵگای مەسیحییەکانی (ئەرمەنی و نەستۆری و یاقوبی و ئەوانی تری) لێ بوو، بۆئەوەی بیانگەڕێننەوە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی، هەندێک لەو موژدەدەرانە زۆرجار سەردانی (موسڵ)یان دەکرد. هەر لەبەر ئەو هۆیە، لە ناوەڕاستی سەدەی ١٨ نێردەی موژدەدەری دۆمینیکان لە کوردستان دامەزرا، بەشدارییەکی کارای لە ناسینی کوردستان و خەڵکەکەی هەبوو، چونکە ئەو موژدەدەرانەی لەوێ نیشتەجێ ببوون، لە ڕێگەی پەیوەندی ڕۆژانە لەگەڵ خەڵکی، ئاشنایەتیان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە پەیدا کرد، لە ئەنجام چەندین کاری پڕ بایەخ و گرنگیان نوسی[٣].

دۆمۆنیکۆ لانزا(Domenico Lanza)[٤] و مۆریزیۆ گارزۆنی(Maurizio Garzoni) و جیوسیپی کامپانیلی(Giuseppe Campanile) بە تێروتەسەلی وەسفی زمان و

---

1. Ben-Zvi 1957، p. 41; Fischel 1944; Benjamin of Tudela
2. Polo 1958، p. 51.

٠٣ ساڵی ١٣٥١ پاتریارکی کاسۆلیکی لە میزۆپۆتامیا دەمەزرا، ساڵی ٢٣٦١کاری نێردەی موژدەدەری قەشە کاپوچینۆیەکان لە موسڵ موسڵ دامەزرا، ساڵی ٥٢٧١ بە تەواوی داخرا. سەیری sioB بکە.

٠٤ دەستنوسەکانی دۆمێنیکۆ لانزا هەرگیز لە ئیتاڵیا چاپ و بڵاونەکراونەتەوە، هەندێک بەشیان بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدراون و لە عیراق چاپ و بڵاوکراونەتەوە، وەک قەشەیەک و دکتۆرێک لانزا لە موسڵ چاوی بە زۆر کەسی دیارو ناسراو کەوتوە. توانیویەتی بە چڕی و پڕی لە بنج و بنەوانەوە وەسفی کۆمەڵگا و ژیانی ئەوسا بکات. ئەگەرچی ئاڕاستەی پەیامەکانی بۆ نەهێشتنی جیاوازی نێوان کەنیسەی کاسۆلیکی و نەستۆرییەکان بوون، لەبەر ئەو کاروچالاکیانەی، لانزا ئێستا بە پێشەنگی جولانەوەی مەسکۆنی (یەکگرتنەوەی کەنیسە) لە موسڵ دادەنرێت. تێبینی و یاداشتەکانی لەسەر کورد لاوەکین، پەیڕەوی ئاڕاستەی هزری هاوبەشن.

پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووری کۆمەڵگای کوردیان کردووە، هەرچەندە ڕاپۆتەکانیان کاریگەری دیدگا و سۆنگەی ئەورووپیی و عەقیدەی کاسۆلیکی لەسەر بووە، بۆیە گەڕیدەکان دابەش دەکەینە سەر دوو جۆر: پێدەچێت پێشنیەی ئایینی بە نسبەت کوردەوە زۆر گرنگتر بێت بەراورد بە بنەچە و ڕەچەڵەکی نەتەوایەتی.

دوولایی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، مەسەلەی باوەڕێکی پتە و قایم بووە لەنێو ئەورووپییە ڕۆژئاواییەکان. ژمارەیەکی کەم لە ئەورووپییەکان واقعی کوردیان بە واقعی ڕەسەنی خۆیان بەراورد کردووە. پیترۆ دێلا ڤالی(Pietro Della Valle) سەرنج دەخاتە سەر پێکهاتەی سیاسی کوردستان و، بارودۆخی کوردستان لەگەڵ ئیتالیا بەراورد دەکات:» کوردەکان گوێڕایەڵی چەند میرێکن، زۆربەیان لەسەر بنەمای فەرمانڕەوای میراتگرین، بەپێی هەلومەرجی کاتی و شوێنی دان بە هەیمەنەت و دەسەڵاتداری فارس و تورکەکاندا دەنێن، لەگەڵ ئەوەشدا بەناوبانگترینەکانیان ئازادن، هەمووشیان کەم تا زۆر بای ئەوەندە بەهێزن، لەوانەیە لەنێویاندا هەبێت ١٠ تا ١٢ هەزار ئەسپی هەبێت، وەکو میری بەتلیس کە لە قوستەنتینییە بینیم. بەهێزترینەکانیان بەکرێگیرا و شوێنکەوتەکان نین، ئەوان لەژێر پارێزبەندی یەکێک لە دوو پاشایەکەن و جارجارەش ئاڵاکان ئاڵوگۆڕ دەکەن، ئەگەر لە بەرژەوەندی ئەواندا بێت، وەکو ئەوەی هەندێک لە ئاغا و خانەدانەکانی ئیتاڵیا دەیکەن.»[1]

کاپتن جەیمس کریگ(Captain James Creagh) ئاماژە بەوە دەدات:» بارودۆخی کوردستان هاوشێوەی بەرزاییەکانی سکۆتلەندایە پێش چەند سەدساڵێک. هیچ بیرۆکەیەک بۆ یاسا و ڕێکخستنی گشتی لە گۆڕێ نییە، چونکە هەتا قەڵایەکی بچکۆلانەش موڵکی پاشایەکە، هەرکاتێک حەزی لێبێ، ناوبەناو دێتە دەرەوە و پیاسەیەکی ئەو ناوە دەکات. لەڕووی ڕێکخستنەوە، بەتەواوی لە هەموو بەشەکانی تری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی جیاوازە، جگە لە بۆسنیا، کە لە دەرەنجامەکانی سیستەمی دەرەبەگایەتی و لەڕووی میرنشینە بچوکەکانییەوە، لە زۆر ڕووەوە بە کوردستان دەچێت.»[2]

کلۆدیۆس جەیمس ڕیچ (Claudius James Rich)پەردە لەسەر چەند زانیارییەکی تاڵ و ڕوون سەبارەت بە کورد ڕادەماڵێت: « ئیرەیی میرەکانمان هۆکاری ڕووخاندنیانە، نە تورک و نە فارسەکان قەت دەرهەقی ئێمە نایەن، بەڵام سوود لە جیاوازیی و ناکۆکییەکان و ململانێی خانەوادەی فەرمانڕەواکان دەبینن، ئەگەرچی ئێمە لەوە بەئاگایین، بەڵام تاڕادەیەک تورکەکان بەسەرمان زاڵدەبن و سەردەکەون، بێگومان ئێمەی کورد تێگەیشتنمان زەحمەتە.»[3]

1. Della Valle 1667، vol. II، p.
2. Creagh 1880، vol. II،
3. Rich 1836، vol. I، p. 90. Claudius James Rich (28/3/1787-

لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٨ چاپ و بڵاوکردنەوەکانی سەر کورد، کەسایەتییەکان و جۆری گەڕیدەکەشی گۆڕی. لەوکاتەوە گەشتی زانستی لەلایەن حکومەتەکانەوە پشتگیری لێ دەکرا. ئەوسا پاشای دانیمارک نایت کاریستین نیبوهری(Knight Carsten Niebuhr) ناردە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تاکو چەند لێکۆڵینەوەیەکی گەردونزانی بکات، ساڵی ١٧٦٦ چاوی بە دوو دۆمینیکا دەکەوێت.[١] هەر لەو سەدەیەدا، ڕۆژهەڵاتناسی سویدی بەناوی جاکوب جۆناس بیورنشتاڵ(Jacob Jonas Bjornstahl) گەشتێکی دورودرێژ دەکات و تا دەگاتە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی.[٢]

لە سەدەی ١٩ جۆرێکی نوێ لەو گەشتیار و گەڕیدانە سەردانی ناوچەکەیان دەکرد، ئەوانیش بریتی بوون لە گەڕیدەی سەربازیی و شوێنەوارناسی و ئەنگلۆساکسۆنی و موژدەدەرە پرۆتستانتە ئەمەریکییەکان و ئافرەتەکان. زۆربەیان جاسوس و بریکار و دارودەستە و چالاکوانی سیاسەتی نیشتیمانی وڵاتە زلهێزەکانی ئەوروپا بوون. ئەو گەڕیدانە لەلایەن حکومەتەکانیان بۆ کوردستان نێردرا بوون، بەمەبەستی دۆزینەوە و دەسکەوتنی زانیاری جوگرافیی و ستراتیژیی و هۆکاری مرۆڤناسی کۆمەڵایەتی و چاودێریکردنی زانستییانەی سەرچاوە کانزاییەکانی و شتگەلی تر.[٣]

لەنێو ئەفسەرە سەربازەکاندا، ئەمانەی خوارەوە شایەنی باسکردنن: ڕائید فڕانسیس ڕۆودۆن چیزنی(Lieutenant-Colonel Francis Rawdon Chesney)، کاپتن جەیمس کریگ(Captain James Creagh) ، مەیجەر فریدریک میلینگن(Major Frederick Millingen)، مولازم ویلیەم هیودە(Lieutenant William Heude)،

5/10/1820) hon. East India Company's resident at Baghdad.

1. - Bois 1965، P. 276

٠٢ بیورنشتاڵ. ١٧٨٠-٤٨، lov. v، P. ٤٨. لە چاپە سویدییەکەی نوسەر نامەیەک لە قوستەنتینەوە بڵاودەکاتەوە مێژووەکەی بۆ ٨ی کانونی دووەمی ساڵی ٨٧٧١ دەگەڕێتەوە، لەو نامەدا باسی دۆمێنیکەکانی ئیتاڵی دەکات لە موسڵ، کە خەریکی ئامادەکردنی کتێبێکی ڕێزمانی زمانی کوردین و لەگەڵ کتێبێکی تایبەت بە جۆگرافیا و مێژووی کوردستان. لەوانەیە مەبەستی لە دەستنوسی فەرهەنگەکەی مۆریزیۆ گارزۆنی و دۆمێنیکۆ لانزا بێت.

٠٣ بۆ ئەم بابەتە، سەیری ئەو وتارانە بکە لە گۆڤاری (lacihpargoeG layoR eht fo lanruoJ ehT yteicoS) بڵاوکراونەتەوە، لەسەر ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و فارسی،و ئەو ناوچە دوورەدەستانەی حوکمی لێ دەکەن، وەک کوردستان لە سەدەی ٩١ دا. حەزو خولیاکە لەسەر ناوچەکە ساڵانی ٩٣٨١-١٤٨١ هەروەها ٣٦٨١-٨٦٨١ زیاتر پەرەی سەند. بۆ ئەم مەبەستە سەیری یاداشتەکانی (htrowsniA mailliW، semaJ tnarB، kcirederF sebroF، R. J. nedraG، R. N. ttocsalG، "snoitcurtsnI notgnilloP، H. C. nosnilwaR) بکە.

مولازم فریدریک والپۆڵ(Lieutenant Frederick Walpole)، کۆلۆنێل گاسپارد درۆڤیل(Colonel Gaspard Drouville)، ژەنەڕاڵی پروسی (ئەڵمانی) هێلموس ڤۆن مۆڵتکە(Helmuth von Moltke) و کاپتنی ئیتاڵی ئەلیساندرۆ دو بیانچی(Alessandro De Bianchi). لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیست، لەگەڵ دەرکەوتنی چەند کەسایەتییەک، لەوانە ژەنەڕاڵە فەرەنسییەکانی سوریا و لوبنان، وەکو پیر ڕۆندۆت و چارلس دوگۆل(Pierre Rondot and Charles de Gaulle)، هەروەها ئەفسەرانی بەریتانی لە عێراق وەکو سێسیل ئێدمۆندز و مەیجەر سۆن(Edmonds)،(Major E. B. Soane) وجودی دەسەڵاتی سەربازی پەرەدەسێنی.[1]

شایەنی باسە ئۆستن هێنری لایارد(Austen Henry Layard) و هۆرموزد ڕەسام(Hormuzd Rassam) لەنێو گەڕیدە شوێنەوارناسەکان بوون.[2] جۆن ئوشەر(John Ussher) و هەندێک لە گەڕیدەی تر ئاماژە بە هەبوونی موژدەدەری ئەمەریکی لە بەتلیس و دیاربەکر دەدەن.[3] بەگوێرەی تیۆفایل دێیرۆلی(Théophile Deyrolle) تەنیا لەنێو ئەرمەنییە گریگۆرییەکان خەڵکیان لە دین هەڵدەگەڕاندنەوە» بەزۆری ئەوانە خەڵکی هەژار و کەم دەرامەت بوون، بۆ جلوبەرگ و کەمێک پارە وازیان لە بیروباوەڕیان دەهێنا، هەرکاتێکیش پارەکەیان نەمابا، یاخود جلوبەرگەکانیان کۆن ببان و دڕابان، دەگەڕانەوە سەر بیروباوەڕی کۆنیان.[4]

ئیدا فیفەر(Ida Pfeiffer)، یەکێک بوو لەو ئافرەتە نەمسایانەی پێویستە ناوی بهێنرێت، لە سەروبەندی گەشتەکەیدا لە دەوری جیهان ساڵی ١٨٤٨ سەردانی موسڵ و ڕەواندزی کرد.[5] شازادە خاتونی ئیتاڵی کریستینا تریڤۆلزیۆ دی بێلجیۆیۆسۆ(Cristina Trivulzio di Belgioioso)، کاتێک لە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٥ بۆ چەند ساڵێک لە ئاسیای بچووک ژیان دەباتە سەر، چاوی بە کوردەکان دەکەوێت، لەوبارەشەوە دوو کتێب لەسەر بیرەوەرییەکانی دەنوسێت[6]. لە کۆتاکانی سەدەی نۆزدە مادام چانتری و لوسی کارنیت و ئیزابێلا بێرد لەبارەی کوردستانیان نوسیوە[7].

ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدە بە سەردەمی زێڕینی گەڕان و دۆزینەوەکانی ئەو

---

1. Rondot 1933;  de Gaulle 1930; Edmonds 1957; Soane 1926
2. Layard 1849، 1853; Rassam 1897
3. Ussher 1865، p. 346; Rassam 1897، P. 105-108
4. Deyrolle 1877، P.154
5. Pfeiffer 1852.
6. Trivulzio di Belgioioso 1858
7. - Garnett 1893; Madame Chantre، B. 1893; Bird 1891

بەشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دادەنرێت.[1] زانیاری بەرفراوانتر لەسەر شێوازی ڕێکخستنی ناوچەکە لە ڕووبار و هێڵی پەیوەندی لەنێو شارەکان و لایەنی جەستەیی و ماددیی و جوگرافیا و سەرچاوەکان و خاک نەوعییەتی کشتوکاڵ و کۆمەڵگا و ژمارە و قەبارەی پاشماوە کۆنەکان و ژینگە و شوێنی نیشتەجێ و شوێنەوار و ئاسایشی سەربازیی و قەبارەی خانووەکان و دیوەخانی ڕێبواران و سیستەمی باج و سەرانە و کۆمەڵگا ئایینیەکان کۆدەکرانەوە.[2]

پیاوە ئایینیەکان باسی موڵک و ماڵ و دانیشتوانی ئایینی، دابەشبوونی پەرستگا دینییەکان و، وجودی میحراب و گۆڕی قەشە و شێخەکان دەکەن. کەم لەسەر ئەندازیاری تەلارسازی و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و چالاکی هاوشێوە نوسراوە. شارەکانی کوردستان وەکو شارەکانی باکووری ئەفەریقا و ڕۆژئاوای ئاسیا بەپێی جیاوازی هەڵکەوتەی نەتەوەیی و بیروباوەڕ و ئایین و زمان و عەشیرەت دابەش دەبنە سەر چەند بەشێکی جیاواز. بەگوێرەی چەند دەلیلێک، شێوەی ئەو شارە جۆراوجۆرانە هیچ پێکهاتەیەکی ئیسلامی لە خۆناگرن، بەڵام بەلایەنی کەمی بۆ هەزارەی یەکەمی پێش زایینی دەگەڕێنەوە، لەو سەردەمەی شارە دێرینەکانی ڕۆژهەڵات دابەش دەبوونە سەر چەند بەشێک، لەسەر ئەساسی ڕەچەڵەک و خزمایەتی و بنەماڵە، ڕەنگدانەوەی بنەما دێرینەکانی سامییەکانی لە ڕێکخستندا هەبوو.[3]

گەڕیدەکان زۆرجار بە چڕ و پڕی باسی قۆناغە جۆراوجۆرەکانی گەشتەکانیان و ئەو پێشوازییەی لێیان کراوە دەکەن، تاکو هیچ زانیارییەکی زیاتر نەخەنە ڕوو. لەبەر ئاستەنگەکانی گەشتکردن و هاتن و چوون، کوردستان لە گەشتوگوزار دوورەپەرێزە، لەجیاتی ئەوە، جموجۆڵی بەرچاوی شەپۆلی ڕۆمانییەکان بۆ دۆزینەوەی ڕۆژهەڵات و

---

٠١ بەگوێرەی ئێدمۆندز ئەمە « سەردەمی ئەستێرە گەورەکانی وەکو ڕیچ و کۆلۆنێل چیزنی و لایاردە»، سەیری (sdnomdE، ٧٥٩١، P. ١٢) بکە. ئێدمۆندز چەند لێدوانێکی بە نرخ لەسەر گەڕیدە بەریتانیەکانی سەدەی حەڤدە لە کوردستان دەدات، لەگەڵ چەند کورتە تێبینییەک لەسەر هەر گەشتێک و بەرنامەکەی (P. ٢٢-٨٢). لە ساڵی ٥١٩١ نوسەرەکە وەکو ئەفسەری سیاسی لەگەڵ هێزی گەڕیدەی بەریتانی لە میزۆپۆتامیا و ڕۆژاوای وڵاتی فارس دامەزرا، دواتر لە ئیدارەی مەدەنی ناوچەی ئینتدابی عێراقی، بە ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق دەستنیشان کرا، ٥٣٩١-٥٤٩١

٠٢ جۆلی ڕیدۆنی باسی حەزو ئارەزووی کلۆدیۆس جەیمس ڕیچ و جۆرج پێرسی بادگیر دەکات، بەرامبەر مەسیحییە ڕۆژهەڵاتییەکان: « کاریگەری زۆری ئینجیل لەسەر کەلتوری ئینگلیزی و بوژاندنەوەی ئینجیلی سەدەی ٩١، هانی گەڕیدەکانی دا ئاماژە بەچەندین سەرچاوەی کتێبەکە بدەن، ڕەنگدانەوەی جیهانی ئینجیلی، بۆیە مەسیحییەکانی ڕۆژهەڵات دەورێکی کاریگەریان گێڕا.»

30 Wirth 1982، p. 197

گەڕان بەدوای شوێنەوارەکان لە فەلەستین و میسر دیار و بەرچاو بووە. لەو سەردەمەدا، گەڕان و لێکۆڵینەوە لەسەر پاشماوە و شوێنەوارە دێرینەکان تاڕادەیەکی بەرچاو پەرەی سەندووە، شارستانییەتە کۆنەکانی میزۆپۆتامیا زیاتر بەهەند وەرگیراون، کەچی بارودۆخی هاوچەرخی مسوڵمان و کورد و عەرەب و عوسمانی و فارسەکان وەلاوە نراون، جگە لەو باسانەی خراونەتە ڕوو لە ڕێی دەستنووسەکانی دۆمێنیکۆ لانزا(Domenico Lanza) و کتێبی گیوسیپی کامپانیلی(Giuseppe Campanile) و هەردوو ئەو دۆمێنیکۆیانەی بۆ چەند ساڵێک لە موسڵ ژیاون. پێدەچێ بەرهەمەکەی ژین باپتیستی تاڤەرنیر-Jean) (Baptiste Tavernier نامیلکەیەکی گەشتیاری بێت، چونکە سەرنج خراوەتە سەر دووری نێوان شوێنەکان و باس و خواسی چەندین شار. کارستین نەیبوهر(Carsten Niebuhr) وادادەنێت بەناوبانگترین و ئاوەدانترین شارەکانی ڕۆژهەڵات وەکو قوستەنتینییە و قاهیرە و دیمەشق و حەلەب و دیاربەکر و موسڵ و بەغدا زۆر بەدەگمەن هێندەی شارۆچکە ئاوەدانەکانی ئەوروپا دانیشتوانیان تێدایە.[١] گاسپارد درۆڤیلی(Gaspard Drouville )[٢] فەرهەنگۆکێک لەبارەی شارە کوردیی و نا کوردییەکان دەخاتە ڕوو. مولازم ویلیەم هیودە[٣] (William Heude) سەرنج بۆ چەند شارێکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ڕادەکێشێت لەوانە سلێمانی و هەولێر و ماردین و دیاربەکر.

### شارەکان و گەڕیدەکان

لەنێو کۆنترین ئەو وتانەی لەسەر شارە کوردییەکان هەنە، ئەو وتەیەیە کە بازرگانە نەناسراوەکەی ڤینیسیا(Anonymous Merchant of Venice)[٤] وتویەتی، کە سەردانی (وان و بەتلیس و ماردین)ی لە ساڵی ١٥١٧ و ١٥٢٠ کردووە. لەو شارانەی لە هەمووشیان زیاتر باس کرابێت، شاری (ئامێدی)یە لە سەدەکانی ١٧ و ١٨، شاری بەتلیس و دیاربەکرن تا سەدەی ١٩، هەولێرە لە سەدەی ١٨، لەسەرووی هەموشیانەوە تا سەدەی ١٨ شاری (ماردین)ە، بە درێژایی سەدەی ١٩ شاری سلێمانییە. شارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان (سنە و مەهاباد) فەرامۆش کراون، هەموو ئەوانەی باسکران لە سەدەی ١٩ ناو و دەنگیان هەبووە.

1. Niebuhr 1776-1780، 11 vol.، p. 325

2. Drouville 1829، vol. I، p. 142 et segg.

3.William Heude was Lieutenant of the Madras Military Establishment.

4. Anonymous Merchant of Venice (Anonimo mercante veneziano) 1563-1606، p. 78-6. The Anonymous Merchant of Venice has been identified with the Cypriot Francesco Romano who made several journeys in Syria and Azerbaijan، and spent some years in the Levant (1507-1510)، and lost his goods in Diyarbakir in 1513. See Aubin 1995.

لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩،  ئاماری دیار و بەرچاو لەسەر دانیشتوانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و فارسی بڵاوکرایەوە[١]. بەگوێرەی کۆلۆنێل چیزنی(Colonel Chesney) بێ، «لە هەندێک حاڵەتدا، دەکرێ تا ئێستاش هەندێک لەو شوێنانە بناسێنرێن، بەڵام تاڕادەیەکی زۆر، بەشی هەرە زۆریان نەناسراون، شارەکانی وەکو موسڵ و سێرت و ئامێدی (شارۆچکەی مادەکان) و بەتلیس و وان و هەولێر و سلێمانی و کۆیە و کەرکوک و زاخۆ و ڕەواندوز و جۆلەمێرگ (هەکاری) پێشتر جێ پێی ئیمپراتۆرییەتی ئاشووری بوون[٢]»

کوردەکان عورفێکی زۆر کۆنیان لە ژیانی شاردا هەیە. هەولێر بە کۆنترین شار دادەنرێت، کە تا ئێستاش ژیانی تێدایە[٣]. گوند و شارۆچکەکان لە پێدەشت و قەدپاڵی چیاکان بنیاتنراون. شارەکە بە تۆکمەیی دروستکراوە، لەوانەیە لە بنەڕەتدا بۆ مەبەستی بەرگری[٤] لە خۆکردن بەمشێو قایمە دروستکرابێت. بە گوێرەی میسۆد فانی بێت:

هەر لە دێر زەمانەوە تا هەنوکە، ژیانی کوردەکان بەشێوەیەکی وا بەرچاو نەگۆڕاوە، کوردەکان خۆیان لە پەناگە و ماڵەکانی خۆیان هێشتۆتەوە، هەرچۆنێ بێ بەمجۆرە لە هێرشی بیانی پارێزراو بوون و خۆیان لەنێو چیاکان پاراستووە، لە تەنگانەدا شاخەکان وەک قەڵایەک و شورایەکی پۆڵاین بوون، داگیرکەرانیش بە هەموو نەژاد و نەتەوەیەک خۆیان لە برین و بەزاندنی ئەو شاخانە بەدوور گرتووە، چونکە تاڕادەیەک قورس بووە دەستی بەسەردا بگرن.»[٥]

بەپێی گوتەکانی مەیجەر فریدیریک میلینگن(Major Frederick Millingen) بێت:» وڵاتی کوردستان زەویی و زارەکەی بێبەرە، کشتوکاڵ و باغ و باغات تەنیا لە هەندێک شار و شارۆچکە دەبینرێن و لەوەڕ و لەوەڕگا بە تەنها سەرچاوەی بژێویی و ژیانی دانیشتوانی ناوچەکە دادەنرێت.[٦]»

کۆڵۆنێک گاسپارد درۆڤیلی(Gaspard Drouville)، کە لە خزمەتی قەیسەر دابوو، ئاماژە بە جیاوازی ڕۆڵی ئافرەتی شارستانی و گوندیی دەکات:»  ئافرەتەکان هەمیشە زەحمەتکێش و سەرقاڵن و زۆریش کارامەن، هەردوو توێژەکە لە گوند و شاردا پاک و خاوێنیان پێوە دیارە. جلوبەرگی ئافرەتە ڕەوەندیی و گوندنشینەکان زۆر لە پۆشاک

1. Ubicini 1853; Cuinet 1890-1895; Duhousset 1863
2. Chesney 1850، vol.1، p. 120
3.  Kinnane 1964، p. 7
4. Barth 1953، p. 102
5. Fany 1933، p. 70
6. Millingen 1870، p. 245

و جلی ژنانی شار جیاوازە. ئەوان کراسی درێژ دەپۆشن، بە پشتێن و قایش بەستراون کۆتاییەکەیان لە پێشەوە شۆڕبوونەتەوە. چارۆکەی لە لۆکە دروستکراو دەپۆشن، هەر دوولای کوڵمە و ڕوومەتی داپۆشیوە و تا ناوەڕاستی پشت شۆڕبۆتەوە، هەندێک جار ئەو سەرپێچانە لە قوماشی حەریری سازدەکرێن و لە سەریان دەئاڵێنن و لە نێوچەوانیان گرێ دەدەن. [١]»

لوسی گارنێت(Lucy Garnett) باسی ئاستی ڕۆشنبیری ئافرەت دەکات و دەڵێت: ئافرەتی شارەکانی وەکو سلێمانی و ناوچەکانی تر، هەرچەندە بەو ڕادەیە نەخوێندەوار نین، چونکە مەلا و شارەزای بواری دینیان لێیە بۆ ڕوونکردنەوەی شەریعەتی ئیسلامی و فێرکردن لە قوتابخانەکان. ئافرەت و کچی خوێندەوارەکان، هەر هیچ نەبێت ئەوەندە فێرکراون بتوانن بە زمانی فارسی بخوێننەوە و بنووسن، کە زمانی وێژە و ئەدەبە، چونکە ئەدەب و وێژەی کوردی وجودی نیە، سەرەڕای ئەوەی، چەند هەوڵێک لەلایەن چەند مەلایەکەوە لە سەرەتای ئەو سەدەیە لە ئارادا هەبوو تاکو بە زمانی کوردی بنووسن و بڵاوبکەنەوە. [٢]»

فرایزەر(Fraser) دەڵێت: لە سنە و سلێمانی و بەتلیس و شارەکانی تر مزگەوت و پیاوی ئایینی هەن، لەو ناوچانە هەروەکو ناوچەکانی تری وڵاتی فارس بە شەریعەتی نوسراو کاروباری ئیداری بەڕێوە دەبرێت. بەڵام بەگشتی لەلایەن عادەت و عورفی پێشینان ژیانیان بەڕێوەدەبرێ، گوێڕایەڵی تەواوی سەرکردەکانیان دەکەن، ئەویش لە بەرامبەردا بەرگریان لێدەکات و دەسەڵاتی خۆی لە هەموو بۆنەکاندا بەکاردەهێنێت، بەڕەچاوکردنێکی توندی عورف و لایەنگیرییان.[٣]»

دۆمێنیکۆ لانزا(Domenico Lanza) سەردانی زۆر شار و گوندی کوردەکانی کردووە، هەم بۆ مەرامی شوێنەوارناسی هەمیش بۆئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری باروگوزەرانی مەسیحییەکانی ئەو ناوچانە بێت. زۆر بە وردی باسی شار و ناوچەکانی ئامێدیی و دیاربەکر و ماردین و موسڵ و ئورفە و دەکات. بۆیە پێویستە لە دەستنووسەکەی لانزا باسی وەسف و گوزارشتی ئەو گەڕیدە کۆنانە بکەین، کە تیشکیان خستووەتە سەر شارە گرنگ و سەرەکییەکان، ئەو شارە کوردییانەی باسیان دەکەین لە ( ئامێدی و بەتلیس و دیاربەکر و هەولێر و ماردین و سنە و سلێمانی و ئورفە و وان) پێکدێن.

«شاری دێرینی ئامێدی بە درێژای مێژوو، ناو و ناوبانگی خۆی هەبووە، ئەو شارە دەکەوێتە دامێنی چیایەکی سەرکەش، کە تەواوی شاخ و بەردە، ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای

---

1. Drouville، 1829، vol. I، p. 127
2. Garnett، 1893، part III، p.130
3. Fraser 1833، p. 272

به چیا دەورە دراوە. هەرکە بەرەو لوتکەی چیاکە دەڕۆی پاشماوە و شوێنەواری چەند کۆشکێک بەدیدەکرێت، کە پێموایە لە دێرزەمانەوە قەشە و ڕەبەنەکان لێی نیشتەجێ بووبن. بەرلەوەی بچینە بەری باشووری ئەو شارە، پێویستە بە ڕێگەیەکی دووسەعاتی تێپەڕبین کە بەنێو شینایی و باخ و باخچەی پڕ میوەدا دەڕواتە خوارەوە. لە دەروازەی شارەکەدا، ڕووکاری کەنیسەیەکی گەورە دەبینرێت، کە شێوازی کۆنە و بە مەڕمەڕ دروستکراوە. دوای ڕۆیشتنم، پێیان وتم، کە بە نووسینی لاتینی لەسەر دەروازەی مزگەوتی گەورە هەڵکۆڵدراوە. ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنی و یۆنانی لەم شارەدا دەژین. ئەمە شارێکی تەواو گەورەیە، ڕووباری پێدا تێپەڕ دەبێت، لەو ڕووبارە لە ڕێی چەرخی ئاو هەڵگۆز (ئاشی ئاو)، خەڵکەکە ئاو بۆ شینایی و کشتوکاڵ ڕادەکێشن.»[١]

گیوسیپی کامپانیلی(Giuseppe Campanile) بەمشێوە ئاماژە بە ئامێدی دەکات:»ئامێدی دەکەوێتە سەر لێژاییەکی زۆر سەخت، بەچیای سەخت و بەرز دەورە دراوە، ئەمەش وادەکات بەزەحمەت بگەیتە ئەو ناوچە، شێوەی قەڵایەکی هەیە، بۆیە شارەکە زۆر قایم و پتەوە. شارێکی زۆر تۆکمە و بەتینە، حەوت وەزیر و چەندین پاشای دەوروبەری لە سەردەمە جیاوازەکاندا هەوڵیاندا دەستی بەسەردابگرن، بەڵام نەیانتوانیوە. بە هەبوونی چەند تۆپهاوێژێک ئەو شارە دەتوانی بەرامبەر هەر سوپایەکی ئاسیایی بەرگری لەخۆی بکات. بەسەر شوێنێک دەڕوانێت، دوو ڕۆژی دەوێت تا بەناویدا تێپەڕبیت، زەوییەکی وشکە، چوار هەزار گوندی لێیە. هیچ پیشە و پیشوەریی و پیشەسازییەکی لێ نییە، جگە لە هەندێک کاری کوتاڵ و چنین و پیشەی قوڕکاری. بێکاریی و هەژاری باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە. دانیشتوانەکەی بە سێ هەزار کەس دەخەمڵێندرێت و نزیکەی سەد مەسیحی کاسۆلیک مەزهەبی لێیە و نەستۆرییەکانی کەمترن و لەگەڵ هەشتا جولەکە.»[٢]

---

٠١ لە ڕووی مێژووییەوە، ئامێدی شارێکی زۆر بەناوبانگە، دەکەوێتە قەدپاڵی چیایێکی بەرز، تەواوی شارەکە لەبەرد دروست کراوە، هەر لە ڕۆژهەڵاتەوە تا باکوور بە شاخ و داخ دەورەدراوە هەرکە بەرەو لووتکەی چیاکان هەنگاو دەنێیت، لێرە و لەوێ پاشماوەی چەند کارگە و پیشەیەک وەبەرچاوان دەکەویت، من لەو باوەڕەدام، قەشەکان لەو شوێنانە کاریان کردبێت یان نیشتەجێ بووبن. بەر لەوەی بچینە نێو شارەکە نێوەڕۆیەکەی، نزیکەی دوو سەعات بە باغ و باغات و داروبارەکاندا تێپەڕبووین، لە دەروازەی شارەکەدا، ڕووکاری کەنیسەکە بە بەردی مەڕمەڕی ڕەشی کۆن دروست کراوە، دوای ڕۆیشتنم، پێیان گووتم لەسەر دەرگای مزگەوتێکی گەورە، نەخش و هەڵکۆڵینێکی لاتینی دەبینرێت. لە شارەکەدا، ئەرمەنی و یۆنانی دەژین، لە لایەکی تری شارەکە، ڕووبارێکی گەورە هەیە، بە ئاشی ئاوی ئاو بۆ باخەکانی سەروە دەکێشن ((tpircsunam aznaL، p. ١٢٨–١٢٩)

٠٢ ئامێدی پایتەخی بادینان دەکەوێتە سەر شاخێکی لێژ و سەخت، چەندیم شاخ و کێوی تر دەورەیان

ئەم خەملاندنە ئاماژە بە کەمبوونەوەی ژمارەی جولەکەکان دەدا لە ئامێدی. بنیامین تودیلای(Benjamin of Tudela) گەڕیدەی مەزنی جولەکە ساڵی ١١٧٠ باسی ئەم شارە دەکات و ژمارەی جولەکەکانی ئەوسا بە ٢٠٠٠ خێزان مەزندە دەکات. دەیڤید ئەلرۆی گەورە سەرکردەی سیاسی لە حەملەیەکی مەسیحی سیاسیدا ویستی هەموو جولەکەکان بەزەبری هێزی لە چنگی غەیرە جولەکەکان ئازاد بکات. یاخیبوونی جولەکەکان دژی دەسەڵاتدارە فارسەکان دامرکایەوە و دەیڤید ئەلرۆی کوژرا، بەڵام سەرهەڵدانی جولەکەکان دژی ستەمکارەکانیان مۆرک و کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر هەموو جولەکەیەک بەجێهێشت لەو ڕۆژەدا، نەک تەنیا لە وڵاتی فارس و کوردستان. «[1] بەگوێرەی ئەو بەڵگە و نامانە بێت، کە لە سەدەی ١٦و دواتر پارێزراون، ئامێدی پێگە سەرەکییەکەی خۆی لەنێو کۆمەڵگای جولەکەنشینی کوردستان پاراستبوو.[2]

ژین باپتیستی تاڤێرنیر(Jean Baptiste Tavernier) بەمشێوە باسی ڕەوشی ئامێدی دەکات:» ئامێدی شارێکی بە سوودە، بەشی زۆری جووتیارانی ئاسووری تووتن و مازی لێ ساغ دەکەنەوە. ئامێدی دەکەوێتە سەر شاخێکی زۆر بەرز، سەعاتێکی دەوێت تا دەگەیتە ئەو شوێنە. لەنێوەی ڕێگا سێ چوار کانیاوی لێیە لەناو بەرد و شاخەکان هەڵدەقوڵێن. لەبەرئەوەی ئاو لەناو شارۆچکەکە نییە، خەڵکەکە بەیانیان یان ئێواران دێنە خوارەوە بە وڵاخەکانیان توورەکە پێستییەکان پڕ ئاو دەکەن. شارەکە تەواو گەورەیە لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی شارەکەدا هەموو جۆرە بازرگانییەک هەیە. لەژێر حوکمی بەگێک بەڕێوەدەچێت، کە دە تا دوانزدە هەزار ئەسپی هەیە و ژمارەیەکی زۆرتریش لە هێزی پیادەی لێیە بەراورد بە ئاغا و بەگەکانی تر، چونکە زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە کوردن.[3]

---

داوە، هەر بۆیە گەشتنە نێو ئەو شارە زەحمەت و گرانە.شێوەی شارەکە لە قەڵایەک دەچێت، پێگەی شارەکەش وای لێکردوە زۆر قایم و تۆکەم بێت. بۆ ماوەی ٢١ ڕۆژ لە دەوروبەری شارەکەدا گەڕین و سوڕاین، زۆربەی خاکەکەی بێ بەرهەمە، نزیکەی چوار هەزار گوند لە دەوروبەری هەیە. لێرە هیچ هونەر و پیشەیێک نییە، ئەوەی هەیە کار و پیشەی قوماش چنین و قورکارییە. لێرە تەمبەڵی و بێکاری باڵی بەسەر ناوچەکەد کێشاوە. ژمارەی دانیشتوانەکەی سێ هەزار کەسێک دەبێت، لە ناویاندا ٠٠١ کەس مەسیحی کاسۆلیکین، لەوانە کەمتریش نەستۆرییەکانن، ژمارەی جولەکەکانیش نزیکەی هەشتا کەسێک دەبێت، بڕوانە (elinapmaC ،٨١٨١ .p ٣٢-٥٢)

٠[1] بە گوێرەی ئریچ بۆوەر بێت، بێنجامین تەنیا سەردانی ناوچە سنوورییەکانی کوردستانی کردوە، نەچۆتە نێو قوڵایی شوێنە شاخاوییەکان، تەواوی باسی ئامێدی مۆرکێکی قسە و قسەڵۆکی پێدەدات، نەوەکو ڕاپۆرتی شایەتحاڵەکان. سەیری برۆوەر بکە (reuarB، ٣٩٩١، P.٨٣)

2. «Amadiya"، in: Encyclopaedia Judaica، 11، p. 786.

٠[3] reinrevaT، ٢٨٦١، p. ٩٧١. سالمۆن باسی هەمان زانیاری دەکات: « ئامێدی شارێکی بە سوودە،

لە هەمان سەردەمدا، فابوری(Fabure) دەگێڕێتەوە و دەڵێت:» خانەدانترین میرەکانیان ئەوانەن کە دوو سێ ڕۆژە ڕێ لە نەینەوا لە شوێنێک نیشتەجێن و بە ئامێدی ناسراوە، بە کابوچین ناویان دێنێ کە پەیامێکی موژدەدەریان لە موسڵ هەبوو. داوای لێکردن بۆ دووسێ مانگ لە دیوەخانەکەی بمێننەوە.»[1]

سێستینی (Sestini) ئاماژە بەوە دەکات: ئامێدی لەلایەن میرێکی کورد بەڕێوەدەچێ بەناوی ئیسماعیل پاشا خەلیفە ئەلبەغداد، سەر بە بنەماڵەیەکی زۆر کۆنن، گۆڕەکانیان بۆ ساڵی ٧٠٠ی هیجری دەگەڕێتەوە.» قەشەکان شەرابێکی چاکی براندی بۆ خۆیان ئامادە دەکەن.

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە، جۆن کینیر(John Kinneir)، هەمان بۆچونی هەیە، دەڵێت: پاشای ئامێدی میرێکی میراتگر و سەربەخۆیە، نەوە و وەچەی بنەماڵەی شاهانەی عەباسییەکانە، هەر لە وەختی دورخستنەوەی خەلیفەکان لە بەغدا، باپیرە گەورەکانی میری ئامێدی بوونە. یەکێکە لە بەهێزترین و دەوڵەمەندترین میرەکانی کوردستان، ئامێدی شارێکی قایم و پتەوە لە باکووری موسڵ. خاوەنی سی و یەک ناوچەی نیشتەجێبوونە، بە گەنمەشامی و شەراب بەناوبانگە، کورد و نەستۆریی و ئاسووریی و کلدانی و کاسۆلیکی لێ نیشتەجێن.»[2]

سەبارەت بەمە، لە کۆتاییەکانی سەدە، هێنری بیندەر(Henry Binder) بەمجۆرە چاودێری دۆخەکە دەکات:» لە سەرووی شارەکە تەنیا جولەکەی لێ دەژی، بەشێکی زۆری دانیشتوانەکە پێکدەهێنن. ئافرەتە جولەکەکان زیاتر هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوانی مسوڵمان دەکەن، نەک بەپێچەوانەوە. پیاوەکان قەدە پیاون، قامەتێکی ڕێکیان هەیە. هەرچی ژنە جولەکە و کوردەکانن، لاواز و بچووکن، ئەگەرچی لە ڕوواڵەتیان ناشیرین

---

بەشی زۆری جووتیارانی ئاسووری  توتن و مازی لێ ساغ دەکەنەوە. ئامێدی دەکەوێتە سەر شاخێکی زۆر بەرز، سعاتێکی دەوێت تا دەگەیە ئەو شوێنە. لەنێوەی ڕێگا سێ چوار کانیاوی لێیە لە ناو بەرد و شاخەکان هەڵدەقوڵێن. لەبەرئەوەی ئاو لە ناو شارۆچکەکە نییە، خەڵکەکە بەیانیان یان ئێواران دێنە خوارەوە بە وڵاخەکانیان توورەکە پێستییەکان پڕ ئاو دەکەن. شارەکە تەواو گەورەیە لە ناوەڕاستی گۆڕەپانی شارەکەدا هەموو جۆرە بازرگانییێک هەیە. لە ژێر حوکمی بەگێک بەڕێوەدەچێت، کە دە تا دوانزدە هەزار ئەسپی هەیە و ژمارەیەکی زۆرتریش لە هێزی پیادەی لێیە بە بەراورد بە گەگەکانی تر چونکە زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە کوردن (nomlaS ٨٣٧١، lov. IV، p. ٩٦٢)

٠١  زۆربەی میرەکانیان دوو سێ ڕۆژە ڕێ لە موسڵەوە دوور لە شوێنێک بە ناوی ئامێدی نیشتەجێن، ئەو شارە لێرە قەشەکانی کاپوچینی کۆدەکاتەوە، کە بە ئەرکی موژدەدەری بۆ موسڵ نێردراون، بۆ ماوەی بۆماوەی دوو سێ مانگ لە حەوشە و دیوەخانەکەی دەمێننەوە (erubeF ٣٨٦١، p. ٠٦٢).

20  Kinneir 1818، p. 456. See also Rich 1836، vol. I، chapter X.

نییە، بەڵام بەهۆی زوو هاوسەرگیرییەوە، لەش و لاریان تێکشکاوە و لە گەشەسەندن وەستاوە.»[١]

جۆن کینیر(John Kinneir) باسی دابونەریتی شاری بەتلیس دەکات: شاری بەتلیس پاش چەند ساڵێک دوای لافاوەکە لەلایەن نەوەکانی نوح دامەزرا.»[٢] بەگوێرەی بازرگانە نەناسراوەکەی ڤێنیسیا (Anonymous Merchant of Venice) و دۆمێنیکۆ سێستینی بێت، شاری بەتلیس لەلایەن ئەلیکساندەری گەورە دامەزراوە.[٣]

لە نامەیەکدا، کە مێژووەکەی بۆ ٢٧ی تەمووزی ساڵی١٤٧٣ دەگەڕێتەوە، دیپلۆماسی ڤینیسی کاتێرینۆ زینۆ(Caterino Zeno) باسی ساڵی ١٤٧٢ دەکات، کە نێردرابوو تاکو سەردانی سەرۆکی قەشەکانی بەتلیس بکات، بیست قەڵا و چەندین چیای لێ بوون.[٤] ئەو کات ئوزون حەسەن(Uzün Hasan) ناوێکی گەورە بوو لە وڵاتی فارس، لە تەوریزی پایتەختدا چاوی بە سەفیری دوژمنانی عوسمانی دەکەوت، سەرەتا لە ڤێنیسیا، چاوی بەوانە کەوت کە لەسەر بابەتی سیاسی دەیانووسی، وەک ئەمبرۆجیۆ کۆنتارینی و جیۆسافات باربارۆ(Ambrogio Contarini and Giosaphat Barbaro)، کە لە لایەن کوردەکان لە ٤ی نیسانی ١٤٧٤ هێرشی کرایەسەر.

لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، سەروەت و سامان و دەسەڵاتی ناوچەی بەتلیس، ناو و ناوبانگی خۆی هەبوو، بۆیە پیترۆ دیلاڤالی لەکاتی مانەوەیدا لە قوستەنتینییە (١٦١٥)، لە یاداشتەکەیدا دەڵێت:» پێش چەند ڕۆژێک خانی بەتلیس هاتە ئێرە. شارەکە دەکەوێتە ناوچە شاخاوییەکانی میزۆپۆتامیا و ئاسووری لەسەر سنووری نێوان تورکیا و وڵاتی فارس. دانیشتوان و خەڵکی ئەو ناوچە بە کورد ناسراون، شاری (بەتلیس)یش لە نزیک شاری وانە لە ئەرمینیا، کە ناوچەیەکی دیار و بەرچاوە. لە شەڕەکەیدا لەگەڵ فارسەکان، ئەم میرە دوانزدە هەزار سەربازی ئەسپسواری بۆ گەورەی خۆی ڕەوانەکرد[٥].» بەگوێرەی ژین باپتیستی تاڤێرنیر(Jean-Baptiste Tavernier)، میرەکە دەیتوانی تا بیست و پێنج هەزار سوارە لەگەڵ هێزی پیادەیەکی چاک ڕێک بێخات.[٦]

پاش یەک سەدە، ئەنجیلۆ لیگرێنزی(Angelo Legrenzi) باسی سیناریۆیەکی تەواو

1. Binder 1887، p. 197-198.
2. Kinneir 1818، p. 393. See also the chapter devoted to Bitlis in: van Bruinessen 1992، p. 162-170
3. Anonymous Merchant of Venice 1563-1606، p. 81; Domenico Sestini 1786، p. 136-139.
4. Berchet G. 1865، p. 130-135
5. Della Valle 1667، vol.I، p. 164-165; vol. II، p. 62-63.
6. Tavernier 1682، p. 392.

جیاواز دەکات:» لە شوێنەوار و پاشماوەی چەند پەرستگایەک، دەردەکەوێت پێشتر ئەو شارە لە سەردەمی کریستیانەکان چەندە جوان و ناوازە بووە... [1]»

لە سەرەتاکانی سەدەی ١٩، کینیر(Kinnier) سەرنج دەخاتە سەر پووکانەوەی شارەکە و تێکشکانی قەڵاکە:» خان و بەگی سەردەمی کۆنی بەتلیس، لە کوردستان، لە بەهێزترین میرەکان بوون، هەتاوەکو شەڕ و ململانێی بنەماڵەکان خاپوور و وێرانی کرد. شورا و دیوارەکان لە هەمان بەردی خانووەکان دروستکرابوون، چەپەرەکان نزیکەی سەد پێ بەرز بوون. شارەکە سی مزگەوت و هەشت کەنیسە و چوار حەمام و چەند میوانخانەیەکی لێیە، دانیشتوانی شارەکە بە دوانزدە هەزار کەس دەخەمڵێندرێت، زۆربەیان مسوڵمانن، ئەوانی تریش مەسیحی ئەرمەنین.

بەدەگمەن خەڵکی نەخوێندەوارم بینیوە باشتر لە هونەری ئاو ڕاکێشان شارەزاتر بووبن. هەندێک لە جۆگە ئاوەکان لە دووری پێنج تا شەش میل ڕادەکێشران، چاڵی بچووک لە دەوری گردەکان هەڵکەندرابوون، بە ڕەچاوکردنی هەمان ئاست بەوردی، بەبێ بەکارهێنانی هیچ ئامێرێکی ئەندازەیی. لە بارودۆخی نا ئاساییدا، کورد بە نەژادێکی تورە و کەمتەرخەم و چاونەکراو و دڵرەق دادەنرێت، سروشتێکی دڕ و شەڕانی هەیە، هەر لە سەردەمی زەینەفۆنەوە بگرە تاوەکو ئێستا، خۆ جگە لە گۆڕینی ئاینەکەی، هیچ لە ڕەفتار و کەسێتی نەگۆڕاوە. بەتلیس لەژێر حوکمی بەگێکە لەلایەن پاشای (موش) ە دامەزراوە، ئەگەرچی لە واقیعدا، خانەکانی کورد بەڕێوەی دەبەن، کە نەوە و وەچەی زنجیرەیەکی دورودرێژن لە گەورە و دەرەبەگەکان، بەفەرمی دەسەڵاتدار و خاوەنی ئەو ناوچەیە بوون. وەک تێگەیشتبم، لەو چەند ساڵەی دواییدا، خرابێتە سەر حکومەتی دەوڵەتی عوسمانی و باج و سەرانەی ساڵانەش بدات.[2]»

لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩، جۆن ئوشەر(John Ussher) باسی کۆتایی ئیمارەتی بەتلیس دەکات:» تا ئەو ساڵانەی دوایی، سەرکردە میراتگرەکان حوکمی شاری (بەتلیس) یان دەکرد، ئەگەرچی شەریف بەگ، کە دواهەمین فەرمانڕەوای شارەکە بوو، ڕووبەڕووی دەسەڵاتی باڵای ئەستەنبوڵ بوویەوە، دوای ماوەیەک لە خەبات و تێکۆشان، لەگەڵ چەندین جار سەرکەوتن، ناچار بوو خۆی بەدەستەوە بدات، دواتر لە قوستەنتینییە بەندکرا. ئەو شارەی ماوەکی زۆر حوکمی لێکرد خرایە سەر دیاربەکری دەوڵەتی عوسمانی. بەمجۆرە، دوای هەرەسهێنانی بەدرخان بەگ، بەهێزترین سەرکردەکانی کوردستان ناچاربوون دەستبەرداری دەسەڵات بن، ئەو وڵاتەی کە تەنیا بەشێوەیکی شکلی وەلائی

1. Legrenzi 1705، p. 61-62.
2. Kinneir 1818، p. 394-395.

بۆ قوستەنتینییە دەردەبڕێ، بۆ وڵاتێکی ژێردەستە و بێ شەڕوشۆڕ گۆڕا.[1]»
وەک زۆربەی گەڕیدەکانی تر، جۆن ئوشەر(John Ussher) لە باسی بەتلیسدا دەڵێت: «دەوڵەمەندە بە کانیاو و ئاوی کانزایی، لە درەنگانی هاویندا بەفری چیاکان دەتوێتەوە، لە گەرمای هاویندا پێداویتسییەکی زۆر دابین دەکات، لە ڕێی جۆگەلە و ئاودێری ئاو بۆ ڕەز و باخ وماڵەکان ڕادەکێشرێت، ئەو پارچە زەوییانەی ئاودێرییەکی باش دەکرێن، زۆر بەهەمدار و بە پیتن و بەروبومێکی زۆر چاکیان لێ دەڕوێت.»[2] دەشتە تەختەکان توتنیان لێ دەڕوێندرێت، لێژاییەکانیش ترێی لێ دەڕوێندرێت. هەنگوینی ناوچەکە جۆرێکی سپییە و زۆر بەناوبانگە. سەروەت و سامانی سەرەکی بەتلیس پیشەسازی ڕستن و چنینە.
لەوانەیە باشترین وەسف و تەعریفی بەتلیس لەلایەن ڕێڤ. هۆراتیۆ ساوسگەیت(Rev. Horatio Southgate) کرابێت:» وەک غەریبەیەک کە بۆ یەکەمجار بەتلیس دەبینی، زەحمەتە بتوانی جوانی و دڵگیری بەتلیس لەبەر چاوانت بسڕیتەوە، لە دیمەنە دڵگیرەکەی نێو چیایەکان و بنیاتە جیاواز و ناوازەی کۆشک و خانووەکانی پێچەوانەی زۆربەی شارە ڕۆژهەڵاتییەکانە. ئەو چیایانەی لە باکوور و باشووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا درێژدەبنەوە، سێ دۆڵی قووڵ پێکدەهێنن، لەو شوێنەی پێک دەگەن شارەکە خۆی دەنوێنێ و بەسەر قەد و باڵای هەریەکەیان بڵاو دەبێتەوە. سێ ڕووبار بە یەک ئاڕاستە دەڕۆن، دواتر یەک دەگرن و پێکەوە دەڕژێنە ناو ڕووباری دیجلە، دەڵێن گوایە بیست و چوار سەعات دوورە. کوچە و کۆڵانی شارەکە لەنێو هەیوان و بانجیلەی خانووەکان بە درێژایی بەرزایی و نشێوە سەختی دۆڵەکان درێژدەبنەوە، ئەگەر کەسێک سەیری سەرەوەی خۆی دەکات لە بینینی خانوو و دیوارەکانی سەرەوەی خۆی سەرسام دەبێت. زۆربەی خانووەکان باخچە و حەدیقەی هەڵواسراویان هەیە، ئەوەش وا لە شارەکە دەکات وەک بەهەشتێک خۆی لە نێو چیای ڕووت و بێ سەوزایی بنوێنێت. مزگەوت و خانوو و دیوار و پەرژینی باخچە و باخەکان لە جۆرە بەردێکی چاک بنیاتنراون، کە شارەکە پێیەوە دەوڵەمەندە. بۆ خانوووەکان، بەردەکان بە قاڵبی شەشپاڵوو داتاشراون، ئەمەش کەشێکی عەجیب و پتە و ڕێکوپێک بە شارەکە دەبەخشێت. لە هەندێک کۆشک، دیواری ژوورەوە و دەرەوە لە هەمان بەرد دروستکراون. شەقامەکانی شارەکە خراپن و تێکچوون، ئەگەرچی چاوەڕێی شتێکی باشتری لێ دەکرێ، کاتێک شوێنەکە بە مەوادی باش و هەرزان دەوڵەمەندبێت. بەهۆی پێگەی شارەکە، کوچە و کۆڵانەکان عاسێ و سەخت و دژوارن، هەندێک جار لە سواربوونی وڵاخەکان خەریک بوو لە هەورازەکان

1. Ussher 1865، p. 346.

2. Ussher 1865، p. 346. According to Rassam there are "no less than three kinds of mineral waters" (Rassam 1897، p. 105).

سەرانگریَ ببم. بازاڕەکانی فراوان و داپۆشراو و پڕاوپڕن لە شتومەک، ئەوانیش هەر لە بەرد دروستکراون، لە ناوەوە بازاڕەکە بەپێی جیاوازیی و جۆری بازرگانی و کەلوپەلەوە ڕێکخراوە.

کاری بازرگانی شارەکە لە ڕێی شاری (وان)ەوە لەگەڵ وڵاتی فارس دەکرێت، لە ڕێگەی ئەرزڕۆم و دیاربەکر و موسڵ و بەغدا لۆکەی خاو لە (موسڵ)ەوە هاوردە دەکرێت. جلوبەرگەکان هەر لەو شارە لە لۆکە دروست دەکرێن. بابەتە سەرەکییەکانی تری بازرگانی بریتیین لە خوریی و توتن و مازی. خومخانە و دەباخخانە لە ناوچەکە دا زۆرن. شەراب تەنها بەئەندازەی بەکاربردنی شارەکە دروست دەکرێت، کە بڕی کێشەکەی دەگاتە ٦٠ هۆقە، یا نزیکەی ١٥٠ پاوەند ڕۆژانە. ماسی بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە دەریاچەی وان دەهێنرێت. بنێشت و کەتیرەی عەرەبی بابەتێکی سەرەکیی بازرگانییە، ساڵانە بە بڕی ١٥٠٠٠ هۆقە بەتایبەتی بۆ بازاڕەکان ئەورووپا دەگوازرێتەوە. شارەکە حەوت خانی لێیە، لەوانە دووانیان تایبەتن بۆ بازرگانەکان، بازرگانەکان خاوەنی ٢٠٠ ئەسپی کاروان گواستنەوە بوون، جگەلەوەی ژمارەیەکی زۆریش خاوەنیان لە شوێنی تر هەبوو. نزیکەی ٣٢ چەرخی ئاو هەڵگۆز (ئاشی ئاو)ی هەن، لە نزیک ئەو ڕووبارانەی بەنێو ئەو دۆڵانە ڕێ دەکەن، پردی بەردینیش لەسەریان دروستکراوە.»[١]

هەروەها جیوسیپی کامپانیلی(Giuseppe Campanile) دەڵێت:» بازرگانی کردن بە کۆیلە بازاڕێکی گەرم و گوڕی هەیە. کوڕ و کچ لە جۆرجیا دەڕفێندرێن و دەهێندرێنە ئێرە و لە خانێکدا نمایش دەکرێن. کڕیار کوڕ و کچە کۆیلەکان بە ڕووتی دەبینێت. ئەوان یان (تورک)ن یا (مەسیحی)ین، زۆربەیان مەسیحیین و ئەرمەنین، کەمێکیان کاسۆلیکین.»[٢]

کامپانیلی(Campanile) ژمارەی دانیشتوانی ناوچەکە بە ٥٠٠٠٠ کەس دەخەمڵێنێت، هەرچی ئوشەرە لە یاداشتەکەیدا دەڵێت:» بەلای منەوە دانیشتوانی ناوچەکە ١٤ هەزار یان ١٥ هەزار دەبێت، بەشێکی زۆریان ئەرمەنین و کەمێکیشیان نەستورین.»[٣] دیرۆلی ژمارەی خانووەکان بە

---

1. Southgate 1840، vol. I، p. 220-221.

به پێی تاڤێرنیر بێ، بەتلیس خاوەن سەروەری و سەربەخۆیی خۆیەتی، هەردوو میر و سەرداری حەلەب و تۆرۆس پەیوەندییەکی دۆستانەیان لەگەڵ میری بەتلیس هەیە، چونکە لەوە دەترسن پەیوەندی بازرگانی لە نێوان هەر دوو شارد بپچڕێنێت (093 .p ،2861 reinrevaT). ئەم زانیارییە لە ڕێگای سالمۆن (Salmon ١٧٣٨، vol. IV، p. ٢٧٠.) بڵاوکراوەتەوە. بە گوێرەی ڕەسام، زۆربەی خاووەکانی شارەکە لە بەردی پتەو و توند دروست کراون، خانووەکان لە بەردی چوارگۆشە دروست کروان و وەک قەڵایەکی پۆلاین وایە (501 .p ،7981 mas saR).

2. Campanile 1818، p. 5-7
3. Ussher 1865، p. 346.

٤ هەزار خانوو مەزەندە دەكات١. لەكۆتایی سەدەی ١٩، لو ستی دو چۆلیت (Le Cte de Cholet) ئاماژە بە كۆچی ئەرمەنییەكان دەكات لە بەتلیس و وان و ئەرزڕۆم بۆ ڕووسیا بەهۆی چەوساندنەوەی كوردەكان، ئەمەش زەرەرێكی ئابووری گەورەیە بۆ ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی.٢

لیڤێڤری(Lefevre) بە گەشبینییەوە باسی دیاربەكر دەكات (ناوە كۆنەكەی ئامەدە)، بەگوتەی ئەو بێت، ساڵی ١٧٥٦ پڕ دانیشتوانترین شار بووە لە ئیمپرتۆرییەتی عوسمانی، ژمارەی دانیشتوانەكەی ٤٠٠ هەزار كەس دەبێت. ساڵێك دوای ئەوە كوللە لە بەروبومی ناوچەكە دەدات، برسێتی و قاتی و تاعون ٣٠٠ هەزار كەس دەكوژێت. لە كۆتایی سەدەی ١٨، ژمارەی دانیشتوانی شارەكە لە ٥٠ هەزار كەس تێنەدەپەڕی. هەر سی چل ساڵ جارێك تاعون و درم زۆری بۆ ئەو شارە دەهێنا، لە باتی ئەوە كوردەكان لە ناوچە شاخاوییەكان دەژیان، هیچ پەیوەندییەكیان لەگەڵ ئەو توركانەدا نەبوو، بۆیە پەتاكەی كاری نەدەكردە سەریان.٣ ئەگینا دۆمێنیكۆ لانزا(Domenico Lanza) ساڵی ١٧٥٣ ئاماژە بەوە دەدات گوایە دەڵێن ژمارەی دانیشتوانەكەی ٢٠٠ هەزار كەس دەبێت، بەڵام بەپێی خەمڵاندنەكانی ئەو بێت ژمارەی دانیشتوانەكەی لە ١٠٠ هەزار كەس ڕەت نابێت، لەو ژمارەیەش ١٢ هەزار كەسیان مەسیحیین. ٤ نەیبۆهر ژمارەی خانوووەكان لە دیاربەكر بە ١٦٠٠٠ هەزار خانوو مەزەندە دەكات، یەك لەسەر چواری خانووەكانیش هی مەسیحییەكانن.٥

لە سەرەتای سەدەی ١٩، جیوسیپی كامپانیلی ژمارەی دانیشتوانی دیاربەكر بە ٥٠٠٠٠ كەس دیاری دەكات، لەوانە ٣٠٠٠٠ یان توركن، ٢٠ هەزاریشیان مەسیحیین، ئەوانی تریشیان جولەكەن٦. لە هەمان سەردەمدا، ویلیەم هیودە(William Heude) ژمارەی خەڵكی ناوچەكە بە ٥٥٠٠٠ كەس دادە دەنێت٧. لە ناوەڕاستی ئەو سەدەیەدا، كاپتن دو بیانچی(De Bianchi) دانیشتوانەكە بە ٦٠٠٠٠ كەس مەزەندە دەكات.٨ بەگوێرەی ڕاپۆرتێكی ج. كارلیلی ماككۆان(J. Carlile McCoan) بێت، كە لە ساڵی ١٨٧٩

---

1. Deyrolle 1877، p. 154
2. Cholet 1892، p. 205.
3. 60 - Lefebvre 1799، vol. II، p. 333-337.
4. Lanza manuscript، Lib. I، c. IX.
5. Niebuhr 1776-1780، vol.11، p. 326.
6. Campanile 1818، p. 64.
7. Heude 1819، p. 234.
8. De Bianchi 1863، p. 173.

بڵاوکراوەتەوە، نزیکەی ٤٠٠٠٠ کەس لەوێ دەژین.١ شارەکە دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە، لە ناوەڕاستی سەدەی ١٨، لانزا(Lanza) لە یاداشتێکدا دەڵێت: هەموو خانووەکان لە بەرد دروستکراون جگە لە بانجیلە و هەیوانەکان نەبێت. خانووەکان شێوەیان نزمە، حەمامی گشتی لە شارەکەدا هەن، کانی و کارێز لەسەر شەقامەکان زۆرن. لە پیشەسازی قوماشی ڕەنگ ئەرخەوانی شارەکە بەناوبانگە، لەم ڕووەوە هیچ شارێکی تر شان لە شانی نادات.٢ ژین باپتیستی تاڤەرنیر ئاماژە بەوە دەکات، کە یەک لەسەر سێی دانیشتوانی ناوچەکە بە کاری پیشەسازی ڕستن و چنین سەرقاڵن، ڕێژەی دانیشتوانیش لە ئاستێکی بەرزدایە. بیست هەزار مەسیحی لێ نیشتەجێیە، دوو لەسەر سێی ئەوانە ئەرمەنین، ئەوانی تر نەستوری و یاقوبین. میر دەیتوانی بیست هەزار سوار و یەکەیەکی بچووکی هێزی پیادە ئامادە بکات.٣ سالمۆن(Salmon) لە ڕاپۆتێکدا دەڵێت ئافرەت لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی عادەتەن بە کۆیلە حیسابی لەگەڵ دەکرا، ئەگەرچی لێرە ئازادیی و سەربەستی ڕۆیشتن و قسەکردنی لەگەڵ ئافرەتانی تری مەسیحی هەبوو.٤

مۆڵتکە لە وەسفی ئامەدا دەڵێت: ئامەد قەلایەکی گرنگ و بەناوبانگ بوو، هەمیشە چەقی ململانێی نێوان ڕۆمان و فارسەکان بووە. دیوارە مەڕ مەڕییە ڕەشەکانی شارەکە شورایەکی پۆلاین و بەرگریی بوون، دیوارەکە زۆر نەخشی هەڵکۆڵدراوی بە زمانی لاتین و یۆنانی و فارسی لەسەر هەبوون. تاوەرەکان بە مەودای هەشتا شەقام لەیەکتر

---

٠١ McCoan ١٧٨٩، vol. I، p. ٦٨ جۆن ئوشەر دەڵێت: « دەڵێن وەختی خۆی پێش دوو سەدە،ژمارەی دانیشتوانی ئەو شارە لە ١٥٠،٠٠٠ کەس کەمتر نە بوو، بەڵام ژمارەی دانیشتوانەکەی ئەوەندە بە خێرایی کەمی کرد، ئێستا یەک لەسەر پێنجی ئەو ژمارەی پێشووی لێ نیشتەجێیە. نزیکەی ٥٠٠٠ کەس لە دانیشتوانەکەی مەسیحیی و نەستۆری و ئەرمەن و کلدان بوون، هەم پێشتر هەمیش ئێستا لە ژێر بارودۆخێکی ناخۆش گوزەرانیان دەکرد، بەهۆی دانیشتوانە موسڵمانە توندڕەوەکەی (Ussher ١٨٦٥، p. ٣٦٥). ئەو بارودۆخە زۆر جیاوازە لەو هەڵومەرجەی چیلۆت لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩، باسی دەکات: « دانیشتوانی دیاربەکر پێکهاتەی ئایینی و ئیتنیکی جیاوازی تێدایە، وەکو کاسۆلیکی لاتینی و ئەرمەنی و کلدانی و سریانی و ئەرمەنی ئرتۆدۆکس و موسڵمان، ئەوانە هەموویان خاوەن پەرستگای خۆیان بوون. بەشی سەرەکی شارەکە کە لە بازرگان و سەرمایەدارەکان پێکهاتبوون، لە ئەرمەنە ئۆتۆدۆکسەکان بوون، زۆریش بە ئایین پابەند بوون. سوپاسگوزاری لێبوردەیی و ئیدارەی والی ئێستا دەکەین، کە هیچ سنوورێک لەبەردەم ئازادییە ئایینیەکانی شارەکە دانانێت.» (Cholet ١٨٩٢، p. ٢٥٤-٢٥٥) Figures from ١٥١٨ to ١٨٧٨ on the population of the city of Diyarbakir are reported by van Bruinessen. See Evliya Çelebi ١٩٨٨، p. ٣٣.

2. Lanza manuscript، Lib. I، c. IX. It is also reported by Thomas Bois 1965، p. 270 271

3. Tavernier 1682، p. 388-389.

4. Salmon 1738، vol. VI، p. 279.

دوور دروستکرابوون، جێگای تۆپهاوێژیشیان تێدا دەبۆوە. قەڵا قایم و پتەوەکان تەواو جیاواز بوون لەگەڵ ئەو ١٥٠٠٠ کۆڵیتە شڕوپڕەی لە دەوروبەری مزگەوت و میوانخانە و خانەکاندا هەبوون.١ زۆربەی مزگەوتەکان پێشتر کەنیسەی کۆنی مەسیحییەکان بوون.٢ مولازم والپۆل (Lieutenant Walpole) زیاتر لە ڕووی سەربازییەوە باسی ناوچەکە دەکات:» دیاربەکر بە شورای بەرزی مەرمەڕی ڕەش دەورەدراوە، کە لەوانەیە بارودۆخی ناتەندروستی بەزۆری بەهۆی ئەوەوە بێت. بەهۆی ئەو تاوەرانەی بەدرێژایی قەڵاکە جێگیر کراون، شورە و دیواری قەڵاکە زیاتر تۆکمە و توندوتۆڵ کراوە. یەک دووانێکیان زۆر گەورەن، سپێری سەرقەڵایان پێدا هەڵواسراوە، لە نزیک ئەو دەروازەی پێیدا چوینە ژوورەوە، چەند دارتویەکی گەورەی لێ بوون، لەژێر سێبەری هەریەک لەو دارانە، بێکارەکان کۆببونەوە، جگەرەیان دەکێشا و قاوە و شەربەتی پڕ لە بەفراویان دەخواردەوە. ڕێک لەناو دەروازەکە، گومەزێک بەدیدەکرێت، لەژێرییەوە هەندێک مسوڵمانی شەهید کراوی ئەو شەڕانەی لەگەڵ مەسیحییەکان کراون، نێژراون. کوچە و کۆڵانی شارەکە لە شارە ڕۆژهەڵاتییەکانی تر پیس و پۆخڵ و وێرانتر بوون.»٣

ئەمەش تەواو پێچەوانەی ئەو دیمەنەیە کە دو بیانچی(De Bianchi) وەسفی دەکات: « شارێک بە باشترین شێوە لە تەواوی ئیمپراتۆییەتەکە دروستکراوە: شەقامەکانی فراوانن، بازاڕەکانی گەورە و فراوانن، شوێنی کۆنسوڵخانەی ئینگلیزە.»٤

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە:» وەک هەر شارێکی تری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، دیاربەکر لە بارودۆخی پوکانەوە و فەوتاندا بوو... ئەو شارە مۆدێرنە تەنیا یەک لەسەر سێی ئەو شوێنەی لەنێو سنووری دیوارەکانی ڕۆماندابوون دەیگرتەوە. ئێوارەکەی پیاسەیەکمان بەنێو بازاڕ و ڕاڕەو و کۆڵانە خوار و خێچەکانی و کەلاوە و پاشماوەی خانووە کۆنەکاندا کرد. لێرەو لەوێ هەندێک باخچە و باخ مابوونەوە، کە شوێنەواری شارە پێشکەوتوو و بە شورەتەکەی دیاربەکر بوون. شورای ڕۆمانەکان لە بارودۆخێکی قایم و پارێزراودا بوون، زۆر بەزەقی پێچەوانەی خراپی هەلومەرجی ناوەوەی قەڵاکە بوون. تاوەری گەورە و زەخم بە دوورییەکی یەکسان لە یەکتر بنیاتنرابوون، چەپەر و شورەکان هێندە ئەستوور بوون، لە نۆ تا دە پێ ئەستوور تر بوون، لەناویاندا زنجیرەیەک

---

1. von Moltke 1878، p. 203.
2. Heude 1819، p. 234.
3. Walpole 1851، vol. 1، p. 365.

٠٤ ٦٠،٠٠٠ کەس لەو شارە دا نیشتەجێیە، بە یەکێک لە باشترین شارەکانی ناو ئیمپراتۆرییەت دادەنرێت، جادە و بان و شەقامەکانی فران و گەورەن، بازاڕێکی هەمەچەشنی لێیە، شوێنی نیشتەجێبوونی کۆنسوڵەکانە (ihcnaiB eD ،٣٦٨١ P. ٣٧١)

ڕێڕەو و ژوور جێگایان کرابۆوە.»١

لە کۆتایی سەدەی نۆزدە، فوئاد بەگ موزەفەر زایکۆوسکی(Fuad Bey Mouzaffer Czaykowski)، بە ڕەچەڵەک پۆڵەندی، پشکنەری سەربازی کێڵگەی بەخێوکردنی ئەسپ لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، بەمشێوە باسی شوێنەکە دەکات:» کۆشک و باڵەخانەی ئایینی لە دیاربەکر زۆر و هەمەجۆرن، نزیکەی ٢٨ مزگەوت و ٥ تەکیە و دێر و ٦ بارەگای قەشە و ١٢ کەنیسەی سەر بە تقوسی جیاواز و بازاڕێکی قەیسەری لێیە. ئەوەی بەڕاستی سەرنجی ڕاکێشام، ٤٣٠ ژمارەی ئەو کارێز و کانیاوانە بوو، کە ئاویان بۆ شارەکە دەگواستەوە، زۆربەیان زۆر کۆن بوون، هەیان بوو بەژێر خانووەکاندا تێدەپەڕی.»٢

ئەربیل (ناوە دێرینەکەی ئەربێلا، ناوە کوردییەکەشی هەولێر) بەکۆنترین شار لە جیهاندا دادەنرێت، کە تائێستا ژیانی تێدا بەردەوام بێت.٣ جیوسیپی کامپانیلی(Giuseppe Campanile) زۆر بەجوانی وێنای شارەکە دەکات:» ئەربیل، بەناوبانگترین شاری دێرینە لە مێژوودا، لە کۆندا ئەربێلا بووە. بەشوێنی تێکشانی داریۆش لەسەر دەستی ئەلیکساندەری گەورە ناسراوە.٤ شارێکی جوان و ئاسوودە و فراوانە، لە قەڵا و دەشت پێکدێت. قەڵا لە بارێکی خراپدایە. چەند زەڕەنگەرێکی لێن، ئەوانیش ڕاستگۆ و دەستپاک نین. چەندین کارگەی دروستکرنی نەعل و پێڵاوی لێیە. لە ناوەڕاستی کانیاوێک هەڵدەقوڵێت، کار بە ئاشەکە دەکات، دواتر دەڕژێتە نێو دەشتەکە. چەند بازرگانێکی دەوڵەمەنی لێیە، خاوەن دوکانی قوماش و لۆکە و شتومەکی ترن. شارێکی زۆر دەوڵەمەند نییە. دەشت و دەری بە پیتی لێیە، بەڵام کشتوکاڵی تێدا نەکراوە، ئەگەرچی ئاوی چەند کانیاوێکیشی پێدا تێپەڕ دەبێت.

موتەسەلیمێکی لێیە، سەر بە وەزیری بەغدادە، پێشتر لەژێر دەستی پاشای بابانەکان بوو، سەر بە سلێمانی بوو. قەڵاکە نزیکەی ٥ هەزار کەسی تێدا نیشتە جێیە و،

---

1. Ussher 1865، p. 364-365.
2. Czaykowski 1898، p. 172.

٠٣ enanniK ١٩٦٤، p. ٧. هەولێر لە مێژووی ئیسلامییدا لەسەدەی ٢١ و ٣١ ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە، بەتایبەتی لەسەردەمی حوکمی ئەتابەگ. سەیری (Munshin Muhammad Husayn ١٩٧٦.)( eeS also Rich ١٨٣٦، vol. II، chapter XII.) بکە.

٠٤ ئەنگیلۆ لیگرێنزی باسی هەولێر دەکات، کاتێک باسی بەخشندەیی ئەلیکساندەری کەزن دەکات بەرامبەر سەربازانی بەدیلگیراوی داریۆش لە ژێر دەستی سوپای یۆنانی دا (Legrenzi ١٧٠٥، p. ٩٦–٧٠) سالمۆن هیچ زانیارییێکی تری گرنگ باس ناکات، زانیارییەکان پەیوەستن بە قەڵایەکی دارماو و سەرکەوتنی ئەلیکساندەر (Salmon ١٧٣٨، vol. IV، p. ٩٦٢).

کورتەکییەکان(kortakien)یش ژمارەیان ١٥ هەزار کەسێک دەبێت، ناوچەی دەسەڵاتیان بچووکە، لە زێی گەورەوە تاوەکو عەنکاوەیە، کە گوندێکی مەسیحی کلدانی کاسۆلیکەکانە. لە ڕووبارەوە تا عەنکاوە نۆ سەعات دوورە. هاوسنورە لەگەڵ ئەو ناوچەیەی کوردستان، کە بە سۆران ناسراوە. زمانەکەیان کوردیی و تورکێکی شڕوپڕە. ژمارەی چەکدارانی لە ٧٠٠ کەس تێپەڕ ناکات.»١

بەگوێرەی ڤیتاڵ کیونیت(Vital Cuinet) بێت، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە، ژمارەی دانیشتوانی هەولێر ١١٦٠٠ مسوڵمان و ٤٠٠ جولەکە بووە.٢ بە لای هیودە(Heude) هەولێر:» شارێکی پیس و پۆخڵ و بێ خزمەتە، قەڵایەکی ڕووخاو لە ناوەڕاستی دەشتایی، لەسەر گردێکی دەستکرد بنیاتنراوە. لەبەر چاوان لە پارچەیەک وێرانە و کەلاوە دەچێ، کە پێشتر لە دۆخێکی قایم و توند و تەواودا بووە. دانیشتوانەکەی کورد و عەرەب و مەسیحی و تورک و جولەکە و یەزیدین. بە پیشەسازی دروستکردنی بەتانی و پێخەفی ئەستور و قورس ناسراوە، بەشێوەیەکی وا دروست دەکرێن، بەرگەی شێ و تەڕی بگرن.»٣ بەپێی گ. ئ. ئۆلیڤەر(G.A Olivier) بێت، دانیشتوانی شارەکە تا دوو هەزار کەس دەبوو، کە زۆربەیان لە کورد و کلدانی بوون.»٤

هەروەک لە پێشەکییەکە باسمان کرد، مارکۆ پۆلۆ(Marco Polo) دەڵێت شاری ماردین: « برێکی باش لۆکەی لێ بەرهەم دێت، چەندین پیشەسازی کوتاڵی لۆکەی لێیە. دانیشتوانی شارەکە سنعەتکار و بازرگانن، شوێنکەوتەی پاشای تەتەرن.» ٥ ئیبن بەتوتەش(Ibn Battuta) دەڵێت:» شارێکی بەرفراوان و گەورەیە، دەکەوێتە سەر قەدباڵی چیایەک، جوانترین و بەهێزترین شاری جیهانی ئیسلامییە، خاوەن جوانترین و دڵڕفێنرتین شوێنە. لەو شارە قوماشێک دەچنن، کە شارەکە پێی بەناوبانگە، ئەو قوماشە لە خورییەک دروست دەکرێت، کە بە مەرەزە ناسراوە. قەڵایەکی زۆر بەرز لەو شارە هەیە، بەدیارترین قەڵاکانی ناوچەکە دادەنرێت، دەکەوێتە سەر لوتکەی چیایەکە.»٦

پاش دوو سەدە هەمان وەسف لەلایەن بازرگانە نە ناسراوەکەی ڤینیسیا دەکرێت (Anonymous Merchant of Venice):» شارە مەزنەکەی ماردین ڕووبەرەکەی

1. .” (Campanile 1818 P. 66-67)
2. Cuinet 1890-1895، t. II، p. 857.
3. Heude 1819، p. 214.
4. (Olivier 1801-vol. II، p. 372). See also Rich 1836، appendix I. “Observations at Arbil”، p. 293 and appendix “Notes on the Battle of Arbela”، p. 299. Names of some writers born in quoted by Herbelot 1697، p. 114، see “Arbel».
5. Polo 1958، P. 51
6. Ibn Battuta 1990، vol. I، p. 466

چوار یان پێنج میل دەبێت، لەسەر چیایەکی زۆر بەرز بنیاتنراوە، لەسەر ئەو شاخە قەڵایەکە هەیە، بەسەر شارەکەدا دەڕوانێت، زۆر زەحمەتە بتوانیت لێرە تیروکەوان بهاوێژی. چێوەی بازنەکەی یەک میل دەبێت. ئەگەر لە ژێرەوە سەیری قەڵاکە بکەیت، ترس داتدەگرێت، لە ترسی ئەوەی نەبادا بەرد و تاشەبەردەکانی قەڵاکە بەسەرتدا بکەونە خوارەوە. ئەم شارە بە شورای سەخت و قایم دەورەدراوە، وەک پێشتر باسم کرد، دەکەوێتە سەر لووتکەی چیایەکی بەرز، لەوێش مزگەوت و کۆشکی جوان و سەرنجڕاکێش هەن. شوێنەکە زۆر دەوڵەمەند نییە بە ئاو، چونکە لەو ناوچەدا ئاوی کانیاوەکان سوێر و کەمە. بەبێ ئەمە بە دڵگیرترین شار هەژمار دەکرێت لە دیاربەکر، چونکە کەشوهەوایەکی خۆش و گونجاوی هەیە.»١

ژین باپتیستی تاڤەرنیر(Tavernier) هەمان سیناریۆ دەگێڕێتەوە: بە بیری دێتەوە یەکەم خێزانی پیترۆ دێلاڤالی، مانیی ئاشووری (Assyrian Maani) لە ماردین لەدایکبووە.٢ ئەلیساندرۆ دو بیانچی(Alessandro De Bianchi) ئاماژە بەوە دەکات، دەڵێ هیچ ناوچەیەکی تری دەوڵەتی عوسمانی هێندەی ئەو ناوچەیە ئایینی جیاواز و فرە بیروباوەڕی بەئاشتی پێکەوە نەژیاون:» هیچ میللەتێک هێندەی ئەو خەڵکە نە خوێندەوارەی ئێرە هۆشیاری ئازادی بە پیرۆز نەزانیوە، زۆر لە نەتەوە شارییەکان ئەو غیرەتەیان نەبووە دانی پیدا بنێن. شارەکە بەشێوەی تەختاییەکی دەورەدراو بە لێژگە دروستکراوە، بۆئەوەی پێکهاتە جیاوازەکانی شارەکە پێکەوە بژین. ئەمجۆرە ئەندازە لە بنیاتنانی شار، هەلومەرجی ڕەنگاوڕەنگی و فرەجۆری دانیشتوانەکە پێکهاتەی تەواو و گونجاون تا ماردین بە شارێکی زۆر تایبەت حساب بکرێت. لە ڕوانگەی مێژووییەوە، بە قەڵایەکی سەخت دادەنرێت، چونکە هەرگیز داگیر نەکراوە.»٣

دۆمێنیکۆ لانزا(Domenico Lanza) دانیشتوانی شارەکە بە نزیکەیی ٢٠٠٠٠ کەس دەخەمڵێنێت، لەوانە ٣٠٠٠ هەزار کەسیان مەسیحین، تاڕادەیەک هەموویان کاسۆلیکن، کەمێکیشیان یاقوبین.٤ ویلیەم هیودە(William Heude) هەمان هەڵسەنگاندن دەکات: « دانیشتوانەکە لە مەسیحی و کاسۆلیک و نەستۆریی و ئەرمەنی و تورک وعەرەب

---

١. (Anonymous Merchant of Venice ١٥٦٣-١٦٠٦، p. ٧٩b) هەروەها سەیری (Domenico Sestini ١٧٨٦، p. ١١٤) بکە، هێربیلۆت باسی کۆمەڵێک نوسەر دەکات، کە لە ماردین لە دایک بووینە (Herbelot ١٦٩٧، p. ٥٦٤.) مێژوویێکی چڕوپڕی شارەکە و کۆمەڵێک نووسەری دێرین لە لایەن (von Hammer-Purgstall ١٨٢٨-١٨٣١، vol. VIII، p. ٤٢٩-٤٤٠.) نوسراوە.

2. Tavernier 1682، p. 252.

3. (De Bianchi 1863، p. 172).

4. Lanza manuscript، Lib. I، c. IX; it is also reported by Bois 1965، p. 271.

و جولەکە و هەندێک بنەماڵەی پارسی پێکدێن، ژمارەکەشیان زیاتر لە ٢٠٠٠٠ کەس دەبێت. دەڵێن مسوڵمانەکان لە دوو هەزار خانوو و نیشتەجێن و، مەسیحییەکانیش لە هەزار خانوو نیشتەجێن، کە سەر بە تایەفەی جیاوازن.»١ لە کۆتایی سەدەی ١٨، ئۆلیڤەر(Olivier) دەڵێت:» نزیکەی ٣٠٠٠ کوردی تێدا نیشتەجێیە، پێنج شەش هەزار عەرەب و تورک و پانزدە هەزار ئەرمەنی یاقوبی و، بە هەمان ژمارەش نەستورییەکانی لێیە، کە خاوەن قەشەی خۆیانن. نزیکەی بیست خێزانی جولەکەی لێ نیشتەجێیە.»٢ بەگوێرەی جیوسیپی کامپانیلی (Giuseppe Campanile) بێت، دانیشتوانی ناوچەکە تۆزێک لە ٤٠٠٠٠ کەس زیاترن، لەوانە پێنج هەزاریان مەسیحین، لەگەڵ ٣٠٠ کاسۆلیک.٣ لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٩، ماککۆوان ئاماژە بە دانیشتوانەکەی دەکات:» دانیشتوانی ناوچەکە خۆی لە ١٥٠٠٠ کەس نزیک دەکاتەوە، نیوەی زیاتریان مسوڵمانن، ئەوانی دیکە مەسیحیین (کەمێکیش جولەکەن)، سەر بە چوار پێنج تایەفەی جیاوازن.»٤

ئۆلیڤەر(Olivier) بە باشترین شێوە دۆخی ئابووری شاری ماردین وێنا دەکات:» هەندێک دار مێو و فستەقی لێیە، برێکی زۆر داری بادەم و گێلاس و ئاڵوباڵو و هەڵوژە و قۆخ و سێو و میوەی تری ئەورووپی لێ دەڕوێندرێت. ئەگەرچی ئەم ناوچە بەهۆی هەڵکەوتە بەرزەکەی لە زستاندا زۆر ساردە، بەڵام لە هاویندا زۆر گەرمە بەتایبەتی لە بناری چیاکە. لۆکە و کونجیش لەو شوێنە دەڕوێندرێت، تاڕادەیەکی باشیش گەنم و جۆی لێ دەدوورێتەوە.»٥

کامپانیلی دەڵێت: زەیتی زەیتون و هەڵوژەی وشککراو بۆ هەموو ناوچەکانی ژێری دەستی دەوڵەتی عوسمانی دەنێردرێت. بەگوێرەی عورف و عادەتەکان بێت، لەسەر لوتکەی چیایەکی بچووک، نزیک ئەو لوتکەیەی قەڵاکەی لێ بنیاتنراوە، پێغەمبەر ئیلیا بە گالیسکەیەکی ئاگری ڕەوانەی ئاسمان کراوە.»٦

شارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان کەمتر لەلایەن گەڕیدەکانەوە باس کراون. لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٩، جەیمس ب. فریزەر باسی سەنەندج (ناوە کوردییەکی سنە)ی پایتەختی میرنشینی ئەردەڵان دەکات:» کوردستان وەک قسەی لێ دەکەن هەرگیز بە تەواوی

---

1. Heude 1819، p. 63.
2. Olivier 1801-1807، vol. II، p. 343.
3. Campanile 1818، p. 62. Mardin’s province counted eight hundred among them twelve of Christians (Armenians and Siri) except one catholic Armeni (Id.، p. 61).
4. McCoan 1879، vol. 1 P. 85
5. Olivier 1801-1807، vol. II، p. 343-344.
6. (Campanile 1818، p. 61-62).

نەکەوتووەتە ژێردەستی وڵاتی فارس، چونکە هەرچەندە هێز یان سیاسەت لەوانەیە وای لە هەندێک سەرۆک عەشیرەت کردبێت سەربە میرێک یان خێزانێکی دەسەڵاتداری تایبەت بووبن، بەڵام عەشیرەت و هۆزە شەڕکەرەکانی، زۆربەی کات سەربەستی و سەربەخۆیی خۆیان پاراستووە. لەو سەرکردانەی خۆیان بە شوێنکەوتەی پاشای فارسەکان دادەنێن، میری ئەردەڵانە، کە بە یەکێک لە بەهێزترین میرەکانی ناوچەکە دادەنرێت. سنە، شارێکی دڵگیر و پێشکەوتووە، دەکەوێتە ناو دۆڵێکی قووڵ و، پڕاو پڕ لە ڕەز و باخ، هەروەها لێرە لە کۆشکێکی گرانبەها و بەنرخ لەسەر گردێکی ناوەڕاستی شارەکە، والی شارەکە لە بارودۆخێکی شاهانەدا دەژی، ئەگەرچی دەسەڵاتی پیاوسالاری پیادە دەکات. پیاوێکی لێزان و خاوەن عەقڵییەتێکی لیبڕاڵ و میواندۆست و خۆشەویستە.»١

گەڕیدەکە لە یاداشتەکەیدا دەڵێت:» والی ئەردەڵان لە شوێنێکی شاهانە لە شاری سنە خاوەنی دیوەخانێکە، خاوەن دەسەڵاتێکی سەربازی گەورەیە.»٢

جۆرج ن. کورزۆن(George N. Curzon) لە کۆتایی سەدەی ١٩، لە باسی سنەدا دەڵێت:» ساوجبولاق ( ناوە کوردییەکەی ساوجبولاقە، لەڕاستیدا پێی دەگوترێت مەهاباد) ژمارەی دانیشتوانەکەی ١٥٠٠٠ هەزار کەس دەبێت، پایتەختی خۆجێی کوردەکانی ئازەربایجانە. پارێزگارێکی کورد حوکمی ناوچەکە دەکات (سەربە پارێزگاری گشتی تەورێزە)، ئەوەی ئێستا ئەو پۆستە بەڕێوەدەبات، ناوی سەیفەددین خانە(Saif-ed-Din Khan)، مرۆڤێکی ڕۆشنبیرە، زانیارییەکی باشی لە زمانی فەرەنسی هەیە. میرنشینی ئەردەڵان یان پارێزگای کوردستان دەکەوێتە نێوان هەردوو پارێزگای ئازربایجان و کرمانشاه، زۆربەی زۆری دانیشتوانەکەی کوردی نا کۆچەریین، پایتەختەکەی شاری سنەیە، دەکەوێتە نێو دۆڵێکی کراوەی کشتوکاڵکراو. پارێزگاری ئێستای شاری سنە میرزا فەرهاد ناوێکە، کە ئامۆزای شایە، خاوەن کۆشکێکی گەورەیە، لەسەر گردێکی ناوەڕاستی شار. لێرە دوو کەتیبەی سەربازی کوردیی جێگیر کراون، ژمارەیان ٨٠٠ کەسێک دەبێت، لەگەڵ بنکەیەکی تۆپهاوێژ. تەنیا لەو سەردەمەی ئێستادا، پارێزگاکە بەتەواوی سەربە دەسەڵاتی مەرکەزییە. چەند سەدەیەک پێش ئێستا، سەرکردە سەربەخۆکانی عەشیرەتی گۆران لە بنەماڵەی ئەردەڵانەکان حوکمی ئەو ناوچەیان دەکرد، کە خۆیان بە نەوەی سەڵاحەدین دادەنا و، نازناوی والی ئەردەڵانیان لەخۆنابوو. کاتێک، ڕیچ سەردانی ئێرە دەکات (١٨٢٠)، والی، دەسەڵاتێکی تەواو سەربەخۆیی لە تاران هەبوو، وەک پاشا هەرێمەکەی خۆی بەڕێوەدەبرد. هەرچەندە لەکاتی مردنی وەک دواهەمین

1. Fraser 1833، p. 49-50.
2. Id. 1833، p. 273

پیاوی بنەماڵەکە بەر لە ٣٠ ساڵ، شاه هەموو ئەو خزم و کەسانەی وەکو میراتگر مابوونەوە، لە حوکمکردن و میراتی بێبەری کردن، خانەوادەکەی بچووک کردەوە و، لە ڕێگەی دەستنیشانکردنی مامی وەک پارێزگار سەروەریی و دەسەڵاتی خۆی بۆ ناوچەکە گەڕاندەوە.»١

بەدرێژایی سەدەی ١٩، گەڕیدە ئەورووپییەکان زۆر بە گەرموگوڕی وەسفی سولەیمانییە (ناوە کوردییەکەی سلێمانی یە) دەکەن.٢ دۆمێنیکان جیوسیپی کامپانیلی لە یاداشتەکەیدا دەنوسێت:» فراوانترین و بەهێزترین و جوانترین میرنشین لە کوردستان، میرنشینی بابانە. میری ئەو میرنشینە نازناوی پاشای لە خۆناوە، دەسەڵاتی بەسەر دوو ناوچەدا دەشکێتەوە، بابان، ئەو شوێنەی لێی دەژی، قەڵاچۆلان، ئەو شوێنەی حوکمی لێ دەکات. زەویوزاری ئەو ناوچەیە لە بە پیترین و پڕ کشتوکاڵترین زەوییەکانن، ئەگەر لەگەڵ ناوچەکانی تری کوردستان بەراورد بکرێت.

دانیشتوانی ئەو شارە خاوێن و تەندروست و چالاک و خورت و دڵخۆش و بەکەیفن. یەکێک لە عادەتەکانی خەڵکی ئەو شارە، خواردنی چوار ژەم نانە لە ڕۆژێکدا. خاوەن بە هێزترین و ئازاترین و چاونەترس ترین میللەتە، کە کوردستان شانازی پێوە بکات.»٣

دۆمێنیکان(The Domenican) باسی شێوازی دروستبوونی شارەکە دەکات، شارەکە ساڵی ١٧٨٩ لەلایەن ئیبراهیم پاشا وەک ڕێزیک بۆ سلێمان پاشای وەزیر لە بەغدا دامەزراوە. دۆمێنیکان تیشک دەخاتە سەر شارەکە و دەڵێت:» شەقامە سەرەکییەکانی شارەکە دەکەونە نێو دۆڵەکە. شارێکی زیندووە، بازرگانییەکی گەرموگوڕی لێدەکرێ. من ساڵی ١٨١٠ لەوێ بووم. دانیشتوانەکەی بە ١٥٠٠٠ کەس مەزەندە دەکرێت، شارێکی نوێ و هاوچەرخ، بە ڕەچاوکردنی بارودۆخی هاتوچۆ، لە پێگەیەکی گونجاو و لەبار دادەمەزرێت. دانیشتوانەکەی ساڵ بە ساڵ ڕوو لە زیادبوونە، لەو دانیشتوانە، ٨٠٠ کەسیان جولەکەن، ١٠٠ کەسیشیان مەسیحیین، بەبێ ئەوەی خاوەن کەنیسەی خۆیان بن، لەوێ ژیان دەبەنە سەر.»٤

چیڤالیر تینکۆ مارتینوس لیکلاما نیژیهۆلت(Chevalier Tinco Martinus Lycklama a Nijeholt) ڕایەکی تەواو جیاواز دەردەبڕێت:» سەرەڕای ئەوەی نازناوی

1. Curzon 1892، vol. I، p. 556. See also the bibliography mentioned in the North-West Provinces"، vol. I، p. 570; and chapters VII and IX dedicated Vali of Sinna، vol. I. See Rich 1836، vol. I، chapters VII and IX.

2. See van Bruinessen 1992، p. 171-173 on "Baban"; Rich 1836، vol. I، chapters IV، XI، and appendix I; vol. II، chapter XII.

3. Campanile 1818، p. 44،45

4. Campanile 1818، P. 51

پایەختی کوردستانی وەرگرتووە، بەڵام بە بەراورد بە شاری سنە، شاری سلێمانی زیاتر لە قەراغ شار دەچێت نەوەکو شار، دەکەوێتە دۆڵێکی تەخت و وشک، بەهۆی دوو گەلییەوە جوداکراوەتەوە، زۆربەی کاتەکانی ساڵ بێ ئاوە، شارەکە دەکەوێتە بناری زنجیرە چیای گۆیژە، کە لە باکوور درێژدەبێتەوە تاکو باشوور، تەواوی ئەو ناوچە ئاووهەوایەکی وشکی هەیە، تەنیا پێگەی ستراتیژی ئەوەیە، شوێنی مانەوەی نوێنەری سوڵتانە لەم بەشەی کوردستان، لە سلێمانی ١٥ خێزانی جولەکەی لێیە، بەشەکەی تری دانیشتوانەکەی، کە بە شەش هەزار کەس دەخەمڵێندرێت، سوننە مەزهەبن، لەم شارەدا هیچ باسی مۆنیمێنت و گۆڕ و پاشماوەیەک ناکەم، شارەکە هیچیانی لێ نییە، تەنانەت شوێنی مانەوەی پاشاشی لێ نییە، کە شایەنی باس کردن بێت.»[١]

ئەلیساندرۆ دو بیانچی(Alessandro De bianchi) خەڵکی ناوچەی سلێمانی بە کوردی دڵسۆز دادەنێت، هەر لە سەدەی نۆزدەوە بەدواوە ناوەندیی نەتەوایەتی و ڕۆشەنبیریی کوردی بووە، ئەلیساندرۆ دەڵێت:» کوردی دڵسۆز و ڕاستەقینەن، دابونەریتی باب و باپیرانی پالەویی و ئەشکانیان پاراستووە، لە تەواوی دەوروبەری سلێمانی دەژین، دەکەوێتە ناوەڕاستی بەرزترین و بە پیت و فەرترین دۆڵەکانی کوردستان. ئەو خەڵکە پیشەیان کاری چەتەییە، تەنیا خەریکی ئەوەن چی تالان بکەن، هەمیشە خۆیان بەو کارە سەرقاڵ کردووە. بەگشتی لە ڕووی جەستەییەوە بەهێز و ئازا و ماندونەناسن، بەهۆی تیشکی خۆرەوە، پێستیان ڕەش هەڵگەڕاوە، ئەوەش وایان لێ دەکات زیاتر بە چەتە بچن. خاوەن عەقڵ و ژیری و کارمەیی و داهێنان، نمونەی ڕەوش و سیفەتی نەتەوە ڕۆژهەڵاتییەکانیان هەڵگرتووە، لە تورکەکان و حاکمەکانیان زیرەک و ژیرتر دیارن.»[٢]

کاپتنی ئیتاڵی(Italian Captain) جەخت لەوە دەکاتەوە، کە سلێمانی:» دانیشتوانەکەی ١٥٠٠٠ کەس دەبێت، هەروەکو کۆیسنجەق تەواوی دانیشتوانەکەی کوردن، جگە لە هەندێک بنەماڵەی جولەکە و ئەرمەنی نەبێ کە بۆکاری بازرگانی دێن.»[٣]

لوسی گارنیت(Lucy Garnett) زۆر بە جوانی وەسفی خانووەکان دەکات:» لە سلێمانی پایەختی کوردەواری، خانووەکانی باشترن و شێوەیان چوارگۆشەیە، یەک نهۆمین، نزیکەی سێ پێ لەسەر بناغە بنیاتنراون، بە خشتی وشککراو لەبەر ڕۆژ دروستکراون و، بە تێکەڵەی قوڕ و پوش و کا سواخ دراون. لە ناوەوە ژوورە

1. Lycklama a Nijeholt 1872-1875، vol. IV، p. 79، 84.

2. De Bianchi 1863، p. 188-189. This passage on the Kurdish inhabitants of Su laymäniyyah was appropriated by the book of Heude 1819، p. 35-36.

3. De Bianchi 1863، p. 174. William Heude estimated the population of Su laymäniyyah from 12 to 15 thousand souls (1819، p. 23-24). See also Cuinet 1890 1895، t. II، p. 868-870.

گەورەکانیان بە گێچ ڕووپۆش کراون، میچە تەخت و پانەکانیان بە کاریتە ڕاگیر کراون، بە قامیش و خۆڵ داپۆشراون. خانووەکان بە شورا و پەرژین دەورە دراون، بەهۆی ڕێگەی پیادەی بەرینەوە حەوشەکە دەبێتە دوو بەش، لە کۆتایی نزیک ناوەند دەگەنەوە خانووەکە، بەشی پێشەوەی پێ دەگوترێت سەلەملیک-Selamlik (بەشێکە لە کۆشک و خانووی عوسمانییەکان، کە بۆ پیاوان تەرخانکراوە)، لە بەشێکی حەوشەکە، لە دواوەش پێ دەگوترێت حەرەملیکHaremlik- (ئەو بەشەیە لە خانووی عوسمانییەکان، کە تەنها بۆ ئەندامانی خێزان دیاریکراوە) لە بەشەکەی تری حەوشەکە. لەژێر سێبەری دارچنار و بی و سورەچنار و توو، باخەکان بە فریز و گژوگیا ڕازێندراونەتەوە، لەلایەکی تریشەوە کۆمەڵی گوڵەباخ لە دەوری باخەکە چێنراون و بە جۆگەلە ئاوی سەرچاوەی چیاکان ئاودێری دەکرێن، خانۆچکە سەرەکییەکان بە تەلار ناویان دێنن، ژوورێکی کراوەیە، خێزانەکان لە کەشوهەوای گەرم بۆ نووستن و دانیشتن بەکاریدەهێنن، تەنیا خەڵکە هەژارەکە نەبێ لەسەر بانەکان دەخەون. هەندێکیان لە ڕۆژە زۆر گەرمەکاندا، کە نزیکەی یەک مانگی پێدەچێت، لەژێر کەپر و سابات دەخەون، یان لەسەر تانکی حەوشە و ژێر خێوەتەکان دەخەون، تاوەکو خۆیان لە هێرشی کێچ بە دوور بگرن، دەڵێن کێچەکانی ئێرە زۆر لەوانەی تورکیا زلتر و ترسناکترن. لە ژووری سەلەملیک، کە هۆڵێکی فراوانە و ڕووناکییەکی لیڵی هەیە، وەکو پەناگەیەکی فێنک وایە لە وەرزی هاویندا. ڕێڕەوێکی تاریک و دووردرێژ بۆ ژوورەکانی زستانە دەچێت.

خانووە ئاساییەکان کۆلیتێکی لە قوڕ دروستکراون، ئەمەش شێوەیەکی وایان پێدەدات لە دیمەنی خانووی گوندی عەرەبەکان بچن. ئیشوکاری ناوماڵ لە شوێنە گشتییەکان دەکرێت. تەواوی خێزانەکە لە سەربانە تەخت و نزمەکان لە بەردەمی جیران و ڕێبواران دەخەون.»[1]

ئورفە (ناوی کۆنی ئەدیسە) گرنگییەکی بەرچاوی لە سەرەتاکانی سەردەمی مەسیحییەت هەبووە. دۆمێنیکۆ لانزا(Domenico Lanza) دەڵێت:» تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت ئورفە شارێکی گەورەیە، شارەکە بە شورای بەرز و بەردینی کۆن دەورەدراوە. لێرە، وەزیرێکی بەناوبانگ دەژی، دەسەڵاتی ئەوەی پێدراوە حوکمی ئەو ناوچە بەرفراوانە بکات. هەر لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیەوە، ئەم شارە بووەتە خاوەن سەروەت و سامانێکی زۆر. مرۆڤ و سەرکردەی لە خۆبایی و بەفیز لێرە ژیاون، بوارێکی کەمیان داوەتە پاشا و سەرکردە بیانییەکان تا حوکم بکەن. لە سەرەتاکانی ئەم سەدەوە میرێکی زۆر زۆرزان و فێڵباز و باڵادەست دێتە ئەو ناوچەیە. بەهۆی بانگهێشتی ساختەوە فێڵیان لێدەکات و

1. Garnett 1893، part III، p. 118-119

هەڵیاندەخەڵەتێنێت، هەموو ئەو سەرکردە و مرۆڤە مەزنانە کۆدەکاتەوە و دەیانکوژێت. دواتر لەگەڵ شوێنکەوتووانی دەچێتە ناو شارەکە، ئەو سەرکردانی مابونەوە و لەگەڵ خەڵکێکی زۆر دەکوژێت. لەو ڕۆژە بەدواوە بەکەیف و ویست و ئازادی خۆی حوکمی ناوچەکە دەکات، تا دواهەمین شەڕ لە دژی ڕووسەکان.

هەرچەندە، شارەکە بەشێکی زۆری سامانی دێرینی لە دەستدا، لەگەڵ بەشێک لە دانیشتوان و خەڵکەکەی، کۆشک و خانووەکان بە بەهێزی ماونەتەوە، چونکە لە بەرد بنیاتنراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچیان شایەنی تێڕامان نەبوون. ئەوەی لەو شارە زۆر سەرنجی ڕاکێشام، ئەو حەوز و گۆماوە بوو، بەهۆی سەرچاوەی ئاوی کارێزێکی سازگارەوە ئاوی تێدا گلەدرێتەوە، ئەو کانیاو و کارێزە بە (کانیاو و کارێزی ئیبراهیم) ناسراوە. گوایە ئەو کانیاو و کارێزەیە، کە پێغەمبەر ئیبراهیم لەپاڵیدا پشووی داوە. حەوزە ئاوەکە هێندە لەو شاخە بەردینانە دوور نییە، هەندێک لەو پارچە بەردە مەڕمەڕانە لەبەر چاوان دیارن.

لە بناری ئەو شاخە، مزگەوتێکی بچووکی تورکەکان هەیە، بە دیواری بچووک دەورەدراوە، لە نزیکییەوە ئاوێکی زۆر هەڵدەقوڵێت. هەندێک لەو ئاوە بۆ ئاشی ئاوی بەکاردێت، بڕەکەی تری بۆ ئاودانی باخ و شینایی سەوزە و میوەکان بەکاردێت، ناوەوەی مزگەوتەکە تەخت و ڕاستە، سەرسوڕهێنەرترین شت، ئەو قەدە دارە گەورانەن، کە ناوەوەیان کلۆرە، تەنیا بەهۆی نیانە بەهێزەکانیان ڕاوەستاون. هەربۆیە خەڵکی ئەو ناوچەیە پێیانوایە ئەو دارانە هی سەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەرن و، لەبەر فەزڵ و چاکەی ئەوە، کە تائێستا وشک نەبوون. ژمارەی ماسی لەو ئاوەدا سەرسوڕهێنەرە، هەر هەندە لەتکە نانێک بخەیتە ناو ئاوەکە، ژمارەیەکی بێشوماری ماسییەکان خڕدەبنەوە و تەواوی ڕووی ئاوەکە دادەپۆشن. ماسییەکان هەموویان لەیەک جۆرن، هەندێکیان قەبارەیان یەک باسک دەبێت. تورکەکان ماسی ڕاوناکەن، ناشهێڵن مەسیحییەکان ڕاوی بکەن، دەڵێن ڕێگەپێدراو نییە ئەو ماسییە بخۆی، هەرچەندە لە غەفڵەت و بێ ئاگاییدا، هەندێک جار مەسیحییەکان ڕاوی ماسییەکە دەکەن و دەڵێن زۆریش خۆش و بەتامە.

ژمارەیەکی زۆر لە مەسیحییە یاقوبییەکان لەو شارەدا دەژین، هەر کۆمەڵە و ناوچەیەک مەترانی خۆیان هەیە. لە کۆتایی گەشتەکەمدا، هێندە دوور نا لەو شارە، تێبینی ئەوەم کرد ئەشکەوتێکی زۆر لە شێوەی کانە بەرد لەو شاخانەدا هەڵکۆڵدراون، پرسیارم لە کەسێکی کاسۆلیکی کرد، بۆچی هەڵدەکۆڵن و سوودی چیە، ئەویش وتی پێش دروستکردنی ئەو شارە، هەزارەها ئەشکەوتی لەو جۆرە لەو شاخ و بەردانەدا هەبوون، ئێستا ئەو ئەشکەوتانە بۆ پاراستنی بەفر بەکاردێن، لە وەرزی هاوینشیدا بە

نرخێکی هەرزان دەیفرۆشن.»[1]

ڤۆن مۆڵتکە(Von Moltke) باسی مێژووی مەسیحییەکانی ئورفا دەکات، پێش هێرشی عەرەب هزر و وێنای مەسیح بۆماوەی چەندین سەدە لە بیر و هۆشی خەڵکەکە پارێزراو بوو.[2] بەگوێرەی کارلیلی ماککۆوان(Carlile Mccoan) بێت، ژمارەی مسوڵمانەکان بە ٥٠٠٠٠ کەس، ئەرمەنی و یاقوبی و جولەکەکانیش بە ١٠٠٠٠ کەس دەخەمڵێندرێت.[3] لەلایەکی تر ئۆلیڤەر(Olivier) سێ لەسەر چواری دانیشتوانی ناوچەکە بە عەرەب و کورد و تورک دەخەمڵێنێت، ئەوانی تریش جولەکە هەژار و ئەرمەنییە دەوڵەمەندەکانن.[4]

زانای فەڕەنسی ڕۆشنایی زیاتر دەخاتە سەر هەندێک لایەنی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەکە:» خانووەکانی شاری ئورفە لە بەرد و وردەبەرد بەتوندی و قایمی بنیاتنراون، خانووەکان نزمن و هەیوانێکیان لە پێشەوە هەیە. لە ناوەڕاستی کوچە و کۆڵانەکان جۆگە ئاوێکی دووسێ پێ پان دەڕژێت و، خۆڵ و خاشاکی تێدا خڕبۆتەوە، لەملا و لەولا دوو ڕاڕەوی دروستکردووە، تا ڕادەیەک خاوێن و لەبارن بۆ پەڕینەوەی ڕێبواران.[5]

هەرچی لە شارەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هەبێت، لێرە دەیبینین، بە بەراورد بە ژمارەی ئەو کەنیسانەی لە شارە کاسۆلیکییەکانی ئەورووپا هەن، لێرە ژمارە مزگەوتەکان زیاترن. ئورفە تەنیا شارێکی ئاسایی نییە، بەڵکو شارێکە بڕێکی چاکی فاسۆلیا و لۆبیا و نۆک و قوماشی لۆکە لە بەرهەمی لۆکەی ناوچەکە لێ دەنێردرێتە شارەکانی تر، هەروەها بەکاری زیوگەڕیی و خشڵ بەناوبانگە. لێرە چەرمێکی زۆرباشی مەڕاکیشی دروست دەکرێت، لە ڕێی حەلەب و دیاربەکرەوە بۆ سوریا و ئاسیای بچووک دەنێردرێت. لێرە پارەی کانزایی و مەدالیای سەردەمی پاشای ئەبگارەکان(Abgar) هەن، ئەو پارچە بڕۆنزییانە کەم پارێزگارییان لێکراوە و ناسکن زوو دەشکێن، لەو جۆرە پارچانە، هی سەردەمی سەلجوقییەکان زۆر کەمن، بەڵام زۆر جوانترن، ژمارەکی زۆر لەو مەدالیا زیوییانەمان دیتن، زۆر جوانتربوون، باشتر پارێزراو بوون، هەروەها هەندێک مەدالیای زیوینی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانییەکانیش لێرە هەن، دراوی کانزایی سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی بیزەنتی و خاچ پەرستەکان و عەرەبەکان لێرە زۆر بەربڵاون. جارجارە چەند کیسەیەک لەو پارە کانزایانە دەهێنن، بەرامبەر فرۆشتنی یەک دووان لەو

1. Lanza manuscript، P. 212-216
2. von Moltke 1878، p. 197-198. See also Olivier 1801-1807، vol. II، p. 334-335.
3. McCoan 1879، vol. I، p. 88.
4. Olivier 1801-1807، vol. II، p. 330.
5. Olivier 1801-1807، vol. II، p. 329، 330، 334.

پەرەشووتانە چەند پارچە مەدالیایەک و دراوێکمان پێ دەدەن.»[1]

شاری وان لە زۆر یادەوەری دێرینی مێژووییدا ناوی هاتووە، بازرگانە نەناسراوەکەی ڤێنیسیا(Anonymous Merchant of Venice) دەڵێت:» لەو قەڵایە پاشایەکی کورد دەژی بەناوی زیدی بێک (Zidibec)، ئەو پاشایە کەسێکی لە خۆبابیە، لە ناوچە شاخاویی و چیاییەکاندا خاوەنی چەندین قەڵا و تاوەرە، سکەی دراوی زێڕ و زیو و مس لێدەدا. زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە ئەرمەنن، بەڵام لەناو قەڵاکە تەنیا کورد دەژی. ئەم شوێنە نزیکەی یەک میل لە دەریاچەی وانەوە دوورە، کە سەرچاوەی چەندین جۆری خۆراکە.»[2] هەروەها ژین باپتیستی تاڤێرنیر(Jean-Baptiste Tavernier)یش دەڵێت: زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە ئەرمەنن.[3] بەهۆی پێگەی جوگرافی و ستراتیژییەکەی پۆلێت (Poullet) هێزی سەربازی بە نزیکەی شەش حەوت هەزار کەس دەخەمڵێنێت.[4]

لە نیوەی دووەمی سەدەس ١٩، جۆن ئوشەر(John Ussher) بەمشێوەیە باسی شاری وان دەکات:» ئێستا ئەو شارە بریتییە لە چەند کۆڵێتێکی لە قوڕ دروستکراو، زۆر زەحمەتە بە خانوو دایان بنێی، دانیشتوانی شارەکە بیست و پێنج تا سی هەزار کەس دەبێت، زۆربەیان ئەرمەن و تورک و کوردن.[5] کۆشک و خانووی کۆن لەنێو شارەکەدا نەماون، جگە لە یەک دوو کەنیسەی زۆر کۆنی ئەرمەنییەکان نەبێت بەناوی قەشە پۆل و پیتەر. کوچە و کۆڵان و بازاڕەکانی زۆر تەسک و پیس و پۆخڵن، خانووەکان نزمن، میچەکانیان تەختن، بە چینێکی ئەستوری قوڕ داپۆشراون و بە گەچ سواخ دراون بۆئەوەی بەرگەی سەرمای زستان و گەرمای بەتین و کورتی هاوین بگرێت. حامیەی شارەکە لە ٢٠٠٠٠ پیاو پێکدێت، فەرماندەی ئەو حامیە لەهەمانکاتدا پارێزگاری تاوەرەکەشە و دەسەڵاتی سەربەخۆیە لە پاشا.»١١٣*

جوگرافیازانی بەریتانی باسی هەندێک شوێنەواری کۆنی شاری وان دەکات، لەوانە نوسینی بزماری، کە بە فەرمانی زرکسیس (Xerxes) لە شاخەکانی بەردەم شارەکەدا هەڵکۆڵدراون. ئەفسانە و سەربوردەی زۆر لەوبارەوە وتراون، ئەورووپییەکانیش لەوبارەوە لێکۆڵینەوەی زۆریان کردووە.» خەڵکە ڕەسەنەکەی هەندێک جار دەگەنە ئەو باوەڕەی، کە سەروەت و سامانێکی زۆر لەژێر ئەو نوسینە بزماریانەدا حەشار

---

1. (Anonymous Merchant of Venice 1563 1606، p. 81). See also Legrenzi 1705، p. 63-64
2. Poullet 1667-1668، vol. II، p. 363.
3. Henry Binder suggests the same estimation (1887، p. 134).
4. Ussher 1865، p. 317-318. At the end of the 19th century، Cuinet stated that population in Van amounted to 30،000 souls. See Cuinet 1890-1895، t. II، p. 691.
5. Ussher 1865، p. 318-322.

درابن.»*١١٤

مەیجەر فریدێریک میلینگن(Major Frederick millingen) دەڵێت:» ئەو شارە خاوەن کەلتوور و شارستانییەتێکی کۆنی ئەرمەنییەکانە، بەبێ ئەوان شوێنەکە لە بەهەشتی عەدەنەوە بۆ چۆڵ و بیابان دەگۆڕدرێت. زەوییەکان بە کۆشش و ڕەنجی جووتیارە ئەرمەنییەکان کێڵدراون. ئەو جووتیارانە زەوی و ڕەز و باخەکانی دەشتەکانی وان و دوڵ و شیوی ڕۆخ دەریاچەکە دەکێڵن و دەچێنن. پیشەسازی بازرگانییە بچووکەکان بە هەوڵ و ڕەنجی ئەرمەنەکانە. هەر ئەوانن کۆشک و دیوار و خانووەکان دروست دەکەن و بەرز دەکەنەوە. ئاسنگەر و زیوگەر و زیندروو و بەرگدروو و پێڵاودروو پیشەی ئەرمەنییەکانن. هەر ئەوان خاوەنی هەموو جۆرە دوکان و خانەیەکن، هەر لە بازرگانییە بچووکەکانەوە بگرە تا ئیشوکارە گەورە و مەزنەکان و سەرمایە و بانقەکان. لێرەدا ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر هەیە، کەنابێت بشاردرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە تەنیا بازرگان و کاسبە ئەرمەنەکان هاوبەشی چالاکن، ئەو سەرمایەی کە ئەوان ئیشی پێدەکەن هی مسوڵمانەکانە، قازانجەکەشیان لەگەڵ مسوڵمانەکان نیوە بە نیوەیە. پیشەی ماسیگریی و دەریاگەری لە سەرتاسەری ئەرمینیا بەدیدەکرێت».[١]

## سەرچاوە و پەراوێز

GALLETTI، M. (2001). KURDISH CITIES THROUGH THE EYES OF THEIR EUROPEAN VISITORS. Oriente Moderno، 20 (81)، 109-148. Retrieved June 15، 2021، from http://www.jstor.org/stable/23073421

1. Millingen 1870، p. 267.



عادل صديق

# ڕاڤەی بازرگانی بۆ داگیرکاری

## پێشەکی

پەرەسەندنی بازرگانی و پەیوەندییە بازرگانییەکان یەک لە تایبەتمەندییەکانی کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەردەمی ڕێنیسانس بوو لە ئەوروپا، لێرە بەدواوە شار شوێنی بە لادێ و سەرمایەداری شوێنی بە سستمە دەرەبەگایەتییە تەمەن چەند سەد ساڵەکەی ئەوروپا لێژ کرد، گۆڕانێک کە ئەورووپای لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی نوێ گواستەوە، لەوچوارچێوەیەدا دۆزینەوە جوگرافییەکان و کشان بەرەو ئەفریقا و ناوچەکانی ئاسیا لێشاوێک لە سامان و کاڵا و شمەکی نوێ بەتایبەتی زێڕ و کۆیلەی بەدیاری لەگەڵ خۆیدا بۆ ئەوروپا هێنا، ئەڵبەت ئەم بابەتە هەروا بە سانایی تێنەپەڕی، کێشمەکێشم و ململانێی زۆری لە نێوان وڵاتانی ئەوروپادا دروستکرد، ئەو ململانێیانە ناوبەناو بە پەیماننامەیەک بەمەبەستی دابەشکردنی ناوچەکانی نفوز لە نێوان خۆیاندا ئاوێکیان پێدا دەکرا، بەڵام هێندەی نەدەبرد هێز و دەسەڵاتی نوێ دەردەکەوتن و دیسان ململانێی نوێ سەریهەڵدەدایەوە.

پرۆسە داگیرکارییەکانی ئەوروپا قۆناغی زۆریان بەخۆیانەوە بینی، هەر قۆناغێکیش تایبەتمەندی خۆی هەبوو، میکانیزم و بیانووەکانیش بۆ پرۆسەکە زۆر و جۆراوجۆر بوون، هەروەک مامەڵەی هەر وڵاتێکیش لەگەڵ داگیرگەکانیان جیاواز بوو، بەڵام لەکۆتاییدا ئامانجەکە ڕووتانەوە و بەتاڵانبردنی توانا مرۆیی و سرووشتییەکانی گەلانی کۆلۆنیکراو بوو. تاڵانییەک کە سەرەتا بە پەیوەندی بازرگانی دەستپێکرد و بە داگیرکردنی ڕاستەوخۆ کۆتایی پێهات. پرۆسەیەک بۆ ئەوروپییەکان بوو بە مایەی خێر و خۆشی و بۆ گەلانی کۆلۆنیکراویش چەپاندن و ڕووتاندنەوە هەتا ڕادەی کوشتن و پاکتاوی ڕەگەزی ملی نا.

## بەشی یەکەم/ کاریگەری دۆزینەوە جوگرافییەکان لەسەر پەرەسەندنی پرۆسەی داگیرکاری

### باسی یەکەم/ ڕەوشی بازرگانی ئەوروپا لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستدا:

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بازرگانان گەورەترین هۆکار و خاوەن ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەر بوون لە نەچەسپانی ژیانی ئەوروپادا، چونکە بە بەردەوامی دژی ئامۆژگاریی و مەرجەکانی کڵێسەی کاسۆلیکی کاریان دەکرد. لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەگەر کڵێسەی دوژمنایەتی لەگەڵ ئەم کۆمەڵە خەڵکەدا هەبووبێ، بەهۆی نەگونجانی بیروباوەڕ و مەبەستەکانیانەوە یاخود بە دوونەکەوتنی ئەم کۆمەڵە بەدوای ئامۆژگارییەکانی کڵێسە و مەرجەکانییەوە، ئەوە میرە دەرەبەگەکان و خوداپێداوەکان بەرهەڵستیان کردوون، لە مەبەستێکەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ بنچینەی کۆمەڵایەتی(١).

لەڕاستیدا چەند هۆکارێک هەبوون، کە زەمینەسازی بۆ داڕمانی سستمی دەرەبەگایەتی دەکرد، بەڵام کاریگەری ئەو هۆکارانە بەڕوونی دەرنەکەوتن و تەواوی سستمی دەرەبەگایەتی نەخستبووە قەیرانێکی قوڵەوە هەتاوەکو ببێتە هۆکاری داڕمانی، ئەو هۆکارانە لە سەدەی چواردەیەمەوە دەرکەوتن. یەکەم و گرنگترینی ئەو هۆکارانە ڕاکردنی کۆیلەی زەوی بوو، ئەوە لەکاتێکدا سستمی دەرەبەگایەتی لەسەر بنەمای ئابووری کشتوکاڵ دامەزرابوو، کە بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بەکۆیلەی زەوی بەستبوو، ڕاکردنیان بووبە هۆکاری لەقکردنی سستمەکە و بەردەوام نەبوونی(٢). کۆیلەکان بەرەو شارەکان هەڵدەهاتن و شارەکانیش وردە وردە لە چنگی دەرەبەگەکان دەردەچوون و بەرەو کاری بازرگانی هەنگاویان هەڵدەهێنا، پەیوەندییەکانی ئەوروپا لەگەڵ جیهانی ئیسلامی لە سەردەمی جەنگی خاچپەرستەکان(٣) و دۆزینەوە جوگرافییەکان و ڕێگە ئاوییە نوێیەکان لە گرنگترینی هۆکارەکانی پەرەسەندنەکانی کاری بازرگانی بوون لە ئەوروپا.

بازرگانەکان بەهۆی کاری بازرگانییانەوە ئێجگار دەوڵەمەند بوون، بەگشتی چالاکییە ئابوورییەکانیان لەپێناو بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجدا بوو. بەوجۆرە بازرگانی ڕێگەی بۆ جیهانی دەرەبەگایەتی دۆزییەوە، خەسڵەتەکەی لەباوی کشتوکاڵییەوە گۆڕی. لەو

هۆکارانەی تر شار بەڕێکخستنە کۆنەکەی، بەوەی بەشێکی ژێردەستی دەرەبەگ، چیدی بوارێکی گونجاو و باشی چالاکی بازرگانی نەما. بازرگانی پێویستی بە ئازادییەکی زیاتر بوو، کە پێچەوانەی ئەو کۆت و بەندانەبوو کە سستمە دەرەبەگایەتییەکە سەپاندبووی(٤). لێرەوە فراوانبوونی شارەکان، بوو بەهۆکارێک بۆ پەرەسەندنی بازرگانی و تاڕادەیەک پیشەسازیش(٥).

بەردەوامبوونی بازرگانەکان لە هاتوچۆکردن و کاری خۆیان و بڵاوبوونەوەی چالاکییە ئابوورییەکانیان و پەلهاویشتنیان هەمیشە یارمەتی ئەوەی داون بەباشی خۆیان بچەسپێنن وەک کۆمەڵەیەکی ئابووری جیاواز و کاریگەر لە ژیانی کۆمەڵگاکانی ئەوروپادا. لە ئەنجامی کردارە ئابوورییەکانیان و ڕۆڵیان لەنێو کۆمەڵدا و بەتێپەڕبوونی کات ئیدی کۆمەڵ ڕێزێکی زۆری لەو کۆمەڵە بازرگانانە دەگرت و ڕۆژ بەڕۆژ پێگەیان قایمتر دەبوو(٦).

ئەڵبەت ئەو قۆناغە(سەدەکانی ناوەڕاست) ئەوروپا لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ درابوو، لە باکوورەوە ناوچە سارد و بەفراوییەکان، لە خوارەوە وڵاتە ئیسلامییەکان و بیابانی گەورە، لە ڕۆژئاواوە زەریای ئەتڵەسی و لە ڕۆژهەڵاتیشەوە کیشوەری ئاسیا بوو. ئەوەش وایکردبوو هەر وڵاتیکی ئەوروپی پشت بەتوانای خۆی ببەستێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک کاڵا و شمەک لەوانە بەهارات و ئاوریشم و لۆکە لەبەر نەبوونیان لە ئەوروپا بەناچاری لە دەرەوە دەهێنران، بەتایبەت لە دوورگەکانی هیندی ڕۆژهەڵاتی. تەواوی ڕێگا وشکانی و ئاوییەکانش کەوتبوونە بن کۆنترۆڵی دەوڵەتە ئیسلامییەکان. لە ڕۆژهەڵات عەرەبەکان کۆنترۆڵی بازرگانیان کردبوو، لە ڕۆژئاواش شارەکانی ئیتالیا بازرگانی ئەوروپایان خستبووە ژێردەستی خۆیانەوە(٧)، هەردوولاش قازانجێکی زۆریان لەو کارەیان دەکرد. دوای دەرکەوتنی تورکە عوسمانییەکان و کۆنترۆڵکردنی ڕێگا بازرگانییەکانی ڕۆژهەڵات، وڵاتانی ئەوروپا کەوتنە خۆیان بۆ دۆزینەوەی ڕێگایەکی نوێ بۆئەوەی بیانگەیەنێت بە ڕۆژهەڵات و بەناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی عوسمانییەکانیشدا تێنەپەڕێت، هەروەک ئەو وڵاتانە ئیرەییان بە ئیتالییەکان دەبرد و دەیانویست بازرگانی ئەوروپا لەژێردەستیان دەربهێنن، ئەمە وایلێکردن کە بگەڕێن بەدوای ڕێگایەکی نوێ دا کە دووربێت لە دەسەڵاتی ئەو دوو لایەنە، لەو ڕووەوە ئیسپانی و پرتوگالییەکان پێشەنگ بوون، پرتوگالییەکان توانیان بۆ یەکەمجار ڕێگای (رأس رجاء الصالح) لەساڵی ١٤٩٨ لە ڕێگەی دەریاوانی وڵاتەکەیان (فاسکۆ دیگاما)وە بدۆزنەوە و بە سوڕانەوە بەدەوری کیشوەری ئەفریقادا بگەن بە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات.

بەم شێوەیە بازرگانی لە دەریای سپی ناوەڕاستەوە گوازرایەوە بۆ زەریای ئەتڵەسی و لە خوارووی ئیتالیاوە بۆ خوارووی کیشوەری ئەفریقا و بەوەش گرنگی و بایەخی

شارەکانی جەنەواو ڤینسیای ئیتالی کەمبوویەوە، لێرە بەدواوە شارەکانی لەندەن و ئەمستردام لە ڕۆژئاوا ئەوروپا بوون بە مەڵبەندی بازرگانی زۆر گرنگ. پێشتریش کریستۆڤەر کۆلۆمبسی بەڕەچەڵەک ئیتالی(جەنەوا) لەساڵی ١٤٩٢ بە پشتیوانی پاشا و شاژنی ئیسپانیا(فێردیناند و ئیزابێلا) و بە سێ پاپۆڕی ئەو وڵاتە(نینا، پینتا، سانتانا ماریان) توانی بووی بگاتە ژمارەیە لە ناوچەکانی ئەمریکای لاتین(٨).

ڕەوشی وڵاتانی عەرەبی بەو پێشهاتە نوێیانە شپرزە بوو، ڕۆڵە سەرەکییەکەیان لە بازرگانی نێوان خۆرهەڵات(هیند و چین) و ئەوروپا نەما، کە سودێکی زۆریان لە وەرگرتنی باجەکانیان دەبینی، بەڵام بەو دۆزینەوە نوێیانە دەستکەوتەکانیان لەکیس چوو، بەوهۆیەشەوە بازاڕەکانیان ڕووی لە کزیی و لەناوچوون کرد(٩).

دواتر ئیسپانی و پرتوگالییەکان(١٠) توانیان دەرگای ئەمریکای باشوور و ناوەڕاست بکەنەوە و ئینگلیز و هۆڵەندی و فەڕەنسییەکانیش ئەمریکای باکوور، پاشان توانرا کۆمەڵێک ناوچەی زیاتر لە ڕۆژهەڵات و کیشوەری ئەفریقا بدۆزرێتەوە، ئەوەش دەرەنجامی گەڕانیان بوو بەدوای بەهاراتدا، دواتریش کۆیلە و خشڵ و ئاڵتوون. ئەم گەڕانەش وەک پاشتر ڕوونبوویەوە مەبەست لێی دەستبەرداگرتن و ڕووتانەوە و مژینی خوێنی گەلانی کۆلۆنیکراو و دەستگرتن بەسەر ئابوورییاندا بوو(١١).

لەڕاستیدا سەرمایەداری لە ئەنجامی پەیوەندی بازرگانی نێوان ئەوروپا لەلایەک و خۆرهەڵات و دۆزینەوە جوگرافییەکان و پاشان دەستگرتنی ئەوروپا بەسەریاندا و سەرپێخستنی ئەو ناوچانە لەلایەن ئەوروپییەکانەوە گەشەی سەند(١٢). لێرەوە وڵاتە کۆلۆنیکراوەکان ئەنجامی ئابووری نایابیان بۆ وڵاتانی ئەوروپا بەدوای خۆیدا هێنا، هەروەک هاوکارێکی باش بوو لە گەشەپێدانی ئاستی ئابووریی و گەشەپێدانیان، هەر ئەم بابەتە سەریکێشا بۆ دەرکەوتنی قۆناغێکی نوێ لە مێژووی مرۆڤایەتی کە ئەویش سەرمایەداری بوو.

**لێرەدا دەتوانین گرنگترین دەرئەنجامەکانی دۆزینەوە جوگرافییەکان و ئەنجامی کۆلێنیکراوەکان بخەینەڕوو:**

١. گەرمبوونی بازاڕ بەشێوەیەک پێشتر وڵاتانی داگیرکەر شتیوایان بەخۆیانەوە نەدیبوو.
٢. هێنانی بڕێکی زۆر لە ئاڵتوون بۆ وڵاتانی ئەوروپا، بەر لە هەموویان بۆ ئیسپانیا و پرتوگال و دواتر ئەوانی تر.
٣. هێنانی بڕێکی زۆر لەو بەرهەمانەی کە لە وڵاتانی ئەوروپا نەبوون، بەنمونە لە ڕۆژهەڵاتەوە چاو و بەهات و لە ڕۆژئاواوە کاکاو و جگەرە و پەتاتە ...هتد.
٤. هەمەچەشنبوونی لقەکانی بەرهەم، بەنموونە لە بواری پیشەسازیدا وەک دروستکردنی پاپۆڕ یان دەرهێنانی خەڵوز و ئاسن یان لە بواری کشتوکاڵیدا(١٣).

**باسی دووەم/ ڕۆڵی دۆزینەوە جوگرافییەکان لە دەرکەوتنی پرۆسەی داگیرکاریی و سەرمایەداریدا:**

ئیمپریالیزم هەژموونی خەڵکانێکە بەسەر ئەوانی تردا، ئەم هەژموون و هێزە دەکرێت لە ڕێگەی ئابووریی و سیاسیی و کلتوورییەوە بێت(١٤). لە سەرەتادا زلهێزە ئەوروپییەکان قەڵەمڕەوی ئاسیا و ئەفریقایان داگیر نەکرد، بەڵکو لەبری ئەوە چەندین وێستگە و بنکەی سەربازییان لەو کیشوەرانەدا دامەزراند، لە دەورانی سەرهەڵدانی سەرمایەداریدا، ئیسپانی و پرتوگالییەکان دوو ئیمپراتۆریەتی داگیرکارانەی گەورەیان لە ئەوروپا دروستکرد. پرتوگالییەکان لەو ململانێیەیاندا کە لەگەڵ عەرەبەکاندا دەستیان پێکردبوو دزەیان کردە ناوچەکانی باکووری ئەفریقا، بەنموونە لە ساڵی ١٤١٥ شاری سەبتەیان داگیرکرد، لەوە بەدوا ئەو ناوچەیە وەک پێگەیەک بۆ بازرگانی دەریایی و داگیرکاری بەکارهێنرا(١٥). گەشەکردنی ئابووری بازرگانی ئەوروپی بووبە هۆی گەشتی دۆزینەوە جوگرافییەکان، کە بەدڵنیاییەوە ئیسپانی و پرتوگالییەکان ئەنجامیاندا، لەڕاستیدا جەوهەری پرۆسەکە بریتی بوو لە هەوڵی کۆمەڵگە ئەوروپییەکان، بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگە ئاسیایی و ئەفریقییەکان لە سەرەتای سەرمایەداریدا(١٦).

بەزۆر سەندنەوەی خاوەندارێتی لە جوتیارەکان وەک یەکێک لە هۆکارەکانی کەڵەکەبوونی سەرمایە ئاوێتەی قازانجگەلێکی ئامادەی سەرچاوەگرتوو(١٧) لە تاڵانکردنی زەوییە تازە دۆزراوە و داگیرکراوەکان بوو. پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی کاڵا ـ پارە بووە هۆی یارمەتیدانی زەویدارانی دەرەبەگی ئەوروپی بۆ کەڵەکەکردنی سامانێکی زۆر. چاوچنۆکی هێزی بزوێنەری ئەوان بەرەو ناوچە دوورە دەستەکانی ئاسیا بوو. کۆمەڵێک ئەفسانە لە بارەی سەرزەوییە نەناسراوەکانی ئەوپەڕی دەریاکانی ڕۆژئاوا لە گۆڕێدا بوو. ئەو چاوچنۆکیانە لەئەنجامدا دۆزینەوە جوگرافییەکانی بەدوای خۆیدا هێنا، لەهەمانکاتیشدا خاڵی وەرچەرخانی سیاسەتی داگیرکاری وڵاتانی ئەوروپی بوو.

دەرەبەگەکان، بازرگانە ئیسپانی و پرتوگالییەکان، یەکەمین کۆلۆنیالیستەکان بوون. گەڕان بەشوێن زێڕدا، سەرکەشانی پرتوگالی بەرەو ئەوپەڕی زەریاکان کێش کرد. ئەوان سەرباری کۆمەڵێک گەشت بۆ پەیبردن و دۆزینەوەی ڕێڕەوە ئاوییەکان لە نزیک کەناراوەکانی ئەفریقا، لە ئاکامدا گەیشتنە هیند و لە کۆتایی سەدەی پازدە دەستیاندایە تاڵانکردنی ئەو وڵاتە کە زیاتر بریتی بوو لە خاکی زێڕ، عاج و بەهارات. ..هتد، کە بەکەشتی دەیانگواستەوە بۆ پرتوگال. هەروەک تەواوی ئەو زەوییانەی کە کۆلۆمبس لە ئەمریکا دۆزییەوە لەلایەن ئیسپانییەکانەوە خاوەندارێتییان ڕاگەیەنرا، ئەگەرچی کۆلۆمبس ئاگاداری ئەوە نەبوو کە کیشوەرێکی نوێی دۆزیوەتەوە. ئامریکۆ ویسپۆسی خەڵکی فلۆرەنس کە بەشی باکووری ئەمریکای دۆزییەوە، یەکەمین کەس بوو کە پەی بەو بابەتە برد. هەرئەوەش وایکرد وەک ڕێزێک ئەو کیشوەرە بەناوی ئەوەوە بکرێت. پاش ئەوان

له سەرەتای سەدەی شازدەدا فێردیناند ماجەلانی پرتوگالی ڕێگەی باشووری ڕۆژئاوای لە ئەوروپاوە بۆ ڕۆژهەڵاتی دوور دۆزییەوە و بەوجۆرە سەلماندی کە زەریای ئەتڵەسی و گەورە پێکەوە لکاون. لە مێژوودا ئەوە یەکەمین گەشتی دەریایی بوو بەدەوری جیهاندا(١٨). دوای دۆزینەوە جوگرافییەکان ئەوروپییەکان زێڕ و سامانێکی زۆریان چنگ کەوت، کەڵکەبوونی سامان ژیانی نزمی ئەوروپییەکانی گۆڕی(١٩).

لێرەوە ئیسپانیا و پرتوگالییەکان بوون بە یەکەمین ئیمپراتۆریەتە داگیرکەرەکان، کە کێبڕکێی بازرگانی – دەریایی و داگیرکاری لە نێوانیاندا پەرەیسەند. بۆ خۆپاراستن لە پێکدادانیان، هەردوولا لە ساڵی ١٥٢٩ ڕێکەوتنێکیان ئەنجامدا، بەپێی ئەو ڕێکەوتنە جیهانیان لە نێوان خۆیاندا دابەشی دوو بەش کرد. ئیسپانییەکان لە ڕۆژئاوا و پرتوگالییەکان لە ڕۆژهەڵات مافی داگیرکردنی وڵاتان و بەکۆڵۆنیکردنیان بەخۆیاندا. ئەوە یەکەمین دابەشکردنی داگیرکارییانەی جیهان بوو(٢٠).

پرتوگالییەکان لە ناوچە دۆزراوەکان چەند مەڵبەندێکی بازرگانییان دامەزراند کە لەڕاستیدا بریتی بوون لە ناوەندەکانی بازرگانی. لە چارەکی یەکەمی سەدەی شازدە پرتوگالییەکان کەناراوەکانی ڕۆژئاوا و تاڕادەیەک ڕۆژهەڵاتی هیند و مالاگایان خستە ژێر چاودێری خۆیانەوە. لەلایەکی ترەوە پرتوگالییەکان بەداگیرکردنی شارەکانی عەدەن و گەرووی هورمز ڕێگا بازرگانییە کۆنەکانیان لە دەریای سوورەوە بە ئەسکەندەرییە و لە ڕێگای نێوان میسۆپۆتامیاوە، هیندستانیان بە سووریاوە بەستەوە. هەروەک بەشێکی بەرچاویان لە دوورگەکانی سوند، ئەندەنووسیا و بەڕازیل داگیرکرد و بەوجۆرە ئیمپراتۆریەتێکی گەورەیان دامەزراند(٢١).

دواتر هاتن چەندین بنکەی بازرگانییان بەدرێژایی کە ناراوەکانی خۆرئاوای ئەفریقا و هیندستان و ئەندەنووسیا دامەزراند. لێرەشەوە دەستیاندایە بازرگانی بەهارات و هاوکات هەستان بە دامەزراندنی بازرگانی کۆیلەی ئەفریقی و ڕەوانەی جیهانی نوێیان دەکرد. شانبەشانی پرتوگالییەکان هۆڵەندییەکانیش هەستان بە دامەزراندنی چەندین یەکەی بازرگانی لە هەریەک لە ئەندەنوسیا و سریلانکا(٢٢).

هەرچی سەبارەت بەجیهانی نوێیە، هێشتا لە ڕێی ئەم فۆرمەی داگیرکاریدا بوو، بۆیە لە دەستپێکدا ئیسپانییەکان هاتنە ناوەوە، ئەوانیش لە جیهانی نوێدا کەوتنە کار و توانیان ئیمپراتۆریەتێکی مەزن لە ناوەند و باشووری ئەمریکادا دابمەزرێنن، هاوکات خواستی بەشێکی بەرفراوانی ئەمریکای باکوور لە بەرنامەیاندا بوو. لێرەوە ئەمریکییە بوومی و ڕەسەنەکانی ناوەند و باشووری ئەو کیشوەرە بەدڕندانەترین شێوە ملکەچ کران. هەروەها پرتوگالییەکان توانیان دەستبگرن بەسەر بەڕازیلدا و وەک داگیرگەی شەکر ناویان دەبرد، هاوکات ژمارەیەکی بەرچاو کۆیلە و بەندەیان لە ئەفریقاوە گواستەوە بۆ ئەو ناوچەیە(٢٣).

بێگومان پەرەسەندنی کۆلۆنیالیزم بەشێوەیەکی توند و بەردەوام، بۆخۆی ڕکابەرایەتی کۆلۆنیالیستەکانیشی بەدواوە بوو(٢٤). چونکە ململانێی نێوان ئەم دوو وڵاتە تەواو نەبوو، داگیرکەری دیکەی بۆ سەربار بوو، هۆڵەندا و بەریتانیا و فەرەنساش بەدوای یەکتردا لە گۆڕەپانی ململانێی داگیرکاریدا دەرکەوتن(٢٥). ڕەوتە فراوانخوازییەکە لە سەدەی شازدەیەمەوە دەستپێکردبوو و لە سەدەی حەڤدە و هەژدەیەمدا بەئارامی درێژەی کێشابوو(٢٦).

بەشێوەیەک لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەدا، هۆڵەندیی و ئینگلیزەکان وەک نێوەند بۆ گەشەکردنی سەرمایەداری لە ئەوروپا دەرکەوتن(٢٧). پرۆژە بەریتانی و هۆڵەندییەکە لە خۆرهەڵاتی گۆی زەویدا، بەخێراییەکی زۆر بەرفراوان دەبوو کۆمپانیا خۆرهەڵاتییەکانی هیند، لە دەوروبەری ساڵی ١٦٠٠ دروستبوون و لە ساڵی ١٦٥٠دا هۆڵەندییەکان و بەریتانییەکان پێکەوە، کۆنترۆڵی زۆربەی بازرگانی نێودەوڵەتییان کرد - بازرگانی ناهاوشان، واتە بازرگانییەکی نیمچە یستی لەگەڵ ئاسیادا، وێڕای بازرگانی کۆیلە لە ئەفریقادا. لە هەمان ئەوکاتە خۆیدا پرۆژەی ئیسپانی بەری خۆی دا، لە شێوەی کەڵەکەبووی گەورە لە ئەمریکا(٢٨). چونکە ئیسپانییەکان خەزێنەی دانیشتوانە ڕەسەنەکەی ئەمریکایان تاڵانکرد و لەگەڵێشیدا کەوتنە سڕینەوەی سیما شارستانییەکانی جیهانی نوێ بەتایبەتی لە پیرۆ و مەکسیک، دواتریش بە بەکارهێنانی چەکی باشتر و مسیۆنێرە کاسۆلیکەکان زۆرترین بەشی ئەمریکای لاتینیان ڕاستەوخۆ خستە ژێردەسەڵاتی خۆیانەوە(٢٩).

ئەوە سەرباری ئەوەی ئیسپانییەکان بەردەوامبوون لە ناردنی بەلێشاوی زیو و بڕێک زێڕ بۆ ئەوروپا، لە نیوەی یەکەمی ئەو سەدەیەدا، هەروەها کێڵگە پرتوگالییەکان لە بەڕازیل و چالاکییە بازرگانیەکانیان لە ئاسیەت بەردەوامبوون لەوەی ببن بە سەرچاوەی گرنگی کەڵەکەبوون، ئەوا فراوانبوونی سەرەکی پرۆژەی یستی دوای ١٦٠٠ز هۆڵەندیی و ئینگلیزەکان بوون(٣٠). دواتر بەریتانییەکانیش توانیان کەناراوەکانی ئەمریکای باکوور بۆ خۆیان مۆنۆپۆڵ بکەن(لەکۆتاییدا ئەو ناوچەیە دوانزە کۆلۆنی لێکەوتەوە)، هەروەها چەند دوورگەیەکیش لە دەریای کاریبی وەک داگیرگەی شەکر دامەزران. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا لە بەریتانیا چەمکی ئیمپریالیزم بە سیاسەتێک دەگوترا کە بیەوێت قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریتی بەریتانیا لەپێناو بەرژەوەندییە بازرگانی و داراییەکەیدا بەرفراوان بکات، یاخود ئاماژە بوو بۆ سیاسەتێک کە بیەوێت کار و بەرنامەی هەرێمایەتییانەی ئەندامی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا لەسەر کۆمەڵێک مەسەلەی وەک: کاروباری بەرگری، بازرگانی ناوخۆی ئیمپراتۆریەتەکە و زۆر شتی تر چڕبکاتەوە(٣١).

هەرچی فەرەنسایە وەک وڵاتێکی بەهێز شوێن پەنجەی خۆی لە جیهانی نوێدا

دیاریکرد و توانی لە کەنەدای ئەمڕۆدا داگیرگەی خۆی دابمەزرێنێت، هەروەک لە دەریای کاریبیشدا چەند دوورگەیەک بۆ خۆی بپچڕێت(٣٢).

لە سەدەی حەڤدە هۆڵەندا دوای سەرکەوتنی بەسەر ئیسپانی و پرتوگالییەکاندا بوو بە یەکێک لە گەورەترین ئیمپراتۆرییە داگیرکەرەکان. سەرکەوتووەکان(بازرگانە هۆڵەندییەکان) لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٦ دزەیان کردبوویە ئەو ناوچانە. کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات ساڵی ١٦٠٢ دامەزرا(تا ساڵی ١٧٩٣ کاری کرد و بەردەوام بوو). ئەو کۆمپانیایە دەستی گرتبوو بەسەر بازرگانی زەریاکانی هیند و هێمن. بازرگانە هۆڵەندی و بەکرێگیراوەکانیان خەڵکی ئەندەنووسیایان بە دیلگرت و سەروەت و سامانی ئەو وڵاتە کەمەرەبییەیان بە تاڵان برد. ئەوان خەڵکی ئەو وڵاتەیان دەچەوساندەوە، بۆئەوەشی نرخی کاڵاکانیان دانەبەزێت گەڵێک لە بەرهەمەکانی ئەوانیان دەسوتاند. دواتر هۆڵەندییەکان بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی خۆیان لە کیشوەری ئەمریکا کۆمپانیای هیندی ڕۆژئاواشیان دروستکرد(٣٣). ئەو باڵادەستییەی هۆڵەندییەکان وایکرد کە ئەمستردام ببێت بە ناوەندێکی گرنگی بازرگانی و ماڵی لە ئەورووپادا(٣٤).

نابێ ئەوەش لەبیر بکەین، یەکێک لە پیشە سەرەکی و بەرچاوەکانی داگیرکەرە ئەورووپییەکان بازرگانی کۆیلە بوو. بەنمونە هۆڵەندییەکان لە ئەندەنووسیا کۆمەڵێک زیندانی شاراوەیان هەبوو، کە تیایاندا منداڵانی دزاو وەردەگیران هەتا بە تەمەنی هەرزەکاری دەگەن و دواتر دەیانفرۆشتن. هەرچی ئەفریقایە وەک ئەنباری پاشەکەوتی ڕاوی کۆیلەی لێهاتبوو، کۆیلە ئەفریقاییەکان زیاتر لە ئەمریکا دەفرۆشران(٣٥).

لەگەڵ هاتنی نیوەی سەدەی حەڤدەیەم، گۆڕانکارییەکان لە ئەوروپا زۆر خێرا و لەسەر ئاستێکی زۆر ڕوویان دەدا، گۆڕانکارییەکی گەورە لەو ماوەیەدا لە پێگە و هێزی یستی فەرمی و نافەرمی بۆ هەردوو کیشوەری ئەمریکا و لە دەوروبەری کەناراوەکانی ئەفریقا و ئاسیا ڕوویدا(٣٦). وڵاتانی باکووری ڕۆژئاوای ئەوروپا جێگەی یستەی پێشوو واتە پرتوگالی و ئیسپانی و ڤینسییەکانیان گرتەوە و بەڕێگەیەکی سیستماتیکدا و لەسەر بنەمای بازرگانی یارمەتیدراو دەستیانکرد بە گرتنی ناوچەی دیکە و دەستبەسەرداگرتنی کۆلۆنییە کۆنەکان(٣٧). لەو ڕووەوە هۆڵەندییەکان، پرتوگالییەکانیان ناچار بە چۆڵکردنی بەشی باشووری ئەفریقا کرد و کۆلۆنی خۆی لەو ناوچەیە دروستکرد. دواتریش لە ساڵی ١٦٥٦ هۆڵەندییەکان توانیان پرتوگالییەکان لە سیلان دەربکەن. بەڵام هۆڵەندا زیاتر وڵاتێکی بازرگانی بوو هەتا پیشەسازی و لە ململانێی توند لەگەڵ بەریتانیادا کە وڵاتێکی پیشەسازیی و پێشکەوتوو بوو خۆی ڕانەدەگرت. بەتایبەت لەکاتی شەڕەکانی نێوان هەردوو وڵات، بەریتانیا جێگای هۆڵەندییەکانی لە ئەمریکای باکوور گرتەوە.

دوای دەرکەوتنی داگیرکارانەی بەریتانیا لەگەڵ دوو دوژمنی تەقلیدی کە ئەوانیش

ئیسپانی و پرتوگالییەکان بوو ڕووبەڕووبوویەوە، کەشتییەکانی بەریتانیا بەبێ گەڕانەوە بۆ حکومەتەکانیان و ڕاگەیاندنی شەڕ هێرشیان دەکردە سەر ئەو کەشتیانەی ئیسپانیا کە لە نێوان ئەوروپا و ئەمریکادا هاتوچۆیان دەکرد و تالآنیان دەکردن. بەگشتی ئامانجی بەریتانیا لە شەڕەکانیدا لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپا لێدانی نەیارەکانی و ڕێگەخۆشکردن بوو بۆ خۆی بەمەبەستی جێگەگرتنەوەیان لە داگیرگەکاندا.

هەرچی سەبارەت بە فەڕەنسایە کە پێشتر سەرمایەداری لەو وڵاتەدا بەخێرایی لە گەشەکردندا بوو، وەک مێملی سەرەکی بەریتانیا دەهاتە ئەژمار. لە سەدەکانی ١٧و١٨ فەڕەنسییەکان ئیمپراتۆریەتی داگیرکارانەی خۆیان بە داگیرکردنی کەنەدا، هیند و چین و بەشێک لە هیندستان دامەزراند. هەربۆ ئەو مەبەستە فەڕەنساش کۆمپانیایەکی هیندی ڕۆژهەڵاتی دامەزراند(٣٨).

لە سەدەی هەژدەدا ململانێی سیاسی زیاتر لە نێوان بەریتانیا و فەڕەنسادا بوو. بەریتانیا بەدوای قازانجە نەتەوایەتییەکانیدا بوو و فەڕەنساش بەدوای قازانجەکانی دەربارەوە بوو(٣٩). بەریتانییەکان دوای شکستپێهێنانی ئیسپانییەکان داگیرگەکانی خۆیان لە ئەمریکا زیاتر کرد و چوونە ویلایەتی فلۆریداوە، دواتر بەریتانیا دەستیگرت بەسەر کۆلۆنییەکانی فەڕەنسا لە کەنەدا، هەروەها چەند ناوچەیەکی لە هیند داگیرکرد. دەرکردنی فەڕەنسییەکان لە هیند و شەڕەکانی تری لەگەڵ مێملەکانیدا لەلایەن (کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات(٤٠))ییەوە بەڕێوەچوو، کە لە ساڵی ١٦٠٠وە دامەزرابوو. جێی خۆیەتی کە بڵێین، لە بابەتی ڕووتانەوە و سیاسەتی توتدوتیژیدا لە داگیرگەکان کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی هیچی وای لە ئیسپانییە داگیرکەرەکان کەمتر نەبوو(٤١). بەوجۆرە بەریتانیا دەستی بەسەر بەشێکی گرنگی بازرگانیدا گرت(٤٢). وەک دەسپێک ئەوروپییەکان لە سەرەتاوە هەماهەنگییان کرد لەگەڵ فەرمانڕەوا لۆکاڵییەکانی ئەندەنوسیا و هیند و چین و یاباندا و لە هەموو ئەو شوێنانەدا فۆڕمێک لە بازرگانی و ئاڵوگۆڕ لە نێوان ئەوان و دەسەڵاتە ناوچەییەکاندا دروست بوو، بۆیە ئەو دەسەڵاتە لۆکاڵییە(٤٣) لەگەڵ ناوەندە بازرگانییە کەناراوییەکانی ئەوروپادا برەویان بە بازرگانیدا(٤٤).

لێرەوە ناکرێت لەو فرەییە گەورەیەی سەرچاوە سەربارەکانی کەڵەکەبوونی سەرمایە لە دەرەوەی ئەوروپا بێئاگابین، لەوانە دەرهێنانی سامانەکانی ناوەوە و سەرەتاکانی نیشتەجێبوونی ئەوروپییەکان لە ئەمریکای باکوور و بازرگانی کۆیلە و چەتەگەریی دەریایی ..هتد(٤٥). یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای وڵاتە ئەوروپییەکان ئەوەبوو کە هاوکات لەگەڵ ئەوەی سەر بە کەرتی تایبەت بوون

پشتیوانییەکی بەهێزیان لەلایەن دەوڵەتەوە لێ دەکرا. هێزی دەریایی و سوپا و چەک پارێزگاری لە چالاکییەکانی ئەو کۆمپانیایە دەکرد(٤٦). چونکە وڵاتە ئەورووپییەکان کۆمپانیاکان و بانکەکانیان بەکاردەهێنا بۆ ڕێخۆشکردن و دواتر دەستگرتن بەسەر ئابووریی و خاکی وڵاتاندا، وڵاتە بچووکەکان لە ڕێگەی ئەم کۆمپانیانەوە داگیردەکران، بەنموونە جەزائیر کەوتە ناو تەڵەی فەرەنساوە کاتێک داوای قەرزەکانی خۆی لە فەرەنسا کرد، میسریش بەهۆی ئەو قەرزانەی کە لە بەریتانیا و کۆمپانیاکانی ئەو وڵاتە وەریگرتبوو کەوتە ژێر هەژموونی ئیمپریالیزمەوە(٤٧).

ئەوە لەکاتێکدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا ناوچەکانی ئەفریقا و ئاسیا بەتەواوی بوونە ئامانجی وڵاتە ئیمپریالیستەکان، ئەورووپییەکان کاتێکی زۆریان ویست هەتا شارەزای جوگرافیا و ڕەوشی ئابووریی و کۆمەڵایەتی ئەو ناوچانە بوون بەتایبەت لە ئەفریقا، دوای کۆکردنەوەی زانیارییەکان ئیدی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە شەپۆلی داگیرکاری وڵاتە ئیمپریالیستەکان بەچڕی دەستیانپێکرد(٤٨). بەشێوەیەک لە چەند دەیەی کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هۆی ئابووری لە ڕێکخستن و پتەوکردنی شێوەی کۆلۆنیالیزمدا ڕۆڵێکی چارەنووسسازی هەبوو. هەرلەم قۆناغەشدا وشەی (ئیمپریالیزم) لینین بە بەرهەمی تێکەڵبوونی دەستمایەکانی بانک و پیشەسازی دەزانی و لەپێناسەی کۆلۆنیالیزمدا بەکاردەهێنرا(٤٩).

ماوەتەوە کە بڵێین، لە پرۆسەکانی کاری بازرگانیدا پاشاکان و چینی بازرگان هاوکار و هەماهەنگ بوون، وەک چۆنا بازرگانان یارمەتی پاشاکانیان دەدا، هەربەوچەشنەش پاشاکان هاوکاری بازرگانانیان دەکرد، پاشاکان بە دەرکردنی یاسا و ڕێنماییەکانیان ئەو ڕێوشوێنانەیان دانا کە زامنی بەدیهاتنی زۆرترین قازانجی بۆ بازرگانەکان دەکرد(٥٠). ئەو هاوکارییە گەیشتە ئاستێک وڵاتانی ئیمپریالیستی لەگەڵ بازرگانانی وڵاتەکانیاندا لە دامەزراندنی بەشێکی زۆری ئەو کۆمپانیا تایبەتییانەی کە کاری بازرگانیان لەگەڵ کۆلۆنییەکاندا دەکرد، بەشدارییان کرد(٥١).

بەکورتی، ئەو سستەمەی کە بەو جۆرە ڕواڵەتەکانی لە ناوەڕاستی سەدەی شانزدەیەمەوە دیاریکرا، بە(سستەمی سەرمایەداری) ناونرا. وەک دەبینین ئەو سستەمە لە سەردەمەکانی دواتردا پەرەسەندنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی. بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی شازدەوە هەتا سەدەی هەژدە، بازرگانی چالاکی سەرەکی دیاری ئەو سستەمە بوو، پیشەسازی بوو بە پاشکۆ و لە خزمەتی بازرگانیدا بوو، لەبەرئەوە، ئەو ماوەیە ناونرا(سەرمایەداری بازرگانی)(٥٢).

**بەشی دووەم/ کاریگەری شۆڕشی پیشەسازی لەسەر پەرەسەندنی پرۆسەی داگیرکاری**

**باسی یەکەم/ کاریگەری شۆڕشی پیشەسازیی لەسەر پەرەسەندنی ململانێ داگیرکارییەکان:**

لە ساڵی ١٧٤٠وە بازرگانی ئەوروپا پێی نایە قۆناغێکی بەرز لە گەشەسەندن و ڕمێن، ژمارەی دامەزراوە بازرگانییەکان لە پشتی دەریاکان ڕوویان لە زیادبوون کرد. لەلایەکی دیکەوە گیروگرفتی ناوخۆیی تێپەڕ کردبوو و ببوو بە خاوەن سستمێکی سیاسی سەقامگرتوو لەسەر بنەمای کۆمەڵگەیەکی مەدەنی. لەکاتێکدا فەڕەنسا پاش لویسی چواردەیەم دوچاری سستی و گەندەڵی ببوو، تا ئەو ئاستەی ژنانی دەرباری لویسی پازدەهەم دەستیان لە کاروباری سیاسی وڵات وەردەدا(٥٣).

شۆڕشی پیشەسازی بووبە هۆی زیادبوونی شتوومەک، بۆیە کاپیتالیستەکان هەوڵیان دەدا بازاڕی نوێ بۆ شتوومەکەکانیان بدۆزنەوە. ئەو دەمە گەلانی داگیرگەکانیش زۆر هەژار و بێ دەرامەت بوون و نائاگا کەوتنەژێر هەژموونی شتوومەکی ئەوروپییەوە. تا ئەوکات بازرگانی ئەڵمانیا بە داگیرگەکانیشییەوە تەنها لە ١٪ی کۆی بازرگانی نێونەتەوەیی دەگرتەخۆ. فەڕەنساش شمەکی لە داگیرگەکانەوە دەهێنا لەبری ئەوەی کە پێیان بفرۆشێت. نمونەی ئەو کەرەستە خاوانەی کە بەتێکڕا لە داگیرگەکانەوە دەگوازرانەوە بۆ وڵاتانی پیشەسازی بریتی بوون لە: کەڵبەی فیل(عاج) و پلاستیک لە کۆنگۆوە، ئەڵماس لە ئەفریقای باشوور و کاکاو لە نەیجیریا، چا لە چین و سریلانکا، کەتان لە هیندستان و بەهاراتیش لە ئەندەنووسیاوە(٥٤).

بەریتانیا لە ترسی هەڵپەی ئەڵمانیا و فەڕەنسا بۆ هەژموونی زیاتر بەتایبەتی لە دوای ساڵی ١٨٨٠وە نیگەرانی ڕووی لێنابوو. هەموو ئەو ئیمپراتۆریەتانە وایان لێکدەدایەوە گەر هەڵپە نەکەن، بەهۆی بەندوباوی گومرگی و باج و سنوورە گەمارۆدراوەکانیانەوە ئاوا دەبن، هاوکات لەوانەیە دەرفەتە ئابوورییەکانیشیان لەدەست بدەن. لێرەوە کێبرکێ و پشێوی لە نێوان زلهێزەکاندا هاتە ئاراوە، بەتایبەتی بەریتانیا و هەموو ئەوانەی تر کە خاوەنی داگیرگە و هەژموون بوون، لە کۆتایشدا هەریەک لە ئەڵمانیا و ئیتالیا زیاتر هاتنە نێو ململانێکانەوە(٥٥).

بەپێی یاساکانی یەکێتی، دوور لە (تەعریفەی) گومرگی لە ساڵی ١٧٠٧ بەریتانیا و سکۆتلەندا بازاڕی یەکگرتوویان دامەزراند، ساڵی ١٨٠٠ ئیرلەنداش چوویە پاڵیان و باکی لۆکاڵی فراوانتریان دایە پیشەسازی بازرگانی بەریتانیا، ڕێگەی بازرگانییان بۆ تەواوی ئەوروپا و باکووری ئەفریقا و ئاسیا کردەوە. هیندیش ڕێژەیەکی زۆری کاڵای بەریتانی بەتایبەتی بەرهەمەکانی لۆکە دەکڕی. کانتۆنە ئیسپانی و ئەمریکییەکانیش بازاڕەکانی خۆیانیان بەڕووی بازرگانی بەریتانیادا کردەوە، ڕێژەی بازرگانییەکە لە ماوەی شۆڕشی فەڕەنسی و جەنگەکانی ناپلیۆندا بازرگانی بەریتانیا لەگەڵیاندا زیادی کرد(٥٦).

لەگەڵ گەشەسەندنی هەرچی زیاتری شۆڕشی پیشەسازیدا، بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە ململانێی بەهێز لە نێوان خاوەن پڕۆژە گەورەکان و بچووکەکاندا هاتە ئاراوە، پرۆژە گەورەکان توانیا پرۆژە بچووکەکان لەناو ببەن، خاوەنی پرۆژە گەورەکان لە بەریتانیا و ئەمریکا و ئەڵمانیا و وڵاتانی تر، لەنێو خۆیاندا ڕێکەوتن ڕکەبەری نەکەن و ببنە یەک و کۆمپانیای گەورە دابمەزرێنن و لە یەک کاتدا قۆرخی تەواوی هێزی کار و بازاڕ و کەرەستەی خاو بکەن. دوای ئەوەی سەرمایەکان لە بازاڕە ناوخۆییەکانی وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا خرانە کاری پڕۆژەکانەوە، هێشتا بڕێک سەرمایە مابوویەوە، بۆیە سەرمایەداران بەدوای شوێنێکدا دەگەڕان لە دەرەوەی وڵاتانی خۆیان تیایدا بیخەنە گەڕ و سوود لە کەرەستەی خاو وەربگرن کە لە دەرەوەی ئەوروپا دەستدەکەوتن و پرۆژەکانیان پێویستییان پێیان بوو، لەگەڵ بازاڕێک لە دەرەوەی ئەوروپا، بۆ ساغکردنەوەی ئەو کاڵا زیادانەی کە لە پێویستی وڵاتانی خۆیان زیاتر بوو(٥٧).

> **وڵاتە ئەورووپییەکان کۆمپانیاکان و بانکەکانیان بەکاردەهێنا بۆ ڕێخۆشکردن و دواتر دەستگرتن بەسەرئابووریی و خاکی وڵاتاندا، وڵاتە بچووکەکان لە ڕێگەی ئەم کۆمپانیانەوە داگیردەکران**

بەگشتی گەڕان بەدوای بازاڕ و قازانجدا و فراوانبوونی بازرگانی دەرەکی پاڵنەری بەهێز بوون بۆ دەرکەوتنی ئیمپریالیزم، واتا پاڵنەری ئابووری بزوێنەری سەرەکی ئەم دیاردە جیهانییە نوێیە بوو(٥٨). هەموو ئەمانە کە لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازییەوە دروستبوون، بوونە هۆی زیادبوونی خواستی داگیرکاری نوێ لە دەرەوە، وڵاتانی خاوەن پیشەسازی پێشکەوتوو ئەو کانتۆنانەی کە بە دوایاندا دەگەڕان لە ئەفریقا و ئاسیا دەستیانکەوت(٥٩). لەلایەکی تریشەوە زیابوونی باج لە ئەوروپا هۆیەکی تری سەرەکی زیادبوونی پرۆسە داگیرکارییەکان بوو لە دەرەوە، کاتێک هەلی دەستخستنی قازانجی زیاتر لە بازاڕە ناوخۆییەکاندا کەمبوویەوە، ئەو وڵاتانە ڕوویان لە کانتۆنەکان کرد، بۆ دۆزینەوەی قازانج زۆر ڕێگە و شێوازیان گرتەبەر، ئەڵبەت پاراستن و قۆرخکردن و سودلێوەرگرتن و کەمکردنەوەی کرێ پێکەوە پێویست بوون بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی قازانجکردن.

بەریتانیا و فەرەنسا سودیان لە سەرمایەی زۆر و سستەمی بانکی و کڕین و فرۆشتنی وەبەرهێنان وەرگرت، لەو ڕووەوە کانتۆنەکان باشترین دەرفەت بوون بۆ

زیادبوونی بڕی قازانجەکانیان(٦٠)، ئەوەش هانی زۆریدان لە کانتۆنەکاندا سەرمایەکانیان بخەنەگەڕ، زلهێزەکانیش بە سیستەمی پارسەنگی هێز دەیانپاراستن و بازرگانیش ڕۆڵی گەورەی لە پرۆسەی داگیرکاریدا هەبوو، بەشێوەیەک لە هەر ناوچەیەکدا ئاڵای داگیرکەر بەرزبکرایەتەوە بازرگانی ئەو ناوچەیەش قۆرخی بازرگانانی دەوڵەتە داگیرکەرەکە بوو، ڕوونتر بڵێین ئەوە تێڕوانینی تەواوی بازرگانان بوو لەو ناوچانەی کە دەکەوتنە بن کۆنترۆڵی حکومەتەکانیانەوە.

تۆمارە دیپلۆماسییەکان ئاماژە بە کۆمپانیا و بازرگانانی وڵاتەکانیان دەدەن (بەنمونە کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی) کە داوایان لە حکومەتی وڵاتەکەیان کردووە بەرژەوەندی بازرگانی و پاراستنی دیپلۆماسی و سەربازییان بۆ دابین بکەن. لەلایەکی ترەوە ناکۆکییەکان لەسەر بازاڕی چین لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم و، سیاسەتی دەرگای کراوە لە بازرگانیدا، نیشانەن بۆ گرنگیدانی وڵاتانی ئەوروپا بۆ دابینکردنی بارودۆخیک کە خزمەت بە بازرگانانی ئەوروپا بکات. ئەگەرچی ڕووسیای قەیسەری هاوسێی چین بوو، بەڵام نەیدەتوانی کێبەرکێی بازرگانانی بەریتانیا و فەڕەنسا و ئەمریکا بکات لەو وڵاتە. ئەوەی زیاتر پەرەیدا بە پرۆسەی داگیرکاری، پێشکەوتنی زیاتری پیشەسازیی و زۆربوونی بڕی بەرهەم بوو، بازاڕەکانیش گەورە بوون، دواتر مەسەلەی دەستخستنی کەرەستەی خاو هاتە گۆڕێ، لەوەش زیاتر قۆرخکردن سەریهەڵدا، ئەوەش هەوڵێک بوو بۆ بێبەشکردنی وڵاتانی تری پیشەسازی. سەرەتا لە کانتۆنەکاندا بەرهەمهێنان تەنها کەرەستەی کشتوکاڵی گرتەوە، بەڵام لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە وڵاتە پیشەسازییە داگیرکەرەکان ڕوویان کردە کەرەستە خاوەکانی تر و دەرهێنانی کانزاکان، داگیرکەران بەشێوەیەکی ترسناک کەوتنە ڕووتاندنەوەی سامانی کانزایی داگیرگەکانی ژێردەستیان. لەو ڕووەوە ئەو تاڵانییەی لە ڕۆژئاوای ئەفریقا و کۆنگۆ کردییان نمونەیەکی دیاری ئەم حاڵەتەن(٦١).

سیاسەتی کۆلۆنیالیستی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا بەجۆرێک بە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتانی ئەوروپاوە گرێدرابوو کە دەکرێ بڵێین هەر ئاڵوگۆڕێک لە پەیوەندییەکانی ئەم وڵاتانەدا بەڕێکەوتن و ڕکەبەرایەتی ئەوان لە بارەی کۆلۆنییەکانەوە گرێدرابوو. لەلایەکی دیکەوە شکست یان سەرکەوتنی دەوڵەتە ئەوروپییەکان لە کۆلۆنیاکاندا ڕاستەوخۆ کاری دەکردە سەر بارودۆخی ناوخۆی ئەو وڵاتانە(٦٢).

لە کۆتاییدا دەڵێین، لە هەموو قۆناغەکاندا فاکتەری ئابووری داینەمۆی سەرەکی بەهێزکردنی دەسەڵاتی داگیرکەران بووە لە داگیرگەکانیاندا، هەروەک ڕاکردن بەدوای کەرەستەی خاویشدا هەروا لەخۆڕا نەبووە و هەمیشە بەپێی پلانێکی ستراتیژی بەڕێوەچووە(٦٣).

**باسی دووەم/ دەرهاویشتەکانی پەیوەندی بازرگانی لە نێوان وڵاتانی داگیرکەر و داگیرکراو:**

هاتنە ناوەوەی ڕێژەیەکی زۆر کاڵا بۆ ناو وڵاتانی ژێردەستە پەیوەندییەکانی نێوان پارە و کاڵای دامەزراند. دەرەبەگ و سەرۆک خێڵە ناوچەییەکان دەستیانکرد بە بەکارهێنانی زیاتر لە پێشووی بازاڕ. ئەو بابەتە بووە هۆی پەرەسەندنی چەوساندنەوە جوتیاران، هەژاریی و ماڵوێرانی زۆربەیان. لەژێر گوشاری ڕاستەوخۆی سەرمایەداری دەرەکیدا، سیاسەتی داگیرکارانە و دەرەبەگ خەڵکی ئەو ناوچانە ناچار بە بەرهەمهێنانی ئەو کاڵا و شمەکانە کران کە بازاڕی سەرمایەداری پێویستی پێیان بوو، لەگەڵ فرۆشتنیان بە نرخێکی کەم.

بەلێشاو تێرژانی بڕێکی زۆر لە کاڵای پیشەسازی وڵاتانی داگیرکەر بۆ ناو کۆڵۆنی و نیمچە کۆڵۆنییەکان، شکست و داڕووخانی پیشەسازییە دەستییە خۆماڵییەکانی لە داگیرگەکاندا لێکەوتەوە، چونکە توانای کێبەرکێیان لەگەڵ کاڵای وڵاتە پیشەسازییەکاندا نەبوو، بەمجۆرە فرۆشتنی بەرهەمەکانی وڵاتانی داگیرکەر، بەری بە گەشەی پیشەسازی وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین گرت. لەگەڵ ئەوەشدا بازرگانی نێوخۆی داگیرگەکان ڕووی لە دابەزین کرد بەوهۆیەشەوە بارودۆخی جوتیاران و پیشەگەرەکان و تەنانە بۆرجوای خۆجێیش جگەلە بەشێک لە بۆرجوای کۆمپرادۆر کە لە بازرگانی نێوان داگیرگەکان و خەڵکانی ژێردەستەدا ڕۆڵیان دەگێڕا بەرەو هەژاری زیاتر ڕۆیشتن(٦٤).

ماوەتەوە کە بڵێین، ئەگەرچی داگیرکاری لە سەردەمە کۆنەکانیشدا بوونی هەبووە، بەڵام لە سەردەمی سەرمایەداریدا، بەتایبەتی لەو قۆناغەدا کە سستمە کۆمەڵایەتیی و ئابوورییەکە گەیشتبووە دوایەمین قۆناغی خۆی(ئیمپریالیزم) گەشەی کرد.

سەرمایەی داگیرکەرانەی هێزە ئەوروپییەکان لە داگیرکاریی و بەتاڵانبردنی گەلێک لە وڵاتان، چەوساندنەوەی دانیشتوانی خۆجێیی و دامەزراندنی بازرگانی قۆرخکراوی بازرگانە ئەوروپییەکان لەگەڵ وڵاتانی ئاسیا، ئەفریقا و ئەمریکای لاتین خۆی دەرخست. ئاکامی ئەو سیاسەتەش ڕژانی بەلێشاوی زێڕ و زیو و بەردە بەنرخەکان کاڵاکانی تر بوون بۆ ناو ئەوروپا، ئەوە خۆی بزوێنەرێک بوو بۆ گەشەی پەیوەندییەکانی پارە ـ کاڵا و کەڵەکەبوونی بڕێکی زۆر پارە لە دەستی کەسانی جۆراوجۆردا کە زەمینەی سەرەکی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری پێکهێنا.

بەوشێوەیە کرداری بازرگانی لە دوای دۆزینەوە جوگرافییەکانەوە پاڵنەرێکی بەهێز و سەرەکی بوو لە پرۆسە داگیرکارییەکانی وڵاتانی ئەوروپا لە دەرەوە، ئەم حاڵەتە دوای شۆڕشی پیشەسازیی و کەڵەکەبوونی سەرمایە پێی نایە قۆناغێکی جددی ترەوە و کرداری داگیرکاری خێراتر و فراوانتر کرد، شانبەشانی ئەوە میکانیزمەکانی وڵاتانی زلهێزیش بۆ ئەو کردارە زۆر و فرەجۆر بوون(٦٥).

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


١. د.محەمەد فاضل قەفتان: ڕژێمە ئابوورییەکان کۆمەڵگای تەکنەلۆژیای نوێ، ب١، چاپخانەی ئۆفیسی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٥، ل٩٨.
٢. ه.س، ل١٠٢-١٠٣.
٣. بەر لە جەنگی خاچپەرستەکان شارەکانی ئیتالیا پەیوەندی بازرگانییان لەگەڵ خۆرهەلاتی دەریای ناوەڕاست دروستکردبوو، بەلام لە دوای جەنگەکە ئەو بازرگانییە فاوانتر و گەشەسەندوتر بوو لە نێوان شارەکانی ئیتالیا و ناوچەکانی خۆرهەلات. (د.محەمەد محەمەد صالح: مێژووی ئەوروپا لە سەردەمی ڕێنیسانش تاوەکو شۆڕشی فەڕەنسی، و. ئارام محەمەد، دەزگای نارین، ٢٠١١، ل١٦٩-١٧٠)
٤. لبیب شقیر: مێژووی بیری ئابووری، و.فەیسەڵ عەلی، چ١، چاپخانەی تاران، ٢٠١٥، ل١٠٤.
٥. د.محەمەد محەمەد صالح: س.پ، ل١٦٩.
٦. د.محەمەد فاضل قەفتان: ڕژێمە ئابوورییەکان کۆمەڵگای تەکنەلۆژیای نوێ، ب١، چاپخانەی ئۆفیسی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٥، ل٩٨.
٧. شارەکانی ئیتالیا بەتایبەتی ڤینسیا، هەستابوون بە دامەزراندنی ناوەندی بازرگانی لە هەریەکە لە میسر و سوریا و ئاسیای بچووک. هەروەک لە پەیوەندی بازرگانی بەردەوامیشدابوون لەگەڵ بازرگانە مسوڵمانەکان. ئەمان پێداویستییەکانی خۆیان دەکڕیی و پاشان بە قازانجێکی زۆر بە ولاتانی ئەوروپایان دەفرۆشتەوە. (د.محەمەد محەمەد صالح: س.پ، ل١٧٨)
٨. د.محەمەد فاضل قەفتان: س.پ، ل١٠٨. د.محەمەد محەمەد صالح: س.پ، ل١٨١-١٨٨.
٩. ئەشرەف ساڵح مەحمەد سەعید: بنچینەکانی ڕێنیسانسی ئەوروپا، و.شیرزاد هەینی، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، ٢٠١٤، ل١٤٥.
١٠. بۆ زانیار زیاتر دەربارەی هەوڵەکانی پرتوگال و ئیسپانیا لە دۆزینەوە جوگرافییەکان بڕوانە: د.محەمەد محەمەد صالح: س.پ، ل١٨١-١٩١. ئەشرەف ساڵح مەحمەد سەعید: بنچینەکانی ڕێنیسانسی ئەوروپا، و.شیرزاد هەینی، ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە، ٢٠١٤، ل١١٠-١٣١.
١١. د.محەمەد فاضل قەفتان: س.پ، ل١٠٩.
١٢. د.محەمەد محەمەد صالح: س.پ، ل٢٠٣.
١٣ د.محەمەد فاضل قەفتان: س.پ، ل١٠٩.
١٤. ماجید خەلیل: ئیمپریالیزم و ئیمپریالیزمی نوێ، لە کتێبی(ئیمپریالیزم)، چاپخانەی حەمدی، لە بلاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا، ٢٠١٩، ل٦٤.
١٥. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: زەمینەی گەشەکردنی کۆمەلایەتی، و.ناسر حەقپەرست، چاپخانەی پیرەمیر، لەبلاوکراوەکانی دەزگای جەمال عیرفان، ٢٠١٣، ل٣٣٧-٣٣٨.
١٦. جەیمس مۆریس بلاوت: مۆدێلی یستی جیهانی، و.دلێر میرزا، چ١، چاپخانەی کەمال، لەبلاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان، ٢٠١٤، ل٣٥٧.
١٧. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٣٨.
١٨. ه.س ، ل٣٣٩.
١٩. د.ئەحمەد نەقیب زادە: مێژووی دیپلۆماسی و پێوەندییە نێونەتەوەییەکان(١٦٤٨-٢٠٠٤)، و.مستەفا مەعروفی، چ١، چاپخانەی خانی(دهۆک)، دەزگای توێژنەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٦.
٢٠. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤١-٣٤٢.
٢١. ه.س، ل٣٣٧-٣٣٨.
٢٢. ماجید خەلیل: س.پ، ل٦٤.
٢٣. سەنتەری ستراتیژی(تێبین): چەمک و گەشەسەندن

و جۆرەکانی ئیمپریالیزم لە کتێبی ئیمپریالیزم، چاپخانەی حەمدی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا، ٢٠١٩، ل٣٠.
٢٤. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل١٣٥.
٢٥. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤١-٣٤٢.
٢٦. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل١٣٦.
٢٧. جەیمس مۆریس بڵاوت: س.پ، ل٣٩٢-٣٩٣.
٢٨. ه.س، ل٣٩٤-٣٩٥.
٢٩. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٣٩- ٣٤٠.
٣٠. جەیمس مۆریس بڵاوت: س.پ، ل٣٩٢-٣٩٣.
٣١. سەنتەری ستراتیژی(تێبین): س.پ، ل٣٠.
٣٢. ماجید خەلیل: ئیمپریالیزم و ئیمپریالیزمی نوێ، لە کتێبی(ئیمپریالیزم)، چاپخانەی حەمدی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا، ٢٠١٩، ل٦٤-٦٥.
٣٣. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤١- ٣٤٢ ؛ د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل١٤.
٣٤. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل١٤.
٣٥ .د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤٢-٣٤٣.
٣٦. جەیمس مۆریس بڵاوت: س.پ، ل٢٩٢.
٣٧. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل٤٧.
٣٨. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤٢.
٣٩. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل٤٧.
٤٠. ئەم کۆمپانیایە نوینەرایەتی بنەماڵەی شاهانەی بەریتانیای دەکرد، کۆمپانیاکە پێکهاتبوو لە: بازرگانی ئینگلیز، دەلالان، پارەدەر(فەند)ەکان و لۆردە دەرەبەگەکان کە ئەوان وایانکردبوو بازرگانی ئینگلیزی و ی مومکین بێت. (ئانیا لومبا: یزم و پۆست یزم، و.عومەر عەلی غەفور، چاپخانەی تتران، دەزگای ڕۆشنبیری جەمال عیرفان، ٢٠١٦، ل٢٣)
٤١. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤٢.
٤٢. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل٤٧ ؛ ماجید خەلیل: س.پ، ل٦٤.
٤٣. ماجید خەلیل: س.پ، ل٦٤.
٤٤. سەنتەری ستراتیژی(تێبین): س.پ، ل٣٠.
٤٥. جەیمس مۆریس بڵاوت: س.پ، ل٣٩٤-٣٩٥.
٤٦. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤٢.
٤٧. د.عبدالعزیز سلیمان نوار و د.عبدالمجید نەعنەعی: مێژووی هاوچەرخی ئەوروپا لە شۆڕشی فەڕەنسییەوە هەتا جەنگی دووەمی جیهانی، و.خالید هەرکی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٣٣٦.
٤٨. د.عبدالعزیز سلیمان نوار و د.عبدالمجید نەعنەعی: س.پ، ل٣٣٦.
٤٩. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل١٣٦.
٥٠. لبیب شقیر: س.پ، ل١٠٨.
٥١. ه.س، ل١٠٨-١٠٩.
٥٢. ه.س، ل١٠٨.
٥٣. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل٤٧.
٥٤. ماجید خەلیل: س.پ، ل٨٠-٨١ ؛ د.سامان حسێن ئەحمەد: مێژووی ئەوروپا لە شۆڕشی فەڕەنسییەوە تاکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، چ١، نارین بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ٢٠١٤، ل٣٥٥.
٥٥. ماجید خەلیل: س.پ، ل٨٢.
٥٦. د.فازیل حسەین و د.کازم هاشم نعمە: مێژووی نوێی ئەوروپا(١٨١٥-١٩١٤)، و.مستەفا سەعید عەلی، چ١، چاپخانەی چوارچرا، ٢٠١٠، ل١١٧.
٥٧. د.سامان حسێن ئەحمەد: س.پ، ل٣٥٥. د.فازیل حسەین و د.کازم هاشم نعمە: س.پ، ل١٣٦.
٥٨. ه.س، ل٣٥٩.
٥٩. د.فازیل حسەین و د.کازم هاشم نعمە: س.پ، ل١٣٦-١٣٧.
٦٠. ه. س، ل١٤٠
٦١. د.فازیل حسەین و د.کازم هاشم نعمە: س.پ، ل١٤١.
٦٢. د.ئەحمەد نەقیب زادە: س.پ، ل١٣٨.
٦٣ د.فازیل حسەین و د.کازم هاشم نعمە: س.پ، ل١٤١.
٦٤. د.ک.میترۆپۆلیسکی و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٤٧.
٦٥. ه.س، ل.



بەڕێز عەباس

# شەرەفخانی بەدلیسی و مەلا مەحموودی بایەزیدی
# ڕۆڵیان لە نووسینەوەی مێژووی کورددا

کورد بە بەراورد بە گەلانی دەوروبەر و ناوچەکە درەنگ دەستی بە نووسینەوەی مێژووی خۆی کردووە، مێژوونووسان و توێژەران ئاماژەیان بە هۆکاری جیاواز کردووە لەم درەنگ کەوتنەوەی کورد لە نووسینەوەی مێژووی خۆی و بایەخدان بە ڕابردووەکەی. ئەو مێژووەشی کەم تا زۆر نوسراوەتەوە لەلایەن غەیرە کوردەوە نوسراوەتەوە کە ئەمەش وایکردووە بەشێکی گرنگی مێژووەکەی بە لێڵی و شاراوەیی بمێنێتەوە بەشێوەیەکی گشتی و بە تایبەتیتر مێژووی کۆنی و سەدەکانی ناوەڕاستی، ئەوانەشی مێژووی کوردیان نووسیوەتەوە لەناو باسکردنی مێژووە گشتیەکە و باسکردنی مێژووی گەلانیان ئاماژەیان بە مێژووی کورد و ڕووداوەکانیان کردووە نەوەک بەشێوەیەکی سەربەخۆ باسی مێژووی کوردیان کردبێت! تاوەکو لە سەردەمی نوێدا واتە لە سەدەی شازدەیەمی زایینییەوە بۆماوەی چەند سەدەیەک ژمارەیەکی مێژوونووسێکی کوردی دیاریکراو دەست دەکەن بە نووسینەوەی مێژووی کورد، لەناو ئەو مێژوونووسانەدا ئەوەی ئێمە لەم نووسینەدا ئاماژەیان پێدەکەین و ڕۆڵیان لە نووسینەوەی مێژووی کورددا باس دەکەین بریتین لە شەرەفخانی بەدلیسی کە ناسراوە بە باوکی مێژووی کورد لەگەڵ مەلا مەحموودی بایەزیدی.

## شەرەفخانی بەلیسی

«میر و مێژوونووسی کورد شەرەفخانی بەدلیسی لە گوندی (گریهروودی) کە دەکەوێتە نزیک شاری (قوم) لە ١٥٤٣/٢/٢٥ زاینی لەدایکبووە«(١).» سەر بە بنەماڵە و خێزانی ڕۆژەکییە«(٢)،» هەشت ساڵ بەر لە لەدایکبوونی شەرەفخان واتە لە ساڵ ١٥٣٥ی زاینیدا دەسەڵاتی عوسمانییەکان باوکی شەرەفخان (میر شەمسەدین) لەسەر تەختی میری لادەبەن، (میر شەمسەدین)یش لە ڕقدا دەچێتە پاڵ دەسەڵاتداریتی سەفەوییەکان، هەربۆیە شەرەفخان تەمەنی منداڵی و هەرزەکاری لەنێو کۆشکی شاو کوڕانی (شا تەهماسبی یەکەم) بەسەردەبات(٣).»شەرەفخانی کوڕی شەمسەدین خانی بەتلیسی لە تەمەنی نۆ ساڵیدا چووەتە قوتابخانەی شا تەهماسبی کوڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی کە تایبەت بووە بە کوڕانی گەورە پیاوان» (٤)،» سێ ساڵ لەوێ خوێندویەتی، بەڵام لەبەرئەوەی باوکی دەستی لە وەزیفە کێشاوەتەوە ئیدی شەرەفخان لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا لەباتی باوکی کراوەتە سەرۆکی تاقمی ڕۆژەکی کە لەگەڵ باوکیدا پەنایان بردبووە بەردەوڵەتی سەفەویی و بووە بە حوکمدار لە بەشێک ناوچەی (شێروان) لە قەفقاسیا، بۆیە نەیتوانیوە خوێندن لە قوتابخانەی شادا تەواو بکات، کاتێک حوکمداری ئەو بەشەی (شێروان)یش بووە لەسەر خوێندن بەردەوام بووە و هەر خوێندوویە و مامۆستای بۆ خۆی ڕاگرتووە تا خوێندنی تەواو کردووە یا نزیک بە تەواوبوون گەیاندووە(٥)،»ساڵی مردنی شەرەفخانی بەدلیسی، ١٦٠٣/ ١٦٠٤»ە(٦).

کتێبی مێژوویی» (شەرەفنامە) شەرەفخانی بەتلیسی بە زمانی فارسی دایناوە، ئەم شاکارە یەکێکە لە سەرچاوە بە نرخ و دەوڵەمەندەکان. شەرەفنامە بۆ مێژووی کورد، بنەماڵە فەرمانڕەواکانی کورد، میرنشین و دەرەبەگەکان و پەیوەندییە دەرەبەگەکییەکان تەرخانکراوە و سەبارەت بە پەیوەندی ناوخۆی بنەماڵە فەمانڕەواکانی کوردستان و پەیوەندییان بە حکومەتی شای ئێرانەوە زۆر بەڵگەنامەی سوودبەخشی تێدایە. بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی سیستمی دەرەبەگایەتی، هێزەکانی بەرهەمهێنان و داهاتی بنەماڵە فەرمانڕەواکان کەڵک لە شەرەفنامە وەردەگیرێ. شەرەفخان لە کتێبەکەیدا بایەخێکی تایبەتی بە شیکردنەوەی گوزەرانی کۆمەڵانی خەڵکی داوە، لە ژیانی جوتیارانی کۆڵیوەتەوە و بەگشتی ئەو شتانەی ئەو باسی کردوون ژیان و گوزەرانی کورد لە سەدە ناوەڕاستەکاندا دەردەخەن(٧)،»شەرەفخان بەیەکەم مێژوونووسی کورد دەژمێردرێت، بەشێکی زۆری مێژوونووسان، لەوانەی کە ویستویانە دەربارەی مێژووی ڕابردووی کورد بنوسن زۆربەیان سودیان لەو بەرهەمەی شەرەفخان وەرنەگرتبێت(٨)،»خوێندەوارێکی کورد، یا ڕۆژهەڵاتناسێک نییە ناوی (شەرەفنامە)و شەرەفخانی بەدلیسی نەبیستبێ کە تاوەکو ئێستە بە گەلێک زمان و بە دەیان جار کورت و درێژ دەربارەیان نووسراوە

ڕۆژهەڵاتناسی سۆڤێت بە گشتی و کوردناسی سۆڤێتی بەتایبەتی بایەخی دیار و شایانیان بە هەردوک بەرگی (شەرەفنامە)و دانەری داوە. ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسانی شورەوی لە نووسینەکانیاندا کەڵکیان لە (شەرەفنامە) وەرگرتووە، چ بۆ لێکدانەوەی مێژووی کوردستان و چ بۆ لێکدانەوەی مەڵبەندی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست(٩)،» شەرەفخانی بەتلیسی مێژووی تەواوی لە سەدەی شازدەیەمدا بۆ کورد دانا کە تایبەتە بە مێژووی دەوڵەت و ئیماراتە کوردییەکان ئەمەش یەکەم کتێبێکە کە لەسەر بنەڕەتی نەتەوەیی دەوڵەت و شۆڕشەکانی ئەوسا، کوردی بەسەرکردۆتەوە(١٠).

«بەپێی ئەو زانیارییانەی (ی. ڤاسیلیڤا) کۆی کردونەتەوە کۆنترین و بەنرخترین و ڕاسترین دەستنووسی زانراوی (شەرەفنامە) ئەو دانەیانە کە بە دەستوخەتی پیرۆزی شەرەفخان خۆی بەناوی (شەرەفنامەی تاریخی کوردستان)ەوە نووسراوەتەوە و ئێستە لە کتێبخانەی بودلیانی ئۆکسفۆرد هەڵگیراوە. ئەم دەستنووسە نایابەی (شەرەفنامە) بریتییە لە ٢٤٦ پەڕەو بە بیست وێنەی دەگمەن ڕازێندراوەتەوە کۆتایی زولحجەی ساڵی ١٠٠٥ ی کۆچی سیازدەی ئابی ١٥٩٧ی زاینی شەرەفخان لە نووسینەوەی بۆتەوە. واتە ئەم دەستنووسە یەکەم دانەری نووسراوی (شەرەفنامە)یە، چونکە شەرەفخانی بەتلیسی مانگی ئابی ١٥٩٧ لە نووسینەوەی بەرگی یەکەمی و مانگی مایسی ١٥٩٩یش لە نووسینەوەی بەرگی دووەمی بۆتەوە(١١).» شەرەفخان، کە بۆ ڕۆژگاری خۆی خوێندەوارییەکی باشی هەبوو، هەر لە سەردەمی لاوییەوە حەزی لە زانینی مێژوو بووە، دوای ئەوەی ئاگاداری دانراو و کاری زۆر لە مێژوونووسە عەرەب و فارسەکان بوو، بڕیاریدا کە کتێبێک دەربارەی پێشینەکانی دابنێ، ئەوانەی کە هیچیان دەربارە ڕوون نەکراوەتەوە«(١٢)،» شەرەفخان بۆ خۆی بە ڕوونی ئەو هۆیەی دەستنیشان کردووە کە پاڵی پێوەناوە (شەرەفنامە) بنووسێت. شەرەفخان لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێت: لەبەرئەوەی مێژوونووسان تاوەکو ئێستە هیچیان دەربارەی کورد و کوردستان نەنووسیوەتەوە من ویستم بەپێی توانا لەوبارەیەوە کتێبێک بنووسم و ناوی لێ بنێم (شەرەفنامە)و هەموو ئاواتیشم ئەوەیە خانەدانانی کوردستان ناویان ون نەبێت(١٣).

شەرەفنامە «لەنێو ئەو سەرچاوانەدا کە پەیوەستن بە مێژووی کوردەوە بایەخێکی تایبەتی هەیە(١٤)، « کتێبی (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بەتلیسی، کە لە مێژووناسیی کورددا، لە سەدەی ١٥ هەم و ١٧ هەمدا بایەخێکی گەورەی هەیە، بۆ لە مێژووی کورد و سەرو سیما تایبەتییەکانی ئەو سەردەمانە گەیشتن، یەکەم سەرچاوەیە کە زانیاری زۆر بە نرخ و بە کەڵکی تێدابێ(١٥)،» گرنگی و مەزنیی (شەرەفنامە) لەوەدایە کە یەکەمین بەرهەمی مێژووییە کە نووسەرەکەی تێکڕای بۆ مێژووی هەموو گەلی کورد و هەموو نێوچەکانی کوردستان تەرخان کردووە، مێژوونووسانی کورد دوای شەرەفخان بۆ زیاتر لە سێ سەدە و هەتاوەکو مێژوونووسی مەزنی کورد محەمەد ئەمین زەکی لە ساڵی

١٩٣١دا کتێبە نایابەکەی تۆمارکرد، بەرهەمێکی تریان لەبارەی مێژووی گەلی کورد و هەموو کوردستانەوە پێشکەش بە گەلی کورد نەکرد(١٦)،» (شەرەفنامە) گرنگترین بەڵگەنامە و تۆماری مێژووییە کە لەبارەی ماوەیەکی زەمەنی مێژوویی گرنگەوە دەدوێت کە نووسەرەکەی تێیدا ژیاوە ئەویش جەنگەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوییەکانە(١٧).

«مێژوونووسی لە سەدەی دەهەمی کۆچیدا لەناو کورددا دەستیپێکراوە و ئەوەش سەرەتا بەهۆی میر شەرەفخانی بەتلیسی یەوە ئەنجامدراوە، لە ڕاستەقینەدا میر شەرەفخان بە یەکەمین مێژوونووسی کورد دێتە ژمار(١٨)، « ئەوەی تا ئێستا زانراوە کەس بەر لە شەرەفخانی بەتلیسی تێکڕای بەرهەمی خۆی بۆ مێژووی کورد و کوردستان تەرخان نەکردووە«(١٩)، « بایەخی گەورەی شەرەفنامە لە سوودە زانستییەکەیەتی لە بواری نووسینی مێژووی کورد بەتایبەتی و مێژووی ناوچەکە بەگشتی تا کاتی ئێستا. ئەو زانیاریی و وردەکارییانەی کە شەرەفنامە لەبارەی ڕووداوەکانی کوردستان گرتوویەتییەخۆ وێنەیان لە سەرچاوەی تر دەستناکەوێت. سنوور و دەسەڵات و ململانێ و ڕەوشی سیاسی میرنشینە کوردییەکان و هەروەها سیاسەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویی و دەوڵەتە تورکمانەکان بەرامبەر کوردستان و میرنشینە کوردییەکان شانبەشانی زانیاری مێژوویی زۆری تر لە گرنگترین لایەنەکانی ناوەڕۆکە دەوڵەمەندەکەی شەرەفنامەن»(٢٠). « شەرەفخان لە تەمەنی ٥٣ ساڵیدا خۆی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد و کوردستان تەرخان دەکات، شەرەفخان ٣٢ ساڵی ڕەبەق تەمەنی لەنێو گەرمەی ڕووداوەکانی ئێرانی و عوسمانی بەسەربرد، یازدە ساڵی دوایی تەمەنیشی بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد و کوردستان تەرخان کرد(٢١)،» شەرەفخان پەنای بۆ بەرهەمی، نوسراوی نوێنەرانی مێژووناسی فارسی، عەرەبی و تورکی پێش خۆی بردووە. زۆربەی ناوی سەرچاوە و ناوی دانەرەکەی ناهێنێت»(٢٢)،» دانەر مەعلوماتێکی زۆری کۆمەڵایەتی- ئابووری و ئێتنیکی ئامێزی گەیاندووە«(٢٣)، بۆیە« گەورەترین و گرنگترین سەرچاوەی مێژووی کورد شەرەفنامەیە«(٢٤)،» ئەمڕۆ شەرەفخانی بەتلیسی تاڕادەیەکی باش لای کورد ناسراوە، نامەی دکتۆرا لەسەر کتێبەکەی نووسراوە، سەرچاوەیەکی گرنگی بەشێکی زۆری نووسینە مێژووییەکانە، شەرەفنامە وەرگێڕدراوەتە سەر چەندین زمانی ئەورووپی و ڕۆژهەڵاتی و لە سەرەتای حەفتاکانیش وەرگێڕانی کوردی (هەژار موکریانی) بۆ ئەم کتێبە بە چاپ گەیاندرا(٢٥)، «ئێمە لە سایەی شەرەفخانی بەتلیسی شتێک دەربارەی مێژووی گەلی کورد ئەزانین، هەروەها بەبۆنەی کتێبی (شەرەفنامە)ی بەتلیسی یەوە لە بابەت عەشایەری کوردەکانی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ژیاون شتێک ئەزانین. پێش شەرەفخانی بەتلیسی هیچ کەسانێک مێژووی گەلی کوردی نەنووسیوەتەوە«(٢٦).» شەرەفنامە دووجار و لە لایەن دوو کەسی جیاوازەوە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی کە ئەوانیش بریتین لە محەمەد عەلی عەونی و محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانییە«(٢٧).

**مەلا مەحموودی بایەزیدی**

«مەلا مەحموودی بایەزیدی لە ساڵی ١٧٩٩ لە ناوچەی بایەزید لە باکووری ڕۆژهەڵاتی کوردستانی تورکیا لەدایکبووە، هەر لەوێش دەستی بە خوێندن کردووە، پاشان لە تەوریز فێری فارسی بووە، ئینجا هاتۆتەوە شارەکەی خۆی و بووە بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئاینیی(حوجرە). بایەزیدی، لەگەڵ شکانی بەهلوول پاشای کورد، دواین میری کورد لە بایەزید، شارەکەی خۆی جێدێڵێ و دەچێتە ئەرزەڕۆم و لەوێ دەبێتە خواجە، پایەیەکی بەرز لەناو نووسەر و ڕۆشنبیرانی ئەوێ داگیردەکات»(٢٨)، « ساڵی مردن و کۆچی دوایی مەلا مەحموودی بایەزیدی ڕوون نییە و یەکلانەبووەتەوە، هەندێک لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن ساڵی ١٩٦٠ کۆچی دوایی کردووە لەکاتێکدا ئەوە ڕاست نییە، چونکە هەندێک لە دەستنووس و تۆمارەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٦٧ بۆیە ڕێی تێدەچێت لەو ساڵەدا یان دوای ئەو ساڵە کۆچی دوایی کردبێت»(٢٩).

**(شەرەفنامە) گرنگترین بەڵگەنامە و تۆماری مێژووییە کە لەبارەی ماوەیەکی زەمەنی مێژوویی گرنگەوە دەدوێت کە نووسەرەکەی تێیدا ژیاوە ئەویش جەنگەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوییە.**

«مەلا مەحموودی بایەزیدی ویستی لاسایی شەرەفخان بکاتەوە و ڕێگەی ئەو بگرێتەبەر و بەو دەستوورەی ئەو مێژووی کورد و کوردستان لەو شوێنە بنووسێتەوە کە (شەرەفنامە) تێیدا بڕاوەتەوە، بۆ جێبەجێکردنی ئەو نیازە بەرزەی مەلا مەحموود ساڵی(١٨٥٧-١٨٥٨ز) لە دانانی (کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان) بۆوە کە نزیکەی هەزار لاپەڕە دەبوو، لە پێشەکییەک و ١١ بەش پێکهاتبوو. ساڵی ١٨٦٥ کونسوڵی ڕووسیا (ئەلێکسەندەر جابا) لە ئەرزڕۆمەوە پێشەکی (کیتابی تاریخی جدیدی کوردستان)ی بەزوبانی فەڕەنسی ناردە کۆڕی زانیاری ڕووسی بۆ نرخاندنی. بە قسەکانی جابادا وادەردەکەوێ ئەو کتێبە یەک ڕوونووسی هەبووە. بەداخەوە تا ئێستە سەرەنجامی ئەو دەستنووسە نەزانراوە. مەجموعەی دەستنووسەکانی جابا کە لە کتێبخانەی سەلتیکۆڤ شێدرین هەڵگیراون ئەو کتێبەی تێدا نییە«(٣٠).» مەلا مەحموودی بایەزیدی ڕۆڵی بەرچاوی لە مەیدانی مێژوونووسیدا گێڕاوە و(٣١)، یەکەم کورد بووە کە کتێبی (شەرەفنامە)ی شەرەفخانی بەتلیسی لە فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و

له ساڵی ١٨٥٩ تەواوی کردووە(٣٢)،» کتێبێکی گرنگی تری هەیە کە ئێستا بۆ زۆر لە زمانە زیندووەکان چاپ کراوە ئەویش کتێبی (عادات و رسوماتنامەی ئەکرادیە)یە، ئەم کتێبە جگەلە بایەخی گرنگی لە بواری ئەتنۆگرافی بایەخی مێژوویی گرنگیشی هەیە و سەرچاوەیەکی ڕەسەنە بۆ مێژووی ژیانی ئابووری، کۆمەڵایەتی باکووری کوردستان لە سەدەی نۆزدە(٣٣)،» کتێبی (عادات و رسوماتنامەی ئەکرادیە) باس لە دابونەریت و بیروباوەڕ و شێوەی ژیانی خێڵە کوردییەکان دەکات»(٣٤).

«جگە لە زمانی زگماکی خۆی بایەزیدی لە زمان و ئەدەبی تورکی و فارسی دەستێکی باڵای هەبووە و شارەزاییەکی گەورەی قورئان بووە و بۆماوەیەکی درێژ مەلایەکی کەم هاوتای نەک تەنها بایەزید بەڵکو هەموو کوردستان بووە، لەناو کوردەواریدا وەک زانایەکی ئایینی و مامۆستایەکی لێهاتوو ناوبانگی دەرکردبوو(٣٥)،» هەر لە سەردەمی منداڵییەوە خەریکی خوێندن بووەو بە فەقێیەتی گەلێ مەڵبەندی کوردستان گەڕاوە و لە پاشاندا ڕۆیشتووەتە بەتلیس و لەوێدا لەلای زانایان لێکدانەوەی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام و پیتۆڵی خوێندووە و لەوێوە ڕۆیشتووەتە تەورێز و وێژەی فارسی خوێندووە و گەڕاوەتەوە زێد و مەڵبەندەکەی خۆی و پاشماوەی ژیانی بە وانەوتنەوە و دانانی پەڕاو و نامیلکە بردووەتەسەر»(٣٦).

جگە لە نووسین و کتێبی مێژوویی» مەلا مەحموودی بایەزیدی کۆمەڵێک چیرۆک و تێکست ( بە دیالێکتی کرمانجی باکوور) دەنووسێت، کە بە هاوکاری ئەلێکسەندەر ژابا کونسوڵی ڕووسیا لە ئەرزەڕۆم خراوەتە سەر ئەلفابێی لاتینی و تەرجەمەی فەڕەنسی کراون وەک: مەم و زین (١٨٥٦) کە دەبێتە یەکەم چیرۆکی بڵاوکراوەی کوردی، لەیلاو مەجنوون(١٨٥٩)، سیامەند و شەمسێ(١٨٦٠)، کیتابی مەولوودی شەریف(١٨٥٨)، (صحە صبیان) کە بریتی یە لە کتێبی ئەلف و بێی زمانی کوردی بۆ منداڵان، (رسالە تحفە النحلان فی الزمان کردان) لەبارەی ڕێزمانی کوردی(١٨٦٦)، (جامع یی رسالیان و حکایتان) چل چیرۆکی کوردییە، کە دەبێتە یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی بە کتێب(١٨٦٠)، هەروەها کتێبە ڕێزمانییەکەی عەلی تەرەماخی (صرف و بعض اصول لازمە یی تعلیمە بزمانی کورمانجیە) کە بریتییە لە ڕێزمانی عەرەبی بە زمانی کوردی، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا نووسراوە، بەڵام بایەزیدی ئەم کتێبەی سەرلەنوێ لە ١٨٥٧ نووسیوەتەوە«(٣٧).

# سەرچاوەو پەراوێزەکان


١. فاضل كريم أحمد( ماموستا جعفر): تاريخ الفكر الكردى، ترجمه/ د. بندر على مندلاوى، مؤسسة حمدى للنشر والطباعة، من مطبوعات اكاديمية التوعية وتأهيل الكوادر، السليمانية، ٢٠١١، ص١٢٥.

٢. تيلى أمين: شرفخان البدليسى، مجلة(سردم العربى)، عدد (١٩)، شتاء ٢٠١٩، ص١٧٣.

٣. کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چاپخانەی پەیوەند، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٤٧.

٤. فەرهاد پیربال: کرۆنۆلۆجیای کوردستان، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١١، ل٦٦.

٥. عبدالرقیب یوسف: تابلۆکانی شەرەفنامە، چ٣، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٢٤.

٦. ی.ئی. ڤاسیلییڤا: شەرەفخانی بەدلیسی (سەردەم، ژیان، نەمری)، و/ د.ئارام عەلی، چ١، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٩٣.

٧. د.عزیز شەمزینی: جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان، و/ فەرید ئەسەسەرد، چ٤، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٢١.

٨. محەمەد ڕسوڵ هاوار: کورد و باکووری کوردستان لە سەرەتای مێژووەوە هەتا شەڕی دووەمی جیهان، بەرگی یەکەم، چ٢، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەو وەرگێڕان، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٢٢٧.

٩. د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، چاپخانەی (الادیب البغدادیة)، بەغدا، ١٩٨٥، ل٢٥.

١٠. ئازاد عەبدولواحید: گەشتێک بەناو(مێژوو، بەڵگەنامە، شوێنەوار) هەڤپەیڤینێکی فراوان لەگەڵ عەبدولڕەقیب یوسف ، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٥٠.

١١. د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ل٢٩.

١٢. کۆمەڵێک نووسەری ڕووسی: چەند وتارێکی کوردناسی، و.ئەنوەر قادر محەمەد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٣٠١.

١٣. د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ل٣٤-٣٥.

١٤. بەبێ نووسەر: کورد لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامدا، و/ حەمە کەریم عارف، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠١٠، ل١٣١.

١٥. د. شەمسی محەمەد ئەسکەندەر، مێژووی کورد لە سەدەی ١٦ هەمدا، و/ شوکر مستەفا، چ١، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨،ل٢٣.

١٦. د. جەبار قادر: چەند بابەتێکی مێژووی کورد، چ١، دوزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ١٩٩٩، ل١٣٥-١٣٦.

١٧. جواد كاظم البيضانى: التاريخ والمؤرخون الكرد، ط١، دار و مكتبهة البصائر، بيروت- لبنان، ٢٠١٢، ل٩٥.
١٨. صديق صفى زاده (بۆرەكەیی)، مێژووی وێژەی كوردی، چ١، چاپخانەی چهر تبرين، انتشارات ناجى، بانه-كوردستان، ل٧٢٤.
١٩. جەنابی محەمەد ساڵح ئیبراهیمی محەمەدی (شەپۆل): زانایانی كورد، چ١، چاپەمەنی سەقز، تاران، ل١٩.
٢٠. د.سەعدی عوسمان: مێژوونووسین لای كورد لە سەردەمی نوێ دا(١٥٠٠-١٩٠٠)، گۆڤاری(ڕامان)، ژمارە(٢٩)، تشرینی دووەمی ١٩٩٨، ل١٠٩.
٢١. كەریم ئەحمەد عزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٨.
٢٢. ی.ئی. ڤاسیلییڤا: سەرچاوەی پێشوو، ل٩٤.
٢٣. كۆمەڵێك نووسەری ڕووسی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠٥.
٢٤د. محمد عەبدوڵڵا كاكەسور: دیدارێك لەگەڵ د.ئەحمەد عوسمان، گۆڤاری (مێژوو)، ژمارە(٤)، ساڵی یەكەم، پایزی ٢٠٠٧، ل٣١٤.
٢٥د. سەلام حەسەن خۆشناو: لە سەردەمی شەرەفخانی بەدلیسییەوە بۆ سەردەمی كۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی كوردستان، گۆڤاری(مێژوو)، ژمارە(٣)، هاوینی ٢٠٠٧، ل١١.
٢٦. د. أزاد عبيد صالح: الاثار الكاملة للدكتور أحمد عثمان أبوبكر، ج٢، مؤسسة ژين، السليمانية، ٢٠١٠، ل٥٨٨.
٢٧. تیلی أمین: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٥.
٢٨د. فەرهاد پیربال: مەلا مەحموودی بایەزیدی(١٧٩٩-١٨٦٧) یەكەمین چیرۆكنووس و پەخشاننووسی كورد، چ١، دەزگای چاپ و بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٩.
٢٩. جودت هوشيار: ملا محمود البايزيدى، مجلة(سردم العربى)، العدد(٢٤)، السنه السادسة، ربيع ٢٠٠٩، ص١٧٤.
٣٠. د.كەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو» كورتە باسێكی زانستی مێژوو و كورد و مێژوو»، چ٢، دەزگای هێڤی بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٠٥.
٣١. سەعدی عوسمان: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.
٣٢. فوئادی تاهیر سادق: هۆشیاری مێژوویی، چ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١١٦.
٣٣. د.سەعدی عوسمان: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٢.
٣٤. د. أزاد عبيد صالح: الاثار الكاملة للدكتور أحمد عثمان أبوبكر، ج١، مؤسسة ژين، السليمانية، ٢٠٠٩، ص١٩٩.
٣٥. د.كەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو، ل١٠٣.
٣٦. صديق صفى زاده (بۆرەكەیی): سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢٦.
٣٧. فەرهاد پیربال: كرۆنۆلۆجیای كوردستان، ل٨١-٨٢.



نوسینی: غازی عەلی عەلی

# ماموٚستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی زانا و نووسەر

ماموٚستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی زانا و کەسایەتییەکی دیاری شاری هەولێر، مەلایەکی ڕوٚشنفکر و خزمەتگوزاری ئایین، چرایەکی ڕوٚشنی حوجرە و مەشخەڵی زانستە شەرعییەکان و مزگەوت بووە، زانایەکی خواناس و داعی و بانگخوازێکی بوێر و دڵسوٚزی مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەی تەوژمی ئیلحاد و بێباوەڕی سەردەمی خوٚی بوو، بە دەستێکی سپی و دڵێکی پاک و بێگەرد، تەمەنێکی پڕ لە بەرەکەت و خزمەتی پێشکەش بە ئایین و خەڵک کرد لە شاری هەولێر و بووبە ناوێکی درەوشاوە لەو شارەدا. لە ئێستادا لەم شارە وەک وەفایەک بوٚ کار و خزمەتەکانی شەقامێک بەناوی ئەو کراوە، ئەوە جگە لە مزگەوتەکەی خوٚی کە لە ساڵی ١٩٧٤ لە گەڕەکی زانیاری شاری هەولێر دروستیکردووە.

مامۆستا وەک زانا و نوسەر و شاعیرێک کۆمەڵێک بەرهەمی نووسیوە، سەرەتا بە شیعر نووسین دەستیپێکردووە، هەرچەندە براکانی سەرەتا ڕازینەبوون دەست بداتە شیعر نووسین، بە بەهانەی ئەوەی نەوەکا دواتر خوێندنەکەی بکاتە قوربانی شیعر نووسین، بەڵام مامۆستا کۆڵی نەداوە و خۆی لە شیعر نووسین و خوێندنەوە نەبواردووە، یەکەم شیعری لە ساڵی ١٩٥٣ نووسیوە، نازناوی شیعری (حوزنی فەرهادی) بووە، دیوانە شیعرێکی هەیە بە ناوی (مێرغوزار).

یەکەم شیعری لە ساڵی ١٩٥٣ لە ستایشی پێغەمبەر بەبۆنەی ڕۆژی لە دایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) نووسیوە:

سوپاسم بۆ تۆیە یارەب سەناو حەمدێکی ڕەندانە
کە ئیشراقت بە نورێ کرد کەوا بەدری درەخشانە
زهوری دوڕی مەکنونە شوعاعی عالەمی دوونە
شروقی بەرقی فاریقە بەیانی سیڕی ئیمانە
بیحەمدیللا گوڵی ڕەعنا کە پشکوت لەم شکۆفەیدا
موەعەتتەر بوو بە بۆنی ئەو هەموو ئەقتاری جیهانە

لە پارچە شیعرێکی تردا لە بەیتی کۆتایی هەستی نەتەوەپەروەری خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت:

حوزنی فەرهادی وەرە دەست بە دوعابە و هەر بڵێ
ئەی خودا کورد ببتە دەوڵەت بۆ خراپە نەبتە پرد

لە دیوانەکەیدا سرودێکی بەناونیشانی (شەوق و زەوق) نووسیوە وەک هەستێکی پاکی دیندارانە:

بۆ ئایە و سوننەت هەموو غولامین　　ئێمە ئیسلامین ئێمە ئیسلامین
بە شیرین گوفتار هەموو ئەندامین　　شیرین ڕەفتار و شیرین هێندامین
یارمەتی خودا بۆمان یەقینە　　ئامانجی هەمووان خزمەتی دینە
ئەوە شەهیدە بێ شک و ئیمان　　هەرکەس بکوژرێ لە خزمەت قورئان
گەرچی لە پیری پشتم چەماوە　　ئامۆژگاریەکەم گشتی تەواوە
کوردی موسڵمان بگەن بە شادی　　دەستە و دوعایە حوزنی فەرهادی

مامۆستا کتێبخانەیەکی گەورە و گرانبەهای لەڕووی ژمارە و ناوەڕۆکەوە جێهشتووە، کە زۆربەی سەرچاوە زانستییەکانی وەک (تەفسیر، فەرموودە، فیقە، زمانی عەرەبی، ئوصول، ڕۆشنبیریی، مێژوو، ئەدەب بەگشتی و ئەدەبی کوردی بە تایبەتی.....) لە خۆگرتووە، کە بە نزیکەیی (٤٠٠٠) چوار هەزار ناونیشانی کتێب دەبێت، هەندێک لەو

ناونیشانانه زیاتر له بیست تا سی بەرگە.

مامۆستا له عیشق و خۆشەویستی بۆ کتێب  له ساڵی ١٩٤١ دەستپێدەکات، کە له شاری کەرکوک دەیخوێند له مزگەوت و تەکیەی خەلیفه کەریم ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیشبوو نەگەڕابوویەوە، ڕۆژێکیان کابرایەک داوا له مامۆستا دەکات کە ئەو کات فەقێ بووە، ئەگەر باخی مزگەوتەکە پاک بکاتەوە وەک کرێ درهەمێکی (پەنجا فلس) پێدەدات، مامۆستاش کارەکە دەکات و کابراش درهەمەکەی له پاداشتی پێ دەدات، مامۆستا بڕیار دەدات بەو پەنجا فلسە سەفەرەکە بکات و له کەرکوک بگەڕێتەوە هەولێر، بەڵام وا ڕێک دەکەوێت مامۆستا سەرێک له کتێبخانەی محەمەد ئەمین عەسری دەدات و کتێبێکی بەرچاو دەکەوێت و بڕیار دەدات بەو پارەیە  کتێبەکە بکڕێت، کتێبەکەش بەناوی (منظومة الرحبیة فی علم الفرائض)، پاش کڕینی کتێبەکە مامۆستا  لەبەرئەوەی پارەکەی خەرج کردبوو پارەی تریشی پێ نەبووە کرێی گەڕانەوەی ئۆتومبێلی پێ بدات بۆیە بڕیار دەدات بەپێیان ڕێ بکات و بگەڕێتەوە، ئەوەبوو له کەرکوک تا پردێ بە پێ ڕێگاکە دەبڕێت، مامۆستا ئەو هەموو ڕێگایەی بەپێ بڕی لەپێناو کڕینی کتێبێک ئەمەش نیشانەی حەز و خولیای  ئەو بۆ کتێب دەردەخات، دواتر مامۆستا ئەم کتێبە وەردەگێڕێتە سەر زمانی کوردی بە ناوی کەلەپوور دابەشکردن (بە هۆنراوە وەریگێڕاوە)، ئەم ڕووداوە بووە دەسپێکی دانانی  بناغەی کتێبخانەکەی و دەستکردن بە نووسین و وەرگێڕان لەلایەن ما مۆستاوە.

مامۆستا ڕۆژانە نزیکەی هەشت کاتژمێر بە خوێندنەوەوە خەریک بووە، تا دوا ساتەکانی تەمەنیشی وەک خوێنەرێکی ڕوناکبیر بەردەوام بوو له خوێندنەوە و گەڕان بە دوای کتێبی تازە چاپکراودا، خۆم شایەتحاڵی ئەو واقیعەی بووم، بەو تەمەنە پیرییەوە چەندین جار له ناو بازاڕ و کتێبخانەکان دەمبینی بە دوای کتێب و سەرچاوەی زانستی و مەعریفی تازە چاپکراو دەگەڕاو دەیکڕی یان هەر پێشانگایەکی کتێب بکرابایەوە سەردانی دەرکرد و بە دوای کتێبی تازە چاپکراودا دەگەڕا، کتێبخانە تایبەتەکەی حوجرەی مامۆستا و  دانراو و نووسینەکانی گەواهیدەری ئەم ڕاستییەن و  نیشانەی خوێندەواریی و بەرزی ئاستی ڕۆشنبیریی و ڕوناکبیری مامۆستا نیشان دەدەن.

**دانراوەکانی مامۆستا بە زمانی کوردی و عەرەبی:**

١. لمعة البیان فی ترتیل القران (فن التجوید)
٢. اقاف الخلاف ودور الاعتساف فی اعادة صلاة الجمعهة ظهرا (١٩٥٦ چاپکراوە)
٣. احسن الصیاغة فی حلیة البلاغة.
٤. الحج المبرور وذنب المغفور(١٩٥٧ چاپکراوە)

٥. منافع الصوم ومضار الخمر
٦. حديقة الازهار فى مولد المختار (١٩٧٦ نوسراوه، بەڵام ١٩٨٥ چاپکراوه)
٧. الاكليل فى محاسن اربيل (٢٠٠١ چاپکراوه)
٨. ازاهير فى رياض الادب وجواهر من بلاغة العرب.
٩. بغية الحكام فى التنظيم قسام
١٠. وجها لوجه حضرة رسول الله (فتاوى من فى رسول الله)
١١. تبصرة المبتدى وتذكرة المنتهى
١٢. کەلەپوور دابەشکردن (بە هۆنراوە) وەرگێردراوی کتابی (منظومة الرحبية فى علم الفرائض)
١٣. مەولودنامە بە کوردی (بەهۆنراوە)
١٤. مێرغوزار (ديوانە شيعر)
١٥. قدسية المسجد
١٦. مناهل الحكمة
١٧. نزاهة القران الكريم من الشعر.
١٨. (١٠٠) پەندی سوودمەندی (حەکیمی لوقمان)
١٩. کەشکۆڵی فەرهادی (دەستنووس)
٢٠. موجز تأريخ أربيل (دەستنووس)
٢١. صفحات الايام (دەستنووس)

مامۆستا جگە لە بڕوانامەی زانستی کە بە ئیجازەی مەلایەتی ناسراوە (الاجازيه العلميه) کە لە مزگەوت و حوجرە بە دەستی هێنابوو، دەرچووی هیچ کۆلێژ و زانکۆیەک نەبوو، هیچ بڕوانامەیەکی ئەکادیمی ئەو سەردەمەشی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوەندە ئەکادیمییەکان جێگەی ئیعتیبار بوو، مامۆستا ئەندامی کۆڕی زانیاری کوردستان بوو لە لیژنەی هەڵسەنگاندنی دەستنووسەکان (مخطوطات)، مامۆستا وەک زانا و نوسەر و شاعیرێک بەهۆی پێگەی زانستی و ئاستی بەرزی ڕۆشنبیری بەتایبەتی لە بواری ئەدەبی کوردی و شیعری ئاینیی و بواری سۆفیگەری، لەسەر داوای کۆلێژی ئاداب زانکۆی سەلاحەددین، دەبێتە ئەندامی لیژنەی گفتوگۆ و هەڵسەنگاندنی نامەی دکتۆرای (د.ئیبراهیم ئەحمەد حسەین شوانی) وەک پسپۆڕ، بەناونیشانی (شیعری ئاینیی و سۆفیگەری لە شیعرە کوردییەکانی مەحویدا) نامەکە لە ڕێکەوتی ١٩٩٦/٤/٢٢ لە بەشی زمان و ئەدەبی کوردی لە کۆلێژی ئاداب زانکۆی سەلاحەددین گفتوکراوە کە ئەمەش یەکەم دکتۆرا بووە لە زانکۆی ناوبراو بدرێت لە خوێندنی باڵا، کە ئەو کات دکتۆر ئازاد محەمەد ئەمین نەقشبەندی عەمیدی کۆلێژی ئاداب بوو.

**لیژنەی گفتۆگۆی نامەی دکتۆراکە  پێکهاتبوو لە بەڕێزان:**

سەرۆکی لیژنە: پ.د. مارف خەزنەدار

ئەندام: پ.ی.د. شوکریە ڕەسوڵ ئیبراهیم

ئەندام:  پ.ی.د. زاهیر لەتیف کەریم

ئەندام:  پسپۆڕ. مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای  فەرهادی

ئەندام و سەرپەرشتیار: پ.د. محەمەد نوری عارف

مامۆستا وەک داعی و بانگخوازێک و مەلایەکی خزمەتکار و خەمخۆری ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەردەوام لە هەوڵدابوو بۆ هۆشیارکردنەوە و ئامۆژگاریکردنی خەڵک و مسوڵمانان، زۆر بە دڵسۆزانە و لێبڕاوانە کاری دەکرد بۆ سەرخستن و بەرەوپێشچوونی ئاینی پیرۆزی ئیسلام چ وەک تاک چ وەک دەستەجەمعی کارکردن لەگەڵ مەلاکانی هاوڕێ و هاوبیر و هاوسەردەمی خۆی. گەر چاوێک بە مێژووی سەردەمی ژیانی مامۆستا لە ساڵانی پەنجاکان  بخشێنین  کە ئەوکات تەوژمی شوعییەت و بێباوەڕی چەندە بەهێز و کاریگەر بووە لەسەر خەڵک و جەماوەر و بڵاوکردنەوەی بێبباوەڕی و ئیلحاد و دوورخستنەوەیان لە ئاینی ئیسلام و دژایەتیکردنی ئاین بەناوی نەهێشتنی چینایەتی و چەوساندنەوەی چینی هەژار و چەوساوە و دژایەتیکردنی  دەرەبەگ، ئەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مامۆستا چەندە خەمخۆرانە هاتووەتە مەیدانی ڕووبوڕووبوونەوە و کاریکردووە.

جگەلەوەی مامۆستا دۆستایەتی و هەماهەنگی و هاوکاری هەبووە لەگەڵ ڕەوتی ئیسلامی میانەڕەوی سەردەمی خۆی، یەکێکیش بووە لە کەسایەتییە دیار و کاریگەرەکانی سەردەمی خۆی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگە لە ڕوانگە و هەستێکی ئاینپەروەرانەوە، یەکێک لە هەوڵە هەرە گرنگ و گەورەکانی  وەک خەمخۆرێکی ئاینی ئیسلام لەگەڵ دەستەیەک لە مامۆستا و زانایانی هاوسەردەمی خۆی لە ساڵی ١٣٧٨ک/١٩٥٩ز هەڵدەستێت بەدامەزراندنی ڕێکخراوی زانایانی ئاینی ئیسلامی بەناوی یەکێتی زانایانی ئاینی ئازادیخواز (جمعية اتحاد علماءالدين الاحرار)، بارەگای ڕێکخراوەکەش لە مزگەوتی مەلا نەبی لە گەڕەکی تەعجیلی شاری هەولێر دادەنێن و تابلۆی ناوی ڕێکخراوەکەش بە دیواری مزگەوتەکەوە هەڵدەواسن کە مامۆستا ئەو کاتە خۆی هەر لەو مزگەوتە مەلا بووە. مامۆستا تۆماری ئەندامانی ڕێکخراوەکەشی لای خۆی پاراستووە، مانگانە هەر مامۆستایەک بەگوێرەی توانای دارایی خۆی هاوکاریی و ئابوونەی مانگانەی پێشکەش بە ڕێکخراوەکە کردووە و پارەکەش بۆ کاروباری ڕێکخراوەکە و چالاکی و بۆنە و ئاینییەکان خەرج کراوە. مامۆستا کەسی یەکەمی دەستەی دامەزرێنەران و سەرۆکی ڕێکخراوەکەش بووە، هۆکاری دامەزراندنی ڕێکخراوەکەش ئەوەبوو کە دەسەڵاتی ئەو کات ڕێکخراوێکی بەناوی (جمعية رجالالدين الاحرار) دامەزراندبوو کە زیاتر لە خزمەتی دەسەڵاتی ئەو کاتەدا بوو، ڕێکخراوهکەی سەر

بە دەسەڵات جگەلە زانایان هەموو کەسێکیان بە ئەندام وەردەگرت لە بانگبێژ، مجێور، خادم و مامۆستایانی ئایینی و هەر کەسێک کە مەبەستیان بوایە، بەڵام ڕێکخراوەکەی مامۆستا جگەلە مامۆستایان و زانایانی ئاینی ئیسلامی کەسی تریان وەک ئەندام وەرنەدەگرت، چونکە پێیان وابوو لە ئیسلامدا پیاوی ئایینی نییە، بەڵکو زانای ئایینی هەیە. هەرچەندە بیرۆکەی دامەزراندنی ڕێکخراوەکە هی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا فەرهادی خۆی بوو و ڕاپەڕاندنی ئیشوکارەکانی ڕێکخراوەکەش هەر ئەو پێی هەڵدەستا، هەروەک مەلا علی ئیسماعیل مەولود بیرە عارەبانی دەڵێت: مامۆستا عەبدوڵڵا فەرهادی براگەورە و سەرۆکی ڕێکخراوەکە بوو، بەڵام مامۆستا خۆی وەک ئەدەب و حورمەتی زۆری دەڵێت مامۆستا مەلا قادر  ئیبراهیم سورێژەیی براگەورەمان بوو لەم ڕێکخراوە، پێدەچێت لەبەر گەورەیی تەمەنی  مامۆستا وایگووتبێت نەک لە واقیعی ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی ڕێکخراوەکە، ئەم مامۆستایانەی خوارەوە ئەندامی دەستەی دامەزراندنی ڕێکخراوەکەن:

- مەلا قادر ئیبراهیم سورێژەیی (١٩٠٦ – ١٩٦٦)، دەستەی دامەزرێنەر.
- مامۆستا عەبدوڵڵا فەرهادی (١٩١٨ – ٢٠١٠)، دەستەی دامەزرێنەر.
- مەلا  عەلی ئیسماعیل مەولود بیرە عارەبان(١٩٢٥-٢٠٠٩)، دەستەی دامەزرێنەر.
- مەلا شێخ عەبدوڵڵا سلێمان گردەسۆری(١٩٢٠- ٢٠١٥)، دەستەی دامەزرێنەر.
- مەلا  عەبدوڵڵا مەلا صاڵحی خۆران، دەستەی دامەزرێنەر.
- مەلا  سەید محەمەد سەید ئیسماعیل پیرداودی(١٩١٦- ٢٠٠٦)، دەستەی دامەزرێنەر.

مامۆستا هەر لە دوای ڕاپەڕین لە ساڵی ١٩٩٢ ڕێگەیدا لە مزگەوتەکەی خۆی مەدرەسەیەک بۆ زانستە شەرعییەکان بکرێتەوە و مەدرەسەکەش زیاد لە بیست قوتابی لە خۆگرتبوو کە لەلایەن مامۆستا عومەر ئیسماعیل ڕەحیم پێشنیازکراو و ئیدارەی دەکرا، مامۆستا پاڵپشتی و هاوکاری زۆری کردن لە دامەزراندن و دروستکردنی مەدرەسەکە سەرباری گەورەیی تەمەنی، مامۆستا فەرهادی خۆشی لەگەڵ مامۆستایانی تر (مەلا عەبدولکەریم ئەفەندی، سید ئەحمەد عەبدولوەهاب، عومەر ئیسماعیل و.....) دەرسیان بە قوتابییەکان دەگووتەوە.

مامۆستا لە ژیانیدا گەلێک ڕووداو و هەڵوێستیی جوامێرانە و خەمخۆرانەی هەبووە، کە نیشانەی گەورەیی  پێگەی مامۆستا بوون:

* بەردەوام لە بۆنە و یادەکاندا وتاری پێشکەش دەکرد و هەڵوێستی جوانی ئایینی لەمەڕ ڕووداوەکان بە ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) بەیان دەکرد، مامۆستا لەکاتی گەڕانەوەی بارزانییەکان لە ساڵی ١٩٥٩ لە یەکێتی سۆڤیەت لەگەڵ شاندێکی مامۆستایانی ئاینی لە وێستگەی شەمەندەفەری (گوندی هەمزە کۆر) لە پێشوازیاندابوون، لەکاتی هاتنە خوارەوەیان لە شەمەندەفەر بەناوی (یەکێتی زانایانی ئاینی ئازادیخواز) وتارێکی پێشکەشکرد و بەخێرهاتنەوەیانی کرد، شوعییەکان لەوکاتەدا لە وتارەکەی مامۆستا

ناڕەزاییان دەربڕی، بەڵام مامۆستا هەر لەسەر وتارەکەی خۆی سوور بوو، وتی ئەوە ڕای ئێمەیە و ئێوەش کەیفی خۆتانە.

مامۆستا دوو کورتترین وتاری هەینیدا وەک هەڵوێست وەرگرتن لە واقیع و ڕووداو و کارەساتی ئەو سەردەم:

* لە ناوەڕاستی ساڵی هەشتاکان لە سەردەمی ڕژێمی پێشوو کە ڕووداوەکانی خاپورکردن و تێکدانی گوندەکان ئەنجامدرا و ڕاپانگواستن بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکان لەگەڵ تێکدانی گوندەکاندا هەزاران مزگەوت ڕووخێندران و هەزارەها قورئان لەگەڵیدا سوتێندران کە ئەو کات هێشتا کیمیابارانکردن و ئەنفالکردنی خەڵکی مەدەنی بێتاوان ڕوویبنەدابوو، مامۆستا لە یەکێک لە وتارەکانی ڕۆژی هەینیدا، چووە سەر مینبەر کورتترین وتاریدا وەک ناڕەزایی دەربڕین و هەڵوێست نیشاندان لە وتارەکەیدا تەنها بەشێک لە ئایەتی ٢٢ سورەتی (السجد)ی خوێندەوە کە دەفەرموێت: (واللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ ولَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ)، دواتر لەسەر مینبەر دێتەخوارەوە.

* لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٣ لە هەرێمی کوردستان کە شەڕی ناوخۆ دەستیپێکرد لەلایەن دوو هێزی ئەوکات پاش ئەوەی چەندین خەڵکی بێتاوانی لایەنێکی شەڕەکە(بزوتنەوەی ئیسلامی) بوونە قوربانی و بە ناهەق خوێنیان ڕژێنرا، دیسان مامۆستا وەک دەربڕینی ناڕەزایی و هەڵوێست نواندن لە وتارەکەیدا تەنها ئەم ئایەتەی لە سورەتی (الصف/ ئایەتی٨) (إنا من المجرمين منتقمون) و یەکسەر وتارەکەی تەواو کرد و لەسەر مینبەر هاتە خوارەوە.

## پوختەی ژیانی مامۆستا

زانا و نووسەر و شاعیر عەبدوڵڵا فەرهاد مەولود عوسمان ناسراو بە مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی لە عەشیرەتی مەمانە، لە ساڵی ١٩١٨ لە گوندی لهێبانی سەر بە شاری هەولێر لەدایکبووە، لە بنەماڵەکەیان جگەلە خۆی چوار برای تری مەلا بوون، کە ئەو بچووکترینیانە ئەوانیش (مەلا محەمەد فەرهادی، مەلا صادق فەرهادی، مەلا سەعید فەرهادی، مەلا ئیبراهیم فەرهادی).

لە تەمەنی منداڵی لەوکاتەوەی کە ماڵیان لە گوندی گردعازەبانی نزیک هەولێر بووە باوکی وەفاتیکردووە، مەلا عەبدوڵڵا هەر لەو گوندە لە تەمەنی حەوت ساڵیدا لای براکانی دەستی بە خوێندن کردووە، سەرەتا قورئانی خەتمکردووە و پاشان چەند نامیلکەیەکی فارسی خوێندووە، دواتریش کتێبی (گوڵستان)ی لای مامۆستا مەلا ئەحمەد گەزنەیی خوێندووە و پاشان هاتووەتە ناو شاری هەولێر، لە مزگەوتی شێخ نورەدین لای مامۆستا مەلا صالح کۆزەپانکەیی دەستی بە دەرس خوێندن کردووە، دواتریش وەک لە خوێندنی فەقێیەتی باوبووە چەندین شوێن گەڕاوە بۆ خوێندن لە دەشتی هەولێر و دۆڵی

خۆشناوەتی تا شاری کەرکوک و بەغدا. ئەو گوندانەی گەڕاوە بۆ خوێندن: (خورمەڵە، سیاو، عەوێنە، عالاّ، خەرابەی سیانان، گڕاوی سیانان، نۆغەران، باداوان، پیرداود، گردەسۆر، دووسەر، قەشقە، پاشتەپە، ئازیانە، گردمەلا، پیرزین، خۆران، سوسە، بێلینگە، هیران، کونەفلوسە، هەرتەل، بالیسان، شیرێ، بالوکاوە، سوریژە، چۆمەزەردەلە، جەدیدەی لەکان...) . مامۆستا بۆ خوێندن زیاد لە چل شوێن گەڕاوە، جگەلە گوندەکان لە شارەکانی (هەولێر، کۆیە، کەرکوک، بەغدا)شی خوێندوویەتی.

دیارترین ئەو مامۆستایانەی کە دەرسی لەلایان خوێندووە: مەلا سەعید فەرهادی، مەلا صادق فەرهادی، مەلا ئەحمەد گەزنەیی، مەلا صالّحی کۆزەپانکەیی، مەلا سەعیدی باشتەپەی، مەلا عەبدوڵلای دێرەبروشەیی، مەلا ئیسماعیلی ناقس، مەلا خدری دەشتی، مەلا قادری قاوغی، مەلا عوسمان مەعروف عەوێنەیی، شێخ عومەر بالیسانی، شێخ فواد ئەفەندی ئەلئالوسی، مەلا محەمەد حسن قزلجی، مامۆستا سلێمان سالم تورک، شێخ ئەمجەد زەهاوی...).

دواتر لە ساڵی ١٩٣٧ چووەتە شاری کۆیە لە مزگەوتەکانی: حەتک، کۆنە جومعە، مزگەوتی گەورەی مەلای گەورەی کۆیە، سەرەتا بە سوختەیی دەستی بە خوێندن کردووە لای مەلا سەعید مەلا سلێمانی ئاوماری، کە ئەویش موستەعیدی مەلای گەورەی کۆیە بووە. دواتر لە ساڵی  ١٩٣٩ دەچێتە شاری کەرکوک لە مزگەوتەکانی: حاجی نوری، حسەین نەفتچی، مەلا ڕەزای واعیز، تەکیەی خەلیفەکەریم درێژە بە خوێندنەکەی دەدا و بەردەوام دەبێت. لە ساڵی ١٩٤٤ هەر بۆ خوێندن دەچێتە شاری بەغدا و لە مزگەوتی حسەین پاشا لای مامۆستا مەلا محەمەد حەسەن قزڵجی تەفسیری (کشاف) دەخوێنێت.  دواتر هەر لە شاری بەغدا لای مامۆستا شێخ ئەمجەد زەهاوی دەست بە دەرس خوێندن دەکات و کتێبی (منهاج البیضاوی) دەخوێنێت. هەر لە شاری بەغدا لای مامۆستا سلێمان سالم تورک دەستدەکات بە خوێندنی زانستی فەرمووده و خوێندنی کتێبەکانی (جمع الجوامع) و (تهذیب الکلام).

مامۆستا پاش زیاتر لە بیست ساڵ خوێندن زیاد لە بڕوانامەیەکی زانستی (الاجازة العلمیة)  وەرگرتووە لای ئەم مامۆستایانە:

لە شاری هەولێر لای  هەریەکە لە مامۆستا  عیززەدین مەلا ئەفەندی، لە قەلاّت هەرچەندە لای ئەو دەرسی کەمخوێندووە  لەبەر بێ مەجالی ئەو،  بەلاّم بە حوکمی پێگەکەیان کە بنەماڵەی مەلا ئەفەندی بوون و خاوەنی مەدرەسەی تایبەت بوون بۆیە دوای خوێندن گەڕاوەتەوە لای ئەو بۆ بڕوانامە وەرگرتن. دواتریش لای مامۆستا مەلا عەبدوڵلا محەمەد ئەمین بێتواتەیی(١٨٩١ - ١٩٦١)  بڕوانامەی زانستی هەر لە هەولێر وەرگرتووە. لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری بەغدا لای مامۆستا شێخ ئەمجەد زەهاوی بڕوانامەی زانستی وەرگرتووە. لە ساڵی ١٩٤٦ لە شاری بەغدا لای مامۆستا سلێمان سالم تورک کە بە (مەلا سلێمان ئەرزڕۆمی) ناسرابوو، بڕوانامەی زانستی  و بڕوانامەی (زانستی فەرموودە)شی  وەرگرتووە.

ماموستا بۆ یەکەمجار لە گوندی سوریێژە وەک ماموستای ئاینی دەستبەکار بووە، پاش دووساڵ چووەتە قوشتەپە و لەوێشەوە بۆ ناو شاری هەولێر، لە مزگەوتی مەلا نەبی وەک پێشنوێژ لە سەرەتایی ساڵی پەنجاکان دەسبەکاربووە، دواتریش لە ساڵی ١٩٧٤ لە گەڕەکی زانیاری خۆی مزگەوتێکی دروستکرد (مزگەوتی مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی) لەو مزگەوتە بەردەوامبووە وەک پێشنوێژ و وتارخوێن هەتا ڕۆژی وەفاتکردنی لە ١٠/٤/ ٢٠١٠. ماموستا هەتا خۆی لە ژیاندابوو ئامادەنەبوو ناوی خۆشی لەسەر مزگەوتەکەی بنوسرێت، بەڵام دوای وەفاتی لە ساڵی ٢٠١٥ لەلایەن خانەوادەکەیی و خێرخوازان مزگەوتەکەی نۆژەنکرایەوە و ناوی ماموستای خوالێخۆشبوو لەسەر مزگەوتەکە نوسرا.

ماموستا جگە لە مەلایەتی لە یەک کاتدا وەک واعیزیش لە ساڵی ١٩٤٧ بە ئیرادەی مەلەکی دامەزراوە، دواتریش لە ساڵی ١٩٥٧ وەک کاتب لە دادگای شەرعییەی هەولێر کاریکردووە بۆ دەرکردنی قەسام شەرعی، ماوەیەکیش لە دادگای شەرعیەی موسڵ کاریکردووە، بەڵام لەکاری مەلایەتی دانەبڕاوە، دواتر لە ١٩٥٩/١٢/٦ بەشداری خولی ماموستایەتی کردووە و لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٠ لە خولی پێگەیاندنی ماموستایەتی تەواوبووە، لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٠ وەک ماموستا لە قوتابخانە دەستی بە وانەوتنەوە کردووە لە گوندەکانی (گاینج و سیێبیران)، دواتریش بۆ قوتابخانەی خەبات لەناو شاری هەولێر دەگوازرێتەوە.

ماموستا لە ماوەی ژیانیدا دوو جار هاوسەرگیری پێکهێناوە، هاوسەرگیری یەکەمی لە ساڵی ١٩٤٣ ئەنجامداوە، بەرهەمی ئەو دوو هاوسەرە پێنج کوڕ و هەشت کچ بووە.

ماموستا لە تەمەنیدا (١٤) جار فەریزەی حەجی ئەنجامداوە، یەکەم حەجی لە ساڵی ١٩٥٧ بووە و دواهەمین حەجیشی لە ساڵی ١٩٨١ بووە، ماموستا لە ساڵی ١٩٧٥ بەبۆنەی دەرچوونی بە پلەی یەکەم لە پێشبڕکێی قورئانی پیرۆز لە (اذاعة صوت الاسلام) لە وڵاتی سعودیە وەک خەڵاتی یەکەمبوونەکەی سەفەری حەجی پێکراوە لەسەر ئەرکی وەزارەتی ئەوقافی سعودی.

## سەرچاوەکان


١. دیداری تەلەفزیۆنی یەکگرتوو کەناڵی هەولێر کە تایبەتە بە ژیاننامەی ماموستا و بڵاونەکراوەتەوە، نوسەری ئەم بابەتە لە ساڵی ٢٠٠٣ ئەنجامیداوە.

٢. دیداری بەڕێز کاک حاکم عەبدولباست مەلا عەبدوڵڵای فەرهادی و دکتۆر عاتف عەبدوڵڵای فەرهادی کوڕانی ماموستای خواڵخۆشبوو لە بەرواری ٢٠٢١/٦/١٢.

٣. دیداری بەڕێز پرۆفیسۆر د.ئیبراهیم ئەحمەد شوانی، ٢٠١٨/١١/١٢.

٤. مەلا تاهیر مەلا عەبدڵلا سلێمان بەحرکەیی: مێژووی زانایانی کورد، بەرگی دووەم.






حەسەن مەحمود حەمەکەریم

# دەوڵەتی جمهوری کوردستان نامەو دۆکیۆمێنت

نوسخەیەک لە بەنرخترین کتێبی ئەمساڵم بە دیاری بەدەست گەیشت بە ناوی (دەوڵەتی جمهوری کوردستان، نامەو دۆکۆمێنت، بەرگی یەکەم، نووسینی: محمود مەلا عزەت، بە تیراژی ٥٠٠ دانە، ٥٨٤ لاپەڕەی قەبارە گەورە، چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لە ئەوروپا کراوە، چاپی دووەم و سێهەمی ساڵی ٢٠٠٣ و ٢٠٢١ لە سلێمانی لە چاپخانەی کارۆ کراوە، ژمارە سپاردنی ١٣٨٤ی ساڵی ٢٠٢١ی وەزارەتی ڕۆشنبیری وەرگرتووە. کتێبەکە لەسەر ئەرکی دکتۆر هەڤاڵ ئەبوبەکر پارێزگاری سلێمانی کراوە، سەلاحەدینی موهتەدی و پاشان جرجیس فەتح الله پێشەکیان بۆ نووسیوە، ئەمە جگە لە پێشەکی نووسەر خۆی، ئەم سێ پێشەکیە نرخێکی زۆر بە ئەرشیفکردنی دیکۆمێنتارو بەڵگەنامەکان دەدەن و وەسف و سەنایەکی زۆری کتێبەکەیان کردوەو لەوە زیاتریش هەڵدەگرێ..

ئەم بەرهەمە یەکێکە لە دانسقەترین کتێب کە لەم چەند ساڵەدا چاپکراوە، یەکەم هەوڵ و یەکەم کتێبی ئەرشیڤی دیکۆمێنتاری چاپکراوە لەسەر کۆماری کوردستان (مهاباد)، یەکەم هەوڵە لە ڕێبازی دانانی ئەرشیڤێکی کوردی کە بە ڕەنج و زەحمەتێکی زۆری نووسەر کە لە کۆنەوە خەریکە، پێشتر نووسەر هەنێ نمونەی لەم کتێبەی بە نامیلکە و بابەتی بەڵگەنامەیی بڵاوکردوەتەوە، سەرەتا ساڵی ١٩٦٩ زنجیرەیەک بابەتی لەسەر ئەرشیڤکردنی بەڵگەنامە لە گۆڤاری ڕزگاری بڵاوکردوەتەوە بەناونیشانی جۆراوجۆر، پاشان لە بەغدادو پاشتر لە شاخ و لە دەرەوەی وڵاتیش هەنێکی بڵاوکردوەتەوە.

ماموٚستا مەحمودی مەلا عیزەت بەڵگەنامەکانی کۆماری کوردستانی مەهاباد کە لای حەمە ڕەشید خانی بانە بوو دەستکەوت، ئەو ئەرشیفەیان دابویە کەسێک، دوایی کەوتە دەست مەحمودی مەلا عزەت و ئەم کارە جدیەی لەسەر کرد و دەوڵەمەندتریشی کرد، کتێبەکە بریتیە لە بەڵگەنامەکانی کۆماری کوردستان و بەیاننامەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستان.. مەحمود مەلا عزەت یەکەم کەسە کە کتێبی لەسەر کۆماری میللی مەهاباد ساڵی ١٩٧١ بڵاوکردەوە، یەکەم کەسە کە هەوڵی بەئەرشیفکردنی بەڵگەنامەی کوردی داوە لە سوید، پاشان ساڵی ١٩٩٧ کە بە تەکلیفی مام جەلال هاتەوە کوردستان، پڕۆژەیەکی ئامادەکرد و دایە وەزیری ڕۆشنبیری و زۆر کەس کە لەو کارانە بەرپرسن، پاشان دای بە حکومەتی هەرێم، داوای ئەرشیفکردنی بەڵگەنامەکانی کورد و حکومەتی کرد، ماموٚستا مەحمود دەڵێ: (داخەکەم بەڵگەنامەی هەموو میرنشینە کوردیەکان و شۆڕشەکانی شێخ عوبەیدوڵاو شەمزینان و شێخ عەبدوالقادرو شێخ سەعید و سەی ڕەزای دەرسیم و ئاگری داغ و شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی حەفید و سمایلخانی شکاک و بارزان و کۆماری مهابات و ئەیلول و گوڵان دیار نیە و شتێکی وایان لەسەر نازانین، تەنانەت کەمێک لە بەڵگەنامەکانی شۆڕشی نوێ دیارە، بەڵام ئەم نامەو بەڵگەنامانە لای دوژمن ئەرشیف کراون و پارێزراون).

(جرجیس فتح الله) لە پیشەکی کتێبەکەدا دەڵێ: (کۆکردنەوەی بەڵگەنامە و پۆلێنکردن و شیکردنەوەیان کارێکی جەوهەری و بنچینەیی چاولێنەپۆشراوە لە پرۆسەی نووسینی مێژووی سیاسیدا، کاری کۆکردەنەوەی بەڵگەنامە مێژووییەکان و کاری لێکۆڵەرو شوێنەوارەکەی لە زۆر کاتدا هاوسانن، ئەنجامی بەری ڕەنجی هەردوکیان زیادکردنی زانیاری نوێیە دەربارەی ڕووداوی مێژوویی و ڕووناکی خستنە سەر شەخسیەتە سیاسیە غامیزەکانە، زۆرجاریش ڕەنگە ببنە هۆی ڕاستکردنەوەی زانیاری چەوت کە خراوەتە ناو مێژوو، ئەم بەرهەمە کارێکی مەزنی ئەرشیفی محمودی مەلا عزەتە، بەری ڕەنجێکی پڕ زەحمەتە، هەرچەند خۆی هەمیشە هەوڵدەدات ڕۆڵی خۆی کەم بکاتەوە، ئەمکارە یەکەم هەوڵە لەسەر ڕێبازی دانانی ئەرشیڤێکی کوردی، هەوڵێکی ئازایانەی پڕ زەحمەتە، یەکەم هەنگاوە بۆ دروستکردنی تۆمارێکی دۆکۆمێنت بۆ ڕووداوە سیاسیەکانی کوردستان، نووسەر ساڵەهایە خەریکی کۆکردنەوەو پاراستنی ئەو دۆکۆمێنتانەیە لە فەوتان تا ئەم بەرهەمەی لێهاتە ئەنجام، لە پشت هەر بەڵگەنامەیەک چیرۆک و داستانێک هەیە، هەتا ساڵی ١٩٨٤، ئەم بەڵگەنامانە کۆمەڵە نامەیەکە لە نێوان سەرکردەکان و هێزە چەکدارەکانی کوردستان ئاڵوگۆڕ کراوە، تۆماری هەر نامەیەک هی حاڵەتێکی گرنگی مێژووییە).

نووسەر دەڵێ: (ئەگەر ئێمە مێژووی خۆمان نەزانین پاشەڕۆژ دەدۆڕێنین، ئەگەر ڕەگ و ڕیشەی خۆمان بفەوتێنین ئەوا ناتوانین گەورە بین و گەشە بکەین، کۆنفۆشیۆس (٥٥١ ـ ٤٧٨ پ.ز) وتویەتی: (بۆ ئەوەی لە نوێ بگەین، دەبێ کۆن بخوێنینەوەو تێبگەین)، ئێمە تا ڕادەیەکی بەرچاو نامۆین بە مێژووی نەتەوەکەمان، نامۆین بە ئەرشیڤ و شوێنەوارە مێژووییەکانمان، ئەوەش هۆیەکی گرنگ بوو بۆ لاوازی هەستی نەتەوایەتیمان)، کاک مەحمود یەکەم کەس بوو

کتێبی لەسەر جمهوری کوردستان نووسیوە، بە ناوی (کۆماری میللی مەهاباد ) ساڵی ١٩٧١ دووجار سانسۆر کراوە، ساڵی (١٩٧١ و ١٩٧٩) هەتا ساڵی ١٩٨٤ یەکەم چاپی لە کوردستان لەلایەن یەکیەتی نوسەرانی کوردستان بەچاپ گەیەنرا، دوەم چاپیش ساڵی ١٩٨٦ لە سوید بوو، ئەمە جگە لە زنجییرە باسێک لە گۆڤاری ڕزگاری لەسەر ئەو کۆمارە ساڵانی (١٩٦٩ ـ ١٩٧٠) ئەو هەوڵانەی کاک مەحمود بووە سەرچاوە بۆ ئەوانەی کە دواتر لێکۆڵینەوەیان کرد لەسەر کۆمارەکە، جگە لە کتێبەکانی کاک مەحمود (کۆماری میلللی مهاباد)، (جمهورییەتی کوردستان) و هەر سێ بەرگەکەی (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)، دەیان لێکۆڵینەوەی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکانی دەرەوە و ناو بڵاوکردەوە، جگە لەوانە چەند کارێکی تری کرد:

١. دامەزراندنی ئەرشیڤێکی کوردی لە ئاوارە کە بەیارمەتی دەزگایەکی کولتوری سوید، ساڵی ١٩٩٦ – ١٩٩٧ کارەکەی تەواوکردو لە ئەرشیڤخانەی نەتەوەیی سوید لە ستۆکهۆڵم دانراوە، ئەوەش هەر لەسەر جمهوریەتی کوردستانە و بریتیە لەو سێ بەرهەمەو کۆپی سەرجەم قەبارەی ئەسڵی نامەکان و نووسینەکانی تر لەسەر مهاباد، ئەرشیفکردنی ٣٠ ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەی (کوردستان) زمانحاڵی کۆمار و حزبی دیموکرات، کاک مەحمود نیازی بوو ئەو ئەرشیڤە فراوانتر بکات بە زیادکردنی ژمارەکانی تری ئەو ڕۆژنامەیە کە لەبەردەستدان، لەگەڵ گۆڤاری (کوردستان) و (هەڵاڵە) و (گڕوگاڵی منالآنی کورد) و گۆڤاری (نیشتیمان) هەرنۆ ژمارەکەی، لەگەڵ بەرهەمی تر لەسەر ئەم ئەزمونە کە چاپ و بڵاوکراوەتەوە، بەڵام ئەوەی بۆ نەڕەخسا و بڕیاریدا لە ئایندەدا بیکات.

٢. بە دەستپێشخەری ئەو بۆ حکومەتی هەرێم و دڵسۆزان ساڵی ١٩٩٧، بۆ یەکەمجار لە مێژووی کوردستان ئەرشیڤی نەتەوەیی کوردستان لە سلێمانی دامەزرا، پاشان نامیلکەیەکیشی بەناوی (لە پیناوی گەشەپیکردنی ئەرشیڤە نوێ دامەزراوەکانی کوردستان) ساڵی ٢٠٠٠ چاپکردو بڵاویکردەوە و ئەرشیڤەکە کرا بە دامەزراوەیەکی سەر بەوەزارەتی ڕۆشنبیری، زۆر خەریک بوو لەگەڵ وەزیرو گزیرو هانیدان، بەڵام هەر ناوبوو ئاوڕی جدیان لێنەدایەوە، جگە چەند شتێکی بچوک و بەرتەسک شتێکی وا نەکرا کە لێکۆڵەرێک بتوانی سودی لێببینێ.

کاک مەحمود دەڵێ: (کۆماری کوردستان هەرچەند تەمەنی کەم بوو، بەڵام دەرس و پەندی مێژوویی زۆری تیا بوو، ئەو کۆمارە پێشتر زەمینەی بۆ خۆشکرابوو، دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ.ک) چوار ساڵ پێشتر و هەیئەتی ڕەئیسەی میللی کە بەڕێوەبردنی دەڤەرەکەی لە ئەستۆ بوو، بەشێکی زیندوی ئەو سەردەمەن، کە نووسەر هەموی بە ئەزمونی مەهاباد ناو دەبات لە ساڵی (١٩٤١ ـ ١٩٤٦) کە تا ئیستە بە تێروتەسەل لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە، ئەو کۆمارە ڕۆڵی باشی بینی لە گەشەکردنی هەست و نەستی نەتەوەی کورد، بایەخی گرنگی ئەم بەڵگەنامانە هەر ئەوە نییە کە وەک ئەزمونی مێژویی و ئەرشیڤی دەوڵەمەندو سەرچاوەی ڕەسەن سەیری بکرێ، بەڵکو لە زۆر ڕووی ترەوە خزمەت بە مێژووی نەتەوەکەمان دەکات، بەتایبەت لە ڕوی زمان و ئەدەب و ڕەوتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دبلۆماتی و ئابوری

و سەربازی و چەک و تەقەمەنی و هاوکاری و تەبایی هێزە کوردەکانی تری دەڤەرەکان، ئەم چاپە نوێیەی دەوڵەتی جمهوری کوردستان سەرجەم بەڵگەنامەکانی هەرسێ بەرگەکەی (د.ج.ک) کە لە ئەوروپا چاپ و بڵاوکرانەوە دەگرنە خۆیان، لەگەڵ گەلێک نامەی تر کە دوای بڵاوکردنەوەی ئەو بەرگانە بە دەستیان گەیاندم، پێش بیری ئەم چاپکردنە نەخشەکەم وابوو کە ئەو نامانە لە دووتوێی بەرگی چوارەمدا بڵاوبکەمەوە، ئیتر دوای بیرکردنەوە لەم چاپە وا باشتر بوو لام کە کۆی سەرجەم بەڵگەنامەکان لە دوو توێی دوو بەرگدا بڵاوبکرێنەوە، بە دوو شێوازی سەرەکی لەو دوو بەرگەدا دۆکۆمێنتی بەڵگەنامەکان بکەم.

یەکەم: شێوەی کرۆنۆلۆجی، واتە بە پێی زنجیرەی مێژوویی نووسینی نامەکان لە ڕۆژو مانگ وساڵ.

دووەم : لەگەڵ ئەو شێوازەدا هەولْم داوە لە سنوری لواوو گونجاودا بە هۆی ڕۆژی نووسینی نامەکان لە هەر ڕۆژێکدا بە پێی هیرارکی واتە بە پێی پلەو پایە و لێپرسراویی نووسەری نامەکان دۆکۆمێنتەکان ڕێکبخەم.

لەم چاپەدا لەگەڵ دەقی هەموو دۆکۆمێنت و بەڵگەنامەیەک تایپەکەشی لەگەڵ دانراوە، بۆ کارئاسانی بۆ خوێنەرو توێژەر تا ئاسان بیخوێننەوە، ئەمە لە چاپەکەی کوردستان، بەڵام لە چاپەکەی ئەوروپا سێیەکی بەڵگەنامەکانی بەرگی یەکەم لەو تایپکردنە بێبەشە، لەلایەکی ترەوە هەموو بەڵگەنامەکانم وەک خۆیان بێ دەسکاری داناوە، وە لەبەر هۆی هونەری نامەکانم بچوککردوەتەوە، دەبوو بۆ ئاسان خوێندنەوە لەگەڵیشیاندا نووسینەکان بخرانایەتە سەر ڕێنوسی سەردەم، لەگەڵ ڕاستکردنەوەی هەموو ئەو هەڵە و کەموکوڕیانەی لە نووسینەکاندا دەردەکەون، ئەوەش کارو وەختی زۆری دەویست و قەبارەی دوو بەرگەکەش زۆر قەبەتر دەبوو. لەبەر کۆنی و ڕزیوی زۆر لە نامەکان گرفت و کێشەی زۆر هاتە ڕێ بۆ ساغکردنەوەیان، ئەوەتە دەبینی هەنیکی ئەوەندە ڕزیوە لەتێکیان لێبوەتەوە، یان وشەو ڕستەی لەسەر نەماوەو کاڵبوەتەوە، یان نەخوێنراوەتەوە، یان بەهەڵە نووسراون، یان مێژووی نووسنی لەسەر نییە یان کوژاوەتەوە، یان نازانرێ نامەی کێیەو بۆ کێ نوسراوە، یان ئیمزای لەسەرەو نازانرێ خاوەنەکەی کێیە، یان هەر پلەی لێپرسراویەکەی نوسراوە.

لەبەر نەبونی زمانێکی یەکگرتوی نووسین لەلایەک، یان زۆر لە نوسەرانی نامەکان شارەزای نووسینی فارسی بوون و زمانی کوردیان بۆ نامۆ بووە، یان هەم خوێندنەوەیان ئاسان نیە، یان هەنێ وشەیان بەکار هێناوە بە زمانی کوردی نامۆن و ناشخوێنرێنەوە، ئەمە جگە لە هەڵەی زۆری ڕێنوس و گرامەتیک، ئەوانەش بە هەوڵی گەلێ دۆست ساغکراونەتەوە، یان وەک خۆیان دانراونەتەوە، لەوانەدا پەنا بۆ فارسیزان براوە، تەنانەت بۆ ڕێککردنەوەی ساڵڕۆژی هجری شەمسی لەگەڵ میلادی و کوردیدا، یان بۆ ساغکردنەوەی ئەو نامانەی بەخەتی شکست نوسراون، یان بۆ ساغکردنەوەی ناوی ناوچەو دێهات زۆر لە دۆستان یارمەتیان داین.

ڕەوشت محەمەد

# ڕۆمان... ڕووی لە خەیاڵە

ڕاستە سەردەمی بەیەکدا چوون و تێکەڵبوونی هونەرەکانە، یانی دەشێ لە لە ڕۆمانا شیعر ئامادەبێت و لە شیعردا ڕووداوو داستانەکان جارجار سەردەرکەن، یاخود سینەما هەموو هونەرەکان لەنێو خۆیدا بەکار بخات، گۆرانی هەروا. بەڵام لە ڕاستیدا هەریەک لەو ژانرە هونەرییانە زیاتر لە ژینگەیەکی تایبەتدا نەشونمای خۆیان دەکەن، وەکو گوڵەبەرۆژە دواجار روو لە خۆری خۆیان دەکەن، لەم ڕوانگەیەوە دەبینین شیعر زیاتر ڕووی لە جوانییە و مۆسیقا ڕووی لە ڕۆح و ڕۆمانیش ڕووی لە خەیاڵە.

**شیعر ڕووی لە جوانییە:**

شیعر بیەوێ هەرچی بڵێ، دەبێ بە جوانی و لەڕێگەی جوانییەوە بیڵێت، زمانی هاوبەش و ئەزەلی شیعر جوانییە، بابەتەکە هەرچی بێت، فۆرم و ناوەرۆک هەرچی بن، کێش و سەرواو تەکنیک و هەرجۆربن، بابن... بەڵام دەبێ دواجار ئەو شیعرە بگاتە لای یەکێک لە سەرچەشمەکانی جوانی و لەوێ پشووبدات. دەبێ لە کۆتاییدا لەگەڵ جوانیدا یەکبگرێت ئینجا بگات بە بەردەنگەکانی.

زۆر شیعری جوان و نەمرمان هەیە کە بابەتەکەیان رەنگە بابەتێکی ناگرنگ بێت، هەروا زۆر شیعری بچوک و کەم تەمەنیشمان دیوە کە رەنگە بابەتەکەیان زۆر گرنگ و تەنانەت پیرۆزیش بێت. نالی گوێدرێژەکەی دەکاتە بابەتی قەسیدەیەک بەڵام مادام زمان جوانە، وێنە جوانە، خەیاڵ جوانە، قەسیدەکە بەگەورە و نەمری لەدایک دەبێ. کەچی دەیان و سەدان شیعری بچوک دەبینین لەسەر سەرکردە و کەسایەتییە گەورەکان، مادام دەستی شیعرەکە بەجوانی نەگەیشتووە ئەوا دەقێکی بچوک و فەرامۆشکراوە.

**مۆسیقا ڕووی لە ڕۆحە:**

هەروا رۆحی هەر نەتەوەیەک لەنێو ئاواز و مەقام و مۆسیقاکەیدایە، لە میانی گفتوگۆیەکمدا لەگەڵ (د. مایکڵ چاید) توێژەر لە زمانەکانی رۆژهەلاتی ناوەراست، وتی: «بەرلەوەی بەر زمانی کوردی بکەوم بەر موزیک و هەڵپەرکێی کوردی کەوتم» هەروا وتی: «کە هەڵپەرکێی کوردیم بینی ئەو رۆحیەت و ریتم و جوڵەکەیە سەرنجی بردم، لەو کاتەوە لەهەوڵدام بۆ زیاتر ناسینی کورد هو ئێستە لێکۆڵینەوە لە زمانەکەیدا دەکەم».

شارەزایانی بواری دەروونی دەڵێن: هەر پەیامێک روو لە مرۆڤەکان دەکات، دەبێ بە سنوور و تخوبی عەقڵدا تێپەرێت، دوای بازگەی ژیری و عەقڵ ئینجا دەگاتە دەروون و دڵ، بێجگە لە مۆسیقا، تەنیا موسیقایە کە بەر بازگەی هۆش و عەقڵ ناکەوێت و دەگاتە لای رۆحی ئێمە، دەگاتە دڵ و دەروون. بۆیە ڕاستە گەربڵێین: مۆسیقا رۆحی نەتەوەیی دەهێڵێتەوە و گەشەی پێدەدا. یادەوەری کاممان لە دوتوێی چریکە و ئاوازی سەید عەلی ئەسغەردا نییە، رۆحی کامما لەنێو دەنگ و سەدای حەسەن زیرەک و مامڵێدا نەگەشاوەتەوە و گوڵی نەگرتووە. دەنگی مەزهەری خالقی کاممانی تا ئەوپەڕی ئارامی نەبردووە؟.

**ڕۆمان ڕووی لە خەیاڵە:**

رۆمان دەبێ خەیاڵی نەتەوەیی دروست بکات، رۆمانی گەورە لە ڕێگەی ڕووداوو کارەکتەرەکانییەوە خەیاڵی نەتەوەیەک بەیەکەوە دەبەستێتەوە، (میگێل دی سیرڤانتس) لە ڕێگەی (دۆنکیشۆت)ەوە خەیاڵی هەموو ئیسپانیا و دونیای بەیەکەوە بەستەوە، (کافکا) لە رۆمانی (مەسخ)دا لە ڕێگەی (گریگۆری بازرگان) ەوە خەیاڵی مرۆڤایەتی کۆکردەوە، (دیستۆفسکی) لە (تاوان و سزا)دا بە کارەکتەرەکەی (ڕاسکۆڵنیکۆڤ) هەموو روسیای لە دەوری خوانی خەیاڵی خۆی گرد کردەوە، شەهرەزادی هەزار و هەزارویەک شەوە و عەلی بابا و عەلادین خەیاڵی تاکی عەرەبیان ڕێکخست.

ئایا کورد هیچ داستان یان رۆمانێکی وای هەیە بتوانێ خەیاڵی هەموو کورد تێربکات و لەدەوری خۆی کۆی بکاتەوە؟ ئەم پرسیارە رەنگە لێکۆڵینەوە و ماندووبوونی زۆری نەوێت و بەئاسانی بتوانین وەڵامی بدەینەوە. ئەم کارە

ئەگەر تا ئێستا نەکراوە خەتا تەنیا لە نووسەران و رۆماننوسانەوە نەبووە، بەڵکو ئەو هۆکارە سیاسی و نێودەوڵەتیانەی کە وایانکردووە کورد دابەشی چوار وڵات بکرێت و زمانەکەی لەبەشێک لەو وڵاتانەدا لەژێر مەترسی پوکانەوە و پاشەکشەدابێت، هەروا خوێندن و نووسین بە دوو پیتی جیاواز لەنێو خوێندەوارانی کورددا،  یان نەبوونی یەکزمانی ستانداردی پەروەردە و نووسین، هەموو ئەمانە وایکردووە کە هیچ نووسەرێکی کورد نەتوانی ببێ بە نووسەری هەموو کوردان پێکەوە، هیچ دەقێک یان هیچ ڕۆمانێکی کوردی بە ئاسانی هەموو خوێندەوارانی کورد نەیانتوانیوە بیخوێننەوە، ئێمە گەر لە باشوور و رۆژهەڵاتی کوردستان رۆمانی زۆر باشیشمان هەبێ خوێنەوارانی باکور و رۆژئاوا لێی بێبەشن و بە هۆکاری ئەوەی ئەوان بە پیتی لاتینی دەخوێننەوە و دەنووسن لێیان بەهرەمەند نابن.. ئەم حاڵەتە بەپێچەوانەشەوە ڕاستە.

بەشێکی باش لەبەر ئەو هۆکارانە لە ئەدەبی کوردیدا هیچ ڕۆمانێک نەیتوانیوە سنوورەکان ببڕێت و خەیاڵی کوردا پێکەوە ببەستێتەوە. کارەکتەرەکان و رووداوەکان هەر ناوچەیین و لە سنوورێکی بچوکدا دەمێننەوە و نابن بە ڕوودا و کارەکتەری نێو خەیاڵدانی هەموو کورد، هەموو ئەو ڕووداوو کارەساتانە بەسەر نەتەوەی کوردا هاتوون بایی ئەوەن کە ببنە کەرەستەی باشی رۆمانی گەورە و لەتوانایاندایە خەیاڵی نەتەوەیی لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە.

واقیعی چوارپارچەکردنی کوردستان و هەموو ئەو نەهامەتییانەی بەدوای خۆیدا هێنای، شۆڕشە یەک لەدوایەکەکان، یاخود کارەساتەکانی ئەنفال و هەڵەبجە و ...تد.  بایی ئەوەن ببنە ڕوداوی نێو رۆمانەکان و دروستکردنی کارەکتەری کاریگەر و ئاشنا بە نەست و خوستی هەموو کوردان ئەم بابەتانە دەکرێ ببنە کەرەستەی وەگەرخستنی خەیاڵی تاکی کورد لەهەر گۆشەیەکی دنیادا تا لە ڕێگایانەوە; خەمی هاوبەش و ئازاری هاوبەش و شانازی و هەستی هاوبەش و خەیاڵی هاوبەش ببەخشینەوە.